ئەو لە كوێ بوو، ئەو كاتەی ژن گلۆڵە گڕێك بوو لە ماڵ و حەسارێكی بچووكدا؟ بچووكتر لە دنیای بچووكی خەون و خەیاڵە قاچاغ و حەرامەكانی. بچووكتر لە كۆی هەموو داخوازیەكانی. لەو بەشە بچووكە وا لە ژیانی گەرەك بوو. تەنانەت بچووكتر لەوەی لەشە گلۆڵە گڕەكەی وەشێرێ. لەشە سەرگەردانەكەی یاخی و بێعۆقرە خۆی بە داروو دیواردا دەكوتا و، لە ناخەوە، لە ناخی ئازارەكانیەوە هەموو قیژە حەپسكراوەكانی ژیانی دەقیژاند. قیژەی وشك و جەرگبڕی موچڕكەی بە لەشی تەزیوی خانووە گڵینەكانی كۆڵاندا دەهێناو، بان و گوێسپانەی تەپیویان وەك شان و ملی سەگە بەڕەڵای تۆقیو یەك دەهاتنەوە و دەلەرزین.

ئەو لە كوێ بوو، ئەو كاتەی دەركەی تەنەكەی حەسارێكی بچووك یەك، دوو، سێ جار شەقی دەبردو، كاسی و بێدەنگی كۆڵانی دەشكاند؟ لەشی گڕ گرتووی ژن یەك، دوو، سێ جار دەپەڕیە دەر و خەڵوەتی رچیوی كۆڵانی دەڕووشاند. گڕ گەزارەی لە ئاسمانی كۆڵان دەكێشاو، با، بای وشك و سارد، بای وەیلان بەرەو پیری دەچوو. دۆستی دێرینی با بوو گڕ، لە باوەشی دەگرت. تاسەی كردبوو، بە خۆیەوە دەگوشی. لە زەوی هەڵدەبڕیو بە دەوری خۆیدا هەڵیدەسووڕاند. ئەوسا ژن گلۆڵە گڕێك بوو لە باوەشی با داو، سەمای مەرگی دەكرد.

ئەو لە كوێ بوو؟ ئەمسەراوسەری كۆڵان چۆڵ بوو. كەس بە دەرەوە نەبوو. پەنجەرەكانیش چاوی كوێری ماڵەكان بوون. كەس ئەو سەمای گڕو بایەی نەدەدی. كەس ئەو قیژەی ژنو مەرگەی نەدەبیست. ئەویش هەر دوو چاوو، دوو گوێ بوو. دوو چاو وەك دوو كونە كۆتر بە دیواری ماڵێكەوە. دوو گوێ وەك دوو گۆپكە بە گورگەی گوێسپانێكەوە. وەك دوو تەڵەزم بە لەشی دارتێلێكەوە.

دوو چاو بوو ئەو. دوو چاو كە هیچی پێنەدەكرا جگە لە بینینو، دەیدی ژن چشكردوو لە شەرم و حەیای، مەستو سەرخۆشی مردن بوو. كراسە ئاودامێنەكەی كە دەشیا تەختەكەی شین بووبێ، شینێكی ئاسمانیو، گوڵە وردەكانی سوور بووبن، بە دەم باوە پارچە پارچە دەبوو. پارچەكان دەفڕین و.... لە كوێ دەنیشتنەوە؟ پێستی لەشی كە دەبوو سپی بووبێ و، چەند دڵۆپ خوێن دەمارێك دەڵاندبێتی و ئاڵی

کردبێ، قرچە قرچ هەڵدەقرچا. داروو دیـواری کـۆڵان دوودە و دووکـەڵ بوو. ئاسـمانی تەڵخ و تاریک بوو. دوو چاوی ئەویش.... نا، ئـەوی دوو چاویش دەکزایەوە. تا ئەوەی با، شەکەتی ئەو هەلەکە سەمایە پێـی خـۆ دزینەوەی هەڵدەگرت و، گڕ لە خۆیدا دەتوایەوە.

دوو گوێ بوو ئەو. دوو گوێ کە هیچی پێنەدەکرا جگە لە بیـستن و، دەیبیست قیژەی جەرگبڕی ژن دەبـووە نرکـە و ناڵـە و هێـور هێـور.... بێدەنگی.

ئەو لە کوێ بوو، ئەو کاتەی لەشـی رەژی ژن، رووت و عوریـان لـە نـاو کۆڵانـدا کـەوتبوو؟ بـاڵا بـەرز بـوو یـان ئـەو بـەرزە بـاڵای دەدی؟ دەستەکانی دوو چڵ داری سووتاو بوون. سـپیایی ئـەو دیمەنـە رەشـە، تەنها سپیەنەی دوو چاوی ژن بوو، کـە پـەردەی پێڵوویان توابـووەوە. گلێنەکان هێشتا بزۆز بوون، دەبزوان. لە کێ دەگەڕان؟

ئەو لە کوێ بوو؟

ئەو گلۆڵە گڕەی لە کوێ دیبوو؟

ئەو قیژە جەرگبڕەی لە کوێ بیستبوو؟

## یەک

قیژەیەکی تیـژ و ترسـناک لـە خـەو رایپەڕانـد. هەراسـان بـە چـوار دەوری خۆیدا چاوی گێڕا. ژوورەکە تاریک بوو. لە چاوەی بچووکی لای سەرووی پەنجەرەکانەوە، لە پـشت پـەردە چیندارەکانـەوە، چەنـد پەڵـە رۆشنایی زەردو سووری دی. لەوە بێهێزتر بوون بـە ژوورەکـەدا بـڵاو بووبێتنـەوە، یـان رچـەی باریکیـان بـۆ دیوارەکـەی بەرامبـەر بـڕیبێ. سەراسـیمە بـەرەو یـەکێک لـە پەنجـەرەکان خوشـی. لەوێـشەوە بـۆ هەیوان...

دەرەوەش تاریک بوو. جگە لە شنەو لەنجەی تەڵخی لقوو پۆپی درەختەکانی حەسار، هیچ شتێک سەرنجی رانەکێشا. گوێی هەڵخست هاکا قیژەکەی بیستەوە، یان لانی کەم هەرا و هاوارێک. لە خشەخشی گەڵاکان و پەلەکان زیاتر هیچی نەبیست. گەڕایەوە ژوور و، پەنجەرەکەی پێوەدا. چرکەچرکی سەعاتەکە تەپووکوتی دڵی ژوورەکە بوو، بڵێند و بەپەلە دەکوترا. ئەویش ترسا بوو؟ گڵۆپەکەی بە پەنجە خشکە هەڵکرد. ژوورەکە بزەیەکی رووناکی هاتێ. دی یان نەیدی؟ تەپووکوتەکە نزم بووەوە و، دابەزی. نیگای لە سەعاتی سەر سنگی دیوارەکە هەڵەنگووت. مێڵەکانی کەوتبوون. بۆ سەعاتەکەی دەستی گەڕا و، نەیدۆزیەوە. خەو لە چاوی پەڕیبوو. بۆ ناو جێگەکەی نەچووەوە. نیوە پەراخێک ئاوی کۆنی شەوماندە لە سەر مێزەکەی بوو، بە سەریەوە نا. پاکەتەکەشی لەوێ بوو، جگەرەیەکی لێ دەرهێناو دایگیرساند. هێشتا دوا دەنگدانەوەی قیژەکەی لە گوێدا بوو. هەستی بە لەرزینی لەشی کرد. لە ترسا یان لە سەرما؟ دوو دڵ بوو. لە سەر کورسی پشت مێزەکەی دانیشت و، گوتی: « تۆش ئەو قیژە ترسناکەت بیست فەرهاد؟ »

کەس وەڵامی نەدایەوە. فەرهاد لە ژوورەکەدا نەبوو. لە هیچ ژوورێکی ماڵەکەدا نەبوو. تەنها ناوی لە زەینی ئەودا بوو. ناوو پارچە پارچەیەک لە ژیان و رابوردووی، کە ماوەیەک بوو بە بێهیچ نەزم و ریسایەک کۆ بووبووەوە. دیسان لە زەینی ئەودا.

مژێکی قووڵی لە جگەرەکەی دا. دووکەڵ سەری زمانی گەست و، هەڵپرشتە سەر کاغەزەکانی بان مێزەکە. زۆری کاغەز رەش کردبووەوە. دوێنی و، پێری و... حەفتەیەک بوو شەو و رۆژ نوسیبووی. لەو رۆژەوە کە فەرهاد لە دایک بووبوو. یەکەم رۆژی پاییز. فەرهاد یەکەم رۆژی پاییزی چ ساڵێک لە دایک بووبوو؟ لە منی پرسیبوو. گوتبووی: « ئەگەر بمەوێ چیرۆکەکەی بنووسم دەبێ بزانم تەمەنی چەندەیە. دەبی بیبینم. بۆ رۆژێک لە گەڵ خۆت... »

گوتم: « فەرهاد لە ماڵ نایەتە دەر. ساڵانێکە لە ماڵ نەهاتووەتە دەر. »

« ساڵانێکە لە ماڵ نەهاتووەتە دەر؟ »

بە سەرسووڕمانەوە پرسی. بە بیریدا هات، بڵێی ئەوەندە پیر بێ خانەنشین بووبێ؟ بە بیریدا نەهات، لەم وڵاتە بۆ ئەوەی کەسێک خانەنشین ببێ، پێویست ناکا حەتمەن پیر بووبێ...

جگەرەکەی کوژاندەوە و، لە پشت مێزەکەی هەستا. ئەمسەراوسەرێکی ژوورەکەی کردو، لە لای تاقی کتێبەکان گیرسایەوە. ریزێک کتێبی تازە... لەوەتی گەڕابووەوە کڕیبوونی. بیری کردەوە، ئەگەر کتێبە کۆنەکانیشی بمایە... بارامی برای گوتبووی: « کە تۆ رۆشتی باوکم هەموو کتێبەکانی کۆ کردەوە و، بۆ شەوێدا لە حەسار، لەسەر یەک هەڵیڕشتن و سووتاندنی.» گوتبووی: « ئاگرێکی گەورەیان لێ ساز بوو. جگە لە حەسار، گەڕەکەکەشی رووناک کردبووەوە.» بە پێکەنینەوە گوتبووی. بەڵام مونیرەی خوشکی دەیگوت: « من و رووناک تا بەرە بەیان بە دیار ئاگرەکەوە دانیشتین و فرمێسکمان هەڵڕشت.» بە خەمەوە دەیگوت. « رۆژی دواییش کە دەرو دراوسێ هەواڵی ئەو ئاگر و سووتمانەیان لێ پرسین، گوتمان گەڵای وشکیدرەختەکان بووە و سووتاندوومانە.»

گەڵای وشکی درەختەکان؟ بۆ پاییز بوو کە ئەو لێرە رۆشتبوو؟ سەیری کتێبەکانی کرد. هێشتا هیچیانی نەخوێندبووەوە. تەنها سەیرێکی کردبوون و چەند پەڕەی لێ هەڵدابوونەوە. بیر کردەوە: « کە رۆشتمەوە لە گەڵ خۆم دەیانبەم. تەنهاییشەوانی غوربەت و...»

کتێبێکی لە ریزەکە دەرهێنا. « رۆچنەیەک لە تاریکیدا» ئەوە شەش یان حەوتەمین کتێبی بیرەوەری بوو کە لەم حەفتەیەدا کڕیبووی. بیرەوەری پیاوانی نەوەیەک کە سەردەمێک ویستبوویان دنیا بگۆڕن. بە تێکۆشانیان، بە دابڕانیان لە ماڵ و بنەماڵە و، بە زیندان و ئەشکەنجە و... نەیانتوانیبوو. دنیا نەگۆڕابوو. نەگۆڕابوو؟ تەنها ئەوان پیر و پەککەوتە بووبوون و، لە ترسی ئەوەی لە بیر بچنەوە و فەرامۆش بکرێن، بیرەوەریەکانیان نووسیبووەوە. « رۆچنەیەک لە تاریکیدا» بیرەوەری زیندان. نووسەرەکەی، نەوەک لە نزیکەوە، دەناسی. زیاتر لە بیست ساڵ زیندانی کێشا بوو. کتێبەکەی لە ناوەڕاستەوە کردەوە. رۆژی دیدەنی زیندانیەکان بوو. چ رۆژ و چ ساڵێک؟ تێنەگەیی. گرنگیش نەبوو. ئەوە گرنگ بوو کە زیندانیەکان پێیان دەکرا دەستێک بە خۆیاندا بێنن و،

ریشیان بتاشن. جلە خاوێنەکانیان کە لە بن پەتووەکانەوە دەقیان گرتبوو، لە بەر بکەن. لەو عەترە کە دەسگیرانی یەکێکیان بە دیاری بۆی ناردبوو، لە خۆیان بدەن. پێڵاوەکانیان بۆیاخ بکەن و... هەموو ئەو کارانەیان کردبوو. وەها کە میوانی شوێنێک بن. میوان بوون. میوانی بنەکاڵەکانیان. بڵێی باسی ئەو کوڕە گەنجەش کرابێ کە دەسگیرانەکەی عەتری بۆ ناردووە؟ دیدەنی دوو دەسگیران لەمدیواودیوی مێلەی ئاسنیەوە، لە بەر چاوی پۆلیسێکی گەنجی سمێڵ بابڕ و چاوو برۆ رەشدا...

کتێبەکەی لێک ناو، لە جێی خۆی دایناییەوە. سەرو خوارێکیتری ژوورەکەی کردو، بۆ پشت مێزەکەی چووەوە. زیندانیو بنەماڵەکانیانی فەرامۆش کرد. گوتی: « دڵنیام تۆش ئەو قیژە ترسناکەت بیستووە فەرهاد.»

دیسان فەرهاد لەژوورەکەدا نەبوو. لە هیچ ژوورێکی ماڵەکەدا نەبوو. کاغەزەکانی سەر مێزەکەی کۆ کردەوە. چاوی بە یەکەم لاپەڕەدا خشاند. کۆمەڵێک رستەی سارد و سڕ، سواوو دووپاتەوە بوو. گرمۆڵەی کردو فڕێیدا. لاپەڕەی دووهەم... رستەکان بەلایەوە غەریب و بێگانە بوون. وەها کە ئەو نەینووسیبێتن. پەڕەی دووهەمیشی فڕێدا. پەڕەی سێهەمیش... پەڕەی چوارەم...

« تۆ چی لە فەرهاد دەزانی؟ »

من بووم پرسیم. لە دەنگم دانەچڵەکی. سەری بەرز کردەوە. لەوەی کە بێخەبەر هاتبوومە ژوورەکەی و لەو لایەوە راوەستا بووم قەڵس نەبوو. گوتی:

« زۆر شت. بەڵام پرژو بڵاو و نارێک و پێک.»

پێکەنیم. ریزێک ددانی رەش و پیسو ناحەزی دی. بەلایەوە قێزەون بوو. یەکەم جار بوو وەهای دەدیم؟ پێشتر پێنەکەنیبووم؟ حەتمەن پێکەنیبووم. زۆر جار پێدەکەنیم.

گوتی: « تۆ زۆر پێدەکەنی.»

بە تووڕەیی و بێزار بوونەوە گوتی. بەڵام زوو پەشیمان بووەوە و، گوتی:

« ئەڵبەت پێکەنین کارێکی خراپ نیە.»

ئەوەی گوت چونکا نەیدەویست بمڕەنجێنێ. ڕەنگە ترسابێ لێی بتۆرێم. بەڵام نەتۆرام. سەیری کاغەزە گرمۆڵە بووەکانم کرد. چەندە بە نووسینیانەوە ماندوو بووبوو. دوێنێ و پێرێ و... لە ماوەی ئەم حەفتەیەدا ئەوەی نووسیبووی، گرمۆڵەیکردبوو، فڕێیدابوو. بەو هیوایە کە سەر لە نوێ دەست پێبکاتەوە. بە نووسینی چیرۆکی فەرهادو، هێشتا لە یەکەم ڕستەدا مابوو. یەکەم ڕستە دەلاقەیەک بوو لە ژیانی فەرهاد دەکرایەوە. پێشتر گوتبووی: «هەڵبژاردنی یەکەم ڕستە، یەکەمین و دواهەمین هەڵبژاردنی چیرۆکنووسە. هەڵبژاردنێکی دژوارە. یەکەم ڕستە ڕەوتی ژیان و چارەنووسی کەسی چیرۆکەکە دیاری دەکا.»

گوتی: «فەرهاد لە کوێ دەژی؟ »

بە وەڵامەکەی منی دەزانی.

گوتی: «پێویستە بیبینم. ئەو دەبێ...»

ویستی بڵێ: ئەو دەبێ پێم بڵێ ئەو قیژە تیژو ترسناکەی بیستووە یان نا؟ بەڵام نەیگوت. گوتی: «ئەو دەبێ بۆ هەڵبژاردنی یەکەم ڕستەی چیرۆکەکەی یارمەتیم بدا. تۆ بەڵێنت پێداوم بە یەکترمان بناسێنی.»

من پشتم تێکرد. ڕۆشتم لە بەر یەکێک لە پەنجەرەکانی ژوورەکەی ڕاوەستام. بە حاستەم پەردەکەم لادا. دەرەوە هێشتا تاریک بوو. گوتم: «بەڵێنم داوە و دەیکەم.»

نەمگوت کەی.

## دوو

بەیانی ئەو شەوە نەبوو، بەیانی شەوێکیتر بوو. لە خەو هەستابوو، خۆی پۆشتە کردبووەوە و، لە ماڵ رۆشتبووە دەر. لە شەقام، لە نێوان هەراو هوریا و، هات و چووی ئەو خەڵکە کە هێشتا خەو بەرینەدابوون و، بە پەلە بوون بە کارەکانیاندا رابگەن... ئەو دەبوو بە چیدا رابگا؟ ... بە یادی زوو، لە جەرگو دڵ فرۆشیەکەی ناو بازار ناشتای کردبوو. دوو شیش دڵ و دوو شیش گورچیلە بە نانی گەرم و تازەوە. ساڵانێک لەمەبەر جەرگودڵ فرۆشیەکە پیاوێکی قسەخۆشی لە سەر بوو. کاک یەدە؟ ئەو و هاورێکانی پێیان دەگوت ژەنراڵ. نەخوێندەوار بوو، بەڵام دەیگوت لە شۆڕشەکەی قازیدا ئەفسەر بووە. ژەنراڵی لە قاپێکی چێوی رەشدا دیبووەوە. وەک ئەو دەمانە لێوی بە زەردەخەنەیەکەوە وشک بووبوو. ئەو بە رێزەوە سەری بۆ لەقاندبوو. بە دەم ئاخێکی ساردەوە گوتبووی: « ژەنراڵ تۆش؟! خۆ تۆ قەرار نەبوو وا زوو...» لە بەر خۆیەوە گوتبووی. دڵە کەی خواردبوو، گورچیلەکەی هەروا بە جێهێشتبوو. پاشان چوو بوو بۆ ئیدارەی میراتی فەرهەنگی. بۆ لای جەلالی. جەلالی برادەری نزیک و هاورێی کۆنی بوو. لەوەتی گەڕابووەوە چەند جار دیبووی. هەروا خۆشەویست و میهرەبان. هیچ نەگۆڕابوو. نەگۆڕابوو؟ ژنی خواستبوو، سێ منداڵی بوو. زۆریش پیر بووبوو. زۆرتر لەوەی کە ئەو چاوەڕوانی دەکرد. سەر و ریشی سپی و چاوی کزو... دڵی نەهاتبوو پێی بڵێ پەکی کەوتووە. نزیکەی سەعاتێک لە لای مابووەوە.

کە هاتەوە دەر لە بەر دەرکەی ئیدارەکە بوو منی دی. لەو بەر شەقام پاڵم بە درەختێکی پیادەڕۆکەوە دابوو. سەیری هاتێ. لەوێ چیم

دەکرد؟ جەلالیش لە گەڵی هاتبووە دەر. بۆ بەڕێکردنی و... بە پەلە خواحافیزی لێ کرد و لە شەقامەکە پەڕیەوە. ئەو بەرەو رووی من دەهات و، منیش هەروا پاڵم دابووەوە و راوەستابووم. بۆ دواجار ئاوڕی لە جەلالی دایەوە و، دەستی لێ راتەکاند. جەلالیش دەستی راتەکاند و رۆشتە ژوور. ئەو لە جۆگەی شەقامەکە پەڕیەوە.

« تۆ لێرە چی دەکەی؟ » نەیپرسی. گوتی: « ئەگەر هەر بۆ بینینی جەلالیش گەڕابێتمەوە کاری چاکم کردووە. جەلالی وەک هەمیشە هاوڕێی چاک و بە وەفایە. بریا دەتناسی...»

لە دەمی دەرچووبوو. من پێکەنیم و، گوتم: « دەیناسم. دەمێکەیە دەیناسم. بەرپرسی ئیدارەی میراتی فەرهەنگی. پارێزەری شتە کۆن و فەرامۆشکراوەکان... میراتی پێشوونیانی خوا لێخۆشبوو...»

بە تەوسەوە گوتبووم؟ لچی هەڵقرچاندو بێئەوەی هیچ بڵێ رێکەوت. بە پیادەڕۆکەداو، بە ناو ئەو خەڵکەدا کە نەیدەناسین. لێیان ورد دەبووەوە. لەو ژن و پیاوانە کە دەهاتن و، لە لاشانیەوە تێدەپەڕین و، جاروباریش سەرنجی بۆ ئەو فرۆشگەو بینایانە دەگوێزایەوە کە پێشتر نەیدیبوون. پێشتر نەبوون، یان بوون و ئەو فەرامۆشی کردبوون؟ فرۆشگەی گەورە و بینای بەرز و بڵیند... ئەو هەموو ئیدارە و نووسینگە و بانکە... ئاگای لە من نەبوو. نەدەترسا ونی بکەم. بەر لەوە بگاتە مەیدانەکە لە بەر دووکانی رۆژنامەفرۆشێک راوەستا. خەڵکیتریش وەستابوون و، لە ریزی رۆژنامە و گۆفارەکانی پشت شیشەی دووکانەکە ورد بووبوونەوە. ئەو هەموو رۆژنامە و گۆفارە... بەر لە گەڕانەوەی ناوی زۆربەیانی نەبیستبوو. ئەو هەموو نووسەرە کە لەم رۆژنامە و گۆفارانەدا دەنووسن، ئەو هەموو خەڵکە کە دەیانخوێننەوە...

دووکاندارەکە کوڕێکی گەنج بوو. لە ژوورەوە ئەوی دیبوو، ناسیبوویەوە. بەرەو پیری هات.

« رۆژ باش مامۆستا...»

لە گەڵ خۆی بردیە ژوور.

« خەریکی خوێندنەوەی وتووێژەکەی ئێوە بووم. ئیمڕۆ دەرچووە. بڕوانە لە ریزەکەدایە.»

تا کوڕە گەنجەکە نەیگوتبوو، ئەو یەک، دوو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردیەی نەدیبوو. دەستی بردو ڕۆژنامەیەکی هەڵگرت. ڕەسمەکەی خۆی لە سووچێکی رووبەرگەکەیدا بینی. لە خواریەوە نووسرابوو « میهرەبان لە ناو کەسایەتی چیرۆکەکانیدا.» بزەی هاتێ. وتووێژی سێ ڕۆژ لەمە بەر بوو پێی وانەبوو وا زوو بڵاو ببێتەوە.

« دەمت خۆش بێ، قسەی چاکت کردوە.»

گەنجە ڕۆژنامە فرۆشەکە گوتیو، سەرنجی مشتەریەکانی بۆلای ئەو ڕاکێشا.

« فەرموو دانیشە. دەڕۆم دوو پیاڵە چا دێنم و...»

نەیهێشت. دانەنیشت. ڕۆژنامەکەی هەڵگرت و بە زۆر پارەکەی داناو، ڕۆیی. ئێستا ئیتر پێیوابوو زۆر کەس ڕەسمەکەیان دیوەو، دەیناسنەوە. هەستێکی ناخۆش بوو. ویستی لە شەقامەکە بپەڕێتەوە. ئوتومبێل قەتارەیان بەستبوو. هارە هارِ ... بە ناو هارە هارەکەدا پەڕیەوە. لەو بەر شەقام، لە قەرەباڵغی هات و چووی خەڵکەکەدا کەسێک بەری پێگرت. پیاوێکی بە ڕواڵەت هاوتەمەنی خۆی، ڕەنگە پیرترو، کەمێکیش لاوازتر. سەرو قژی ئالۆزاوو پیس بوو. داوای جگەرەی لێ کرد. ئەو بە ئاشنای هاتە بەرچاو. زۆر ئاشنا. بە کاوە خۆ دەستی بۆ گیرفانی بردو، لێی ورد بووەوە.

« ناسری... تۆ ناسری نیت؟! ئەوەی وا سێتاری دەژەند و...»

کابرا لێی سڵەمیەوە. شتێک لە چاوو نیگایدا گۆڕا. بێئەوەی وەڵامی بداتەوە یان جگەرەکەی لێ وەر بگرێ، هەنگاوێک کشایەوەو، پاشان پشتی تێهەڵکرد و گورج تێپەڕی. ئەو حەپەسابوو. « ناسری...» نیگای پڕ لە سەرسووڕمان و پرسیاری شوێن خست. لە بەر خۆیەوە گوتی: « ناسری بوو. دڵنیام ئەو بوو...» ویستی شوێنی کەوێ و... پێی هەڵگرت. بۆ ناو قەرەباڵغی دەوری مەیدانەکەو، چاوی بە هەموو لایەکدا گێڕا، بەڵام نەیبینیەوە. ونی کردبوو. ناسری خۆی لێشاردبووەوە. لە دەرەوەی قەرەباڵغیەکە، شەکەت پاڵی بە سندووقی پۆستی قەراغ پیادەڕۆکەوە دا.

« پێدەچوو ئەویش تۆی ناسیبێتەوە.»

من گوتم. گوتم: « تەنانەت جگەرەکەشی لێ وەرنەگرتی.»

هێشتا پاکەتەکـەی بـە دەسـتەوە بـوو. جگەرەیـەکی لـێ دەرهێنـاو دایگیرساند. مژێکی لێدا و، لە سەر سـندووقی پۆسـتیەکە کووژاندیـەوە. سەیرێکی ئەملاولای کـردو فڕێیدایـە جۆگەکـەوە. « بیـستبووم...» چـی بیستبوو؟ چیان گوتبوو؟

« ئەفسانەی کلۆڵ...» بەرز گـوتی. هەوڵـیدا روخـساری نیگـەران و چاوە تەڕەکانی ئەفسانە ببینێو، نەیدی.

گوتم: « ئەفسانە ژنیەتی؟ »

بزەیـەکی تاڵـو تازیـەباری لەسـەر لێـو بـوو. تێگەیـشتم. گـوتم:« ئەفسانە ژنیبوو؟»

هیچی نەگوت. دیسان سەر رێکەوتەوە. بۆ ناو قەرەباڵـغیەکەو، مـن شان بە شانی دەڕۆشتم.

گوتی: « شۆڕە لاوێ بوو ناسری. جوان و تەڕپۆش. لە بنەماڵەیەکی دەوڵـەمەند بـوو. پژۆیـەکی سـەوزی مودێـل بـالای لـە ژێـر پێـدا بـوو. جاروباریش سێتاری دەژەند. سالانێک لەمەبەر...»

گوتی سالانێک لەمەبەر و، ئاخێکی ساردی هەڵکێشا.

گوتم: « پیاوی دڵخوازی هەموو ئافرەتێک... بنەماڵەی دەوڵـەمەند و ئوتومبێلی مودێل بالاو... حەتمەن زۆری خۆشویستووە.»

« کێ؟ ئەفسانە؟ »

دووبارە لای لێکردمەوە. هێشتا بزە تاڵەکەی لە سەر لێو بـوو. بـزە تاڵە تازیە بارەکەو، رەنگە دەیویست ئازاری برینێکی کۆنی پێوەشـێرێ. گوتی: « ئەو دەمانە وەک ئێستا نەبوو. ئەو دەمانە پیاو بۆ ئـەوەی دڵـی کچێکـی وەک ئەفـسانە بـە دەسـت بێنـێ، پێویـستی بـەو شـتانە نـەبوو. پێویستی بە...»

منـیش بـزەم هاتـێ. گـوتم: « کراسـێکی جـووت گیرفـانی چـینی، پاڵتۆیەکی سەربازی ئەمریکایی، سـمێڵێکی زلی ئەستالینی و عەینـەکێکی سادەی قاپ رەش...»

پێکەنیم. گوتم: « ئەفسانە رۆژنامەی کاری دەفرۆشت یـان رێبـازی کرێکار؟»

«ئەفسانە کچی ئەو مەیدانانە نەبوو. ئەفسانە کچی هیچ مەیدانێک نەبوو. کچێکی تەنهاو دنیایەکی بچووک. دنیایەکی بچووک، بەڵام رۆشن و سەمیمی.»

ئێستا بزەکەی زەردەخەنەیەکی شیرین بوو، بە هەموو روخساریدا بڵاو بووبووەوە.

خۆم پێنەگیراو گوتم: «تۆ لە کوێی ئەو دنیا بچووک و سەمیمیەدا بووی؟»

هیچی نەگوت. پرسیارێکی سەخت بوو. بە ئاشکرا خۆی لێ دزیەوە و، منیش لە سەری نەڕۆشتم.

مەیدانەکەی بە جیهێشتبوو. دەبوو دیسان لە شەقامەکە بپەڕێتەوە و، بەرەو نووسینگەی بارامی برای بچێت. لە دوێنێوە ئەمە دووهەم جار بوو دەچوو. دەبوو بیبینێو داوای لێبکا وەستایەک بۆ چاککردنەوەی بانی ماڵەکەیان بنێرێ. بانی ماڵەکەیان وەک هەموو شوێنێکیتری کاول بوو. ئەگەر ئیمساڵ بەر لەوە بەفر و باران دابکا دەستێکیان پێدا نەهێنایە، دەڕووخا. ماڵی بێخاوەن... لەو هەموو ساڵەدا کە ئەو لێرە نەبووە... ئەگەر لێرە بوایە... بارام گوتبووی: «ئەگەر لێرە بوویتایە دوا مەرگی باوکمان دەمانفرۆشت و، دوو بەدوو کارخانەیەکی رەنگسازیمان دەکردەوە.» گەیشتبووە نووسینگەکە. رۆشتە ژوور. بارام دیسان لەوێنەبوو. مونشیەکەی بە شەرمەوە گوتی: «رۆشتووە سەرێک لە کارخانە بداو، بێتەوە. دێتەوە.»

ئەو لە سەر کورسیەک، روو لە دەرەوە دانیشت. نووسینگەکە بەرامبەر بە سینەما بوو. سینەمایەک کە لە ساڵانێک لەمەبەرەوە بوو. لەو دەمەوە کە ئەو منداڵ بوو. مێرمنداڵ. چەندە حەزی لە سینەما دەکرد. رۆژی وابوو چەند سەعات لە بەر دەرکەکەیدا، لە پەردە گەورەکەی ورد دەبووەوە. لە رەسمی ئەکتەرەکان و، ئێستا لە سەر پەردە کە رەسمی کچ و کوڕێکی گەنج بوو. کچ و کوڕ هەر کامە لە لایەکی پەردەکەو، بەرامبەر بە یەکتر. کوڕە نیگای بەرەو ژوورو، کچەکەش لە ئەو ورد بووبووەوە. لە کوڕەکە. هەردووکیان پێدەکەنین. نەقاشەکە ئەگەرچی روخساری جوانی کچەکەی کەمێک نیگەران و ترساو کێشابووەوە، بەو حاڵەش پێدەکەنی. نیگەران و ترساو پێدەکەنی. یان رەنگە ئەو وەهای

دیبێ. وەک پێکەنینی ئەفسانە، ئەو دەمە کە بوو، پێدەکەنی و، کچەکەی بە ئەفسانە دیبێ. کوڕەکەشی... ئەگەر من لەوێ بوومایە دەمگوت: «ناسری.» بەڵام من لەوێ نەبووم. لە کوێ بووم؟ من پێم نەدەکرا ئەو بۆ هەر کوێ دەچوو شوێنی کەوم. بە پێویستیشم نەدەزانی. ئەویش پێی خۆش نەبوو. کەسی هیچ چیرۆکێک پێی خۆش نیە بۆ هەر کوێ دەچێ، نووسەرەکەی شوێنی کەوێ. تەنانەت رەنگە فەرهادیش کە کەسی چیرۆکەکەی ئەو بوو. بەڵام ئەو هێشتا فەرهادی نەدیبوو. من هێشتا فەرهادم پێ نەناساندبوو.

رۆژنامەکەی لە گیرفان دەرهێنا و کردیەوە. بۆ وتووێژەکەی خۆی گەڕاو، دۆزیەوە. چایچی نووسینگە چایەکی خستبووە سەر مێزەکەی بەر دەستی. ئەو قومی لێدەدا و، جاروباریش سەری لە گۆفارەکە بەرز دەکردەوەو، لە دەرەوەی دەڕوانی. لە شەقام و هات و چووی خەڵک و ئوتومبێلەکان. لە سینەمای ئەو بەر شەقام و، لە پەردە گەورەکەی. کوڕەکە هەروا نیگای بەرەو ژوور بوو. لە چی دەڕوانی؟ کچەکە چاوی لێنەدەترووکاند. پێدەکەنی و، دەیویست سەرنجی راکێشێ.

پێدەچوو بارام وەدرەنگ کەوتبێ. مونشیەکە سەیری سەعاتەکەی دەستی کردو، لە بەر خۆیەوە، وەها کە ئەویش گوێی لێبێ، گوتی: «پێموانیە وا زوو بێتەوە. وا زوو نایەتەوە.»

ئەو سەری هەڵبڕی و لە مونشیەکەی روانی. خانمێکی هێشتا گەنج بوو. نزیکەو سی. ئارایشتێکی تۆخی کردبوو. لێوی سووری خوێنی، کوڵمەی سپی تیف تیفەدراوو، چاوو بڕۆی گەورەی رەش. رەنگە بە هۆی ئەو ئارایشتە تۆخەوە بووبێ کە هەڵچوو دەمارگرژ دیار بوو. رەنگە هەڵچوو دەمارگرژیش نەبووبێ، وەڕس و بێتاقەت بوو. چونکا ئەو هیچی نەدەگوت و نەیدەدواند؟ بێ ئەوە پێیگوترابێ تەلەفوونی بۆ کارخانە کرد. دیار بوو کەسێک پێی دەگوت بارام لەوێ نیە. داوای شەریکەکەی کرد، ئەویش نەبوو. تەلەفوونەکەی داناو، گوتیەوە:

«پێموانیە تازە بێتەوە. نایەتەوە.»

ئەو گوتی: «بۆ ژمارەی مۆبایلەکەی ناگری؟ »

« موبایلەکەی بە خۆی نیە.» نەیگوت بە خێزانیەتی. گوتی: « ئەگەر بە پەلەیت، یان دەبێ برۆی بۆ شوێنێکیتر، کە هاتەوە دەڵێم تەلەفوونت بۆ بکا. تەلەفوونت بۆ دەکا.»

تەلەفوونی بۆ نەدەکرد. ئەو دەیزانی. دڵنیا بوو. ئەو باسی بانیماڵەکەی دەکرد، باسی دەست پێداهێنان و چاک کردنەوەی. بارام خۆی لەو قسەو باسە دەدزیەوە. دەیگوت: « پارە لە چۆم خستنە. پیاوی عاقڵ مردوو عەمەلیات ناکا. ئەو ماڵە کاولە. دەبێ مشتەریەکی بۆ بدۆزینەوە و، لە ملی خۆمانی بکەینەوە.» لە یەکەم رۆژی گەڕانەوەیەوە بارام ئەوەی گوتبوو. گوتبووی: « دەبێ هەرچی زووترە بیفرۆشین. هەموومان پێویستمان بە پارەیە. بە تایبەت ئەو دوو زەعیفەی خوشکمان. مێردە سەگبابەکانیان سالانێکە گیرفانیان بۆ پارەی ئەم ماڵ و حەسارە هەڵدرووە و...» بەلام مونیرە گوتبووی: « نایفرۆشین. تا وەسیەتی دایک و باوکمان بەڕێوە نەچێ، من و رووناک بەشی خۆمان نافرۆشین.» ئەو رۆژە یان چەند رۆژ دواتر گوتبووی. گوتبووی: « وەسیەتی دایک و باوکمان ئەوە بوو هەموو منداڵەکانیان لەم ماڵەدا زەماوەند بکەن. کوڕەکان لێرە بووکیان بۆ دابەزێو، کچەکانیش لێرەوە برۆنە ماڵە مێرد.» ئەو پێکەنیبوو.

خانم مونشی ئۆقرەی لێ بڕابوو. پەستا پەستا سەیری سەعاتەکەی دەستی دەکردو، نیگای بۆ ئەو، کە بە خۆڕایی چاوەڕوانی هاتنەوەی براکەی بوو، دەگوێزایەوە. نیگای ئەو چاوە گەورە و رەشانە... ئەو هەستا. خانم مونشی لە خۆشیا گەشایەوەو، بەرز بووەوە.

« دەڕۆن؟ »

بە ئەدەب و زەردەخەنەوە گوتی. ئەو گوتی: « یادداشتێکی بۆ بە جێدێڵم. کە هاتەوە بیدەرە دەستی.»

ئەوسا داوای پەڕەیەک کاغەزی لێکرد. خانم مونشی خستیە بەر دەستی. خۆشحاڵ بوو. چاوە گەورە و رەشەکانی دەبریسکانەوە. ئەو نووسی: « هاتم پێت بڵێم پێویست ناکا خۆت لە کار بکەیت و، بە شوێن وەستادا بگەڕێی. جەلالی هاوڕێم بەڵێنی پێداوم بەمزوانە وەستایەکی ئاشنای خۆیم بۆ بنێرێت و، جگە لە چاککردنەوەی بانی ماڵەکە دەستێک بە ژوورەکانیشدا بێنێ. رەنگە حەوز و حەسارەکەش...»

ئەوەی بۆ ترساندنی بارام نووسی. یادداشتەکەی بە جێهێشتوو، رۆیی. هێشتا لە دەرکەی نووسینگەکە نەچووبووە دەر کە خانم مونشی پشوویەکی رەحەتی داو، تەلەفوونەکەی بەرز کردەوە. کەواتە ئەو موزاحیم بوو. موزاحیمێکی نامەحرەم کە دوا سالآنێک گەڕابووەوە و، وەزعەکەی لە هەموو کەس، تەنانەت لەو مونشیەش، شێواندبوو.

لە دەرەوە بۆ دوا جار سەیری پەردەی سینەماکە و، روخساری کچ و کوڕەکەی کردەوە. لەو ماوە کورتەدا پێکەنین بە روخساری هەردووکیانەوە وشک بووبوو، وەریبوو. کوڕ خەمبار بوو، کچەکەش نیگەران و ترساو. بیری فەرهاد کەوتەوە. قەرار بوو ئیمڕۆ بیبینێ؟

## سێ

دەمەو نیوەڕۆ گەڕابووەوە بۆ ماڵ و، لە هەیوان، لە سەر کورسیەکی کۆن و ژەنگاوی دانیشتبوو. روو لە حەسارو...

خەریکی دەورکردنەوەی دەرسەکانی بوو. CLNA کلۆریدی سدیۆم... لە بەر کردنی گران بوو. CLNA کلۆریدی سدیۆم... هەردووکیان خوێ بوون. ئەو خوێیە کە دایکی دەیکردە ناو چێشتەوە. یان بە خەیاریاندا دەکرد و... یان بە رێواس... لە خوار هەیوان، لە سێبەری درەختەکانی حەسار، لە سەر ئەو چرپایە کە باوکی عەسران لە سەری دادەنیشت و قلیانی دەکێشا خەریکی رێواس خواردن بوون. بارامی برای، مونیرە و رووناکی خوشکی و... کێیتریش؟ ئەو بە پەلە بە پلیکانەکاندا داگەڕا. دەبوو دەوری حەوزە گەورەکەی حەسار بداتەوە،

بــەڵام دەوری نەدایــەوە. بــاوکی لــە گــوێ حەوزەکــە خــەریک بــوو دەستنوێژی دەگرت. ئەو ڕۆژە یان ڕۆژێکیتر؟ ئەو ساڵــە یــان ســاڵانێک لەوە بەر؟ حەوزەکە پڕ لە ئاو بوو. بە چوار دەوری حەوزەکەدا گوڵدانی پڕ لە گوڵی ڕەنگاورەنگ. شەمدانی، ژاڵە، عەترچایی... وێنــەی گوڵــەکان لە ئاوی حەوزەکەدا و لە شینی کاشــیەکاندا، لــە گــەڵ وێنــەی لقووپــۆپی درەختــەکان تێکــەڵ بووبــوون. خــۆری دەمــەو ئێــوارە تیــشکی زەرد و نارنجی بە ســەر لەشــی نــەرم و خزیلکــی ئاوەکــەداو، بــە ســەر وێنــەی لقووپۆپی درەختەکان و، گوڵدان و گوڵــەکاندا بــڵاو کردبــووەوە. وێنــەی باوکیشی لە ئاوەکەدا بوو. باوکی دۆعای دەکرد. بە دەنگی بــەرز، وەهــا کە کوڕە چکۆلەکەی گوێی لێبێ و، فێری ببــێ. «ســبحان الله... ســبحان الله...» دەستە گــەورەکانی بــاوکی کــە لــە ئاوەکــەی ڕۆ دەکــردو، ئــەو شــڵپانە کــە بــە ڕوومەتیــدا دەپژانــد، وێنــەکانی دەشــەمزاند. وێنــەکان شەمزابوون. ماسیەکانی ناو حەوزەکەش تۆقابوون. ماسیە سوورەکەی ئەویش. ویستی بڵێ، بابە ماسیەکە... باوکی گوتی: «ئێستا ئیتر نــۆرەی تۆیە کوڕم. وەرە دەستنوێژەکەت بگرە.» بە دوو دڵیەوە ڕۆشــتە پــێش. ئەژنۆی خستە سەر لێواری تەڕی حەوزەکە. وێنەی خــۆی لــە ئاوەکــەدا نەرم و خزیلک، کەرت کەرت دەبوو. بە ترسەوە دەستە بچووکەکانی لــە ئاوەکە ڕۆ کرد. سارد بوو. گورجێک دەستی کێشایەوە. ئەوســا چــاوی بۆ ماسیەکان گێڕا. بۆ ماسیە سوورەکەی خــۆی. نەیــدی. لــە شــەپۆلانی وێنەکانداو، لە شەپۆلانی تیشکە زەردو نارنجیەکــەدا ونی کردبــوو. یــان ڕەنگــە ماســیەکە چــوو بــووە بنکــی حەوزەکــەو، لــە مابــەینی کاشــیە شینەکانی بنکی حەوزەکەدا خۆی شاردبووەوە.

«ئافــەرەم کــوڕم. ئێــستا الحمــدلله... الحمــد لله... الحمــد لله...»

دیــسان دەســتی بــۆ نــاو ئاوەکــە بــردەوە. ئــەژنۆی خــزاو، شــڵپەیەک دایچڵەکاند. گوڵدانێکی سەر لێواری حەوزەکە کــەوتبوو. کــەوتبووە نــاو ئاوەکەو، پرژەی بەرز بووبووەوە. تۆقا. سەری هەڵبڕی و بــە ترســەوە لە باوکی ڕوانی. لــە چاوەکــانی بــاوکی کــە لــە پــشت لــووت و ســمێڵی زلیەوە دیار نەبوون. سەرو سنگی باوکی لە ناو لقووپــۆپی درەختەکانــدا بوو. دایکی لەوبەر حەوزەکە، لە پشت ریــزی گوڵــە باخــەکان، مریــەم و، هێرۆ و، یاسەمینەکانەوە پشکۆی بــۆ قلیانەکــەی بــاوکی دەگەشــاندەوە.

بارام و مونیره و رووناکیش... حەتمەن ئەوانیش لەوێ بوون. حەتمەن لە سەر چرپای ناوەراستی حەسارەکە دانیشتبوون و... چیان دەکرد؟

رۆژێکی دوور بوو. سات بە ساتیش دوورتر دەبووەوە. روخسارەکان... دۆخی روخسارەکان نەدەگەیشتنە ئیمڕۆ و ئێستای. بەلام بۆنەکان و دەنگەکان هێشتا لە خەڵوەت و فەزای بێدەنگی حەساردا مابوون. رەنگە لە پشت سەری باوکیەوە نوێژی کردبێ کە دەیگوت: «شوکور بۆ خوا وەجاخم روونە. کورم هەیە و لە پشت سەرمەوە نوێژ دەکا.» بەلام ئەو لە بیری ماسیە سوورەکەیدا بوو. دڵنیایە لە بیری ماسیە سوورەکەیدا بووە کە لە بنکی حەوزەکە خۆی شاردووەتەوە.

حەوزەکە ئێستا وشک بوو. لە بری ئاو پڕ بوو لە سوالەتی شکاوی گوڵدانەکان و، رەنگی شینی دیوارەکانیشی تەپڵەکی کردبوو، وەریبوو. کاشیەکانی بنکی حەوزەکەش زۆربەیان درزیان بردبوو، شکا بوون. لە لایەکی حەوزەکە کۆگایەک سوالەتی شکاو هەڵدرابووەوە و، لە سووچێکی دوو پشیلەی لەڕو لاواز لە سەر زبڵ و خەوشەکە گرمۆڵە بووبوون. پشیلەی دەرکراوی ماڵە دراوسێکان بوون حەتمەن. هەموو حەسار جگە لە گژو گیاو بنچکی وشکەڵ، چڵێک گوڵی تێدا نەبوو. درەختەکانیش گەلای زەرد و سووریان کەوتبووە هەڵوەرین و لقی ئەستووری مێوەکان، بە سەر شانی درەختەکان و هەرزاڵە رماوەکاندا، گەلایان وەک چەرمی گای لێ هاتبوو. حەسار پارکێکی بچووکی شارێکی مەیدانی شەڕ بوو. کێ بڕوای دەکرد ئەمە حەساری ماڵی باوکی بێ ؟ حەساری ماڵی میرزا سەعیدی میهرەبان ؟ یەکەم رۆژی گەڕانەوەی پرسیبووی. پرسیبووی؟ لە بەر خۆیەوە گوتبووی. بارام گوتبووی: «تۆ سالانێک لێرە نەبووی. نازانی لەم ماوەدا ئێمە چیمان بە سەر هاتووە.» گوتبووی: «بۆ سەیری خۆمان ناکەی؟ خۆمان لەم ماڵ و حەسارە کاولترین.» ئەو سەیری کردبوو. تەنها کەسێک کاولی پێوە دیار نەبوو، بارام بوو. بەلام نا... پێدەچوو ئەویش وێران بێ. وێران بوو. لەو دیو چاوە رۆشن و گەشەکانیەوە، لەو دیو روومەتە قەڵەوو ماسیوەکەیەوە، لەو دیو جووڵەی بێئیختیاری دەستەکانیەوە، شتێک هەرەسی هێنا بوو. گوتبووی: «لەو رۆژەوە تۆ لێرە رۆشتووی، ئێمەش سەعاتێکی

خۆشـمان نەبووە. چارەنووسی ونی تۆ، مردنی باوکم و، هەشـت سـاڵ شەڕ و بۆمباران و دەربەدەری... لە هەموو ئەم ماوەدا...»

هەموو ئەم ماوە ئەو لە کوێ بوو؟ بارام پرسیبووی؟ گرنـگ نـەبوو کێ پرسیویەتی. گرنگ ئەوە بوو حەساری ماڵەکە، باخچە پـڕ لـە گـوڵ و دارو درەختەکـەی مـیرزا سـەعید وێـران بووبـوو. ماڵـەکەش... بـارام گوتبـووی: « بـا سـەرێک لـە نـاو ماڵـەکەش بـدەین. ئەڵـبەت ئەگـەر بـە سەرماندا نەڕووخێ.» گوتبووی: « من لە ترسی ئـەوەی بـە سـەر ژن و منداڵەکەمدا نەڕووخێ، دە ساڵێکە چۆڵم کردووە.»

ئەو بە تـرس و گومانـەوە بـە پلیکانەکانـدا هەڵـگەڕا بـوو. بەرلـەوە دەرکەی دووتایی راڕەوەکە بکاتەوە، چووبووە هـەیوان. پەنجـەرەکانی هۆڵ و ئاشپەزخانە
-دیوەخانە قەدیمیەکەی میرزا سەعید- لە ریزێکدا پێـوە درابـوون. سـێ کۆڵـەکە گەورەکـە هــەروا قــورس و قــایم بـــە ســەر پێــوە بــوون. ئەمـسەراوسەرێکی هـەیوانی کردبـوو. ئەوسـا لـە دەرکەیراڕەوەکـەوە رۆشتبووە ژوور. لە پێشدا بۆ ئەو سەری ماڵەکە. بەشی پشتەوەی. بـۆ ژوورەکــەی جــارانی خــۆی. ژوورەکــەی بــارام و ژووری کچــەکان. ژوورەکان چۆڵ بوون. خۆڵ و تۆزی دەیان ساڵە لە سەر دیواری رووت و ناو تاق و پەنجەرەکانیان نیشتبوو. ژوورەکان سارد و خەمبار بـوون. حەسارە بچووکەکەی پشتیشەوە سارد و خەمبار بوو. بـارام هـەروا بـە شوێنیەوە بوو. وەک دەلالێکی کارامە.وەک کەسێک بە تەما بێ ماڵێک لە چنگـی خاوەنەکـەی دەر بێنـێ، بێئیختیـار دەسـتی جوڵانـدبوو، شـکاوو شکستی ماڵەکەی نیشان دابوو. رەنگە هەر شکاوو شکستیەکەشی دیبێ. گوتبووی: « وەرە سەیرێکی ئەو بەشەش بکە. هۆڵەکەو...» گوتبووی: « پێموابــێ تــۆ نەرۆشــتبووی کــە دیوەخانەکــەمان تێـک داو، هــۆڵ و ئاشپەزخانە و حـەمامان لـێ سـازکرد.» بـارام بـە هەڵـە چووبـوو. دوا رۆشتنی ئەو دیوەخانەکـەیان تێکـدابوو. تێکیـان نـەدابوو، لایـەکیان بـۆ ئاشپەزخانە و حەمام لێ بڕ دابوو. بەر لە مردنی میرزا سـەعید. مـونیرە گوتبووی: « بارام بە تێکدانی دیوەخانەکە باوکمی لـە گـەورەیی خـست. بەهانەکەشی ئـەوە بـوو کـە خـانمی ژنی ناتوانـێ بـۆ لێنـانی کـەوچێک

چێشت، بەو هەموو پلیکانەدا بڕواتە خوار. ناوێرێ وەخت و بێوەخت خۆی بەو ژێرخانەدا بکا و، ...»

ئەو گەڕابووەوە بۆ ڕاڕەوەکەو، دەرکەی قەدیمی دیوەخانی کردبووەوە. دیوەخانی میرزا سەعید چۆڵ و بچووکتر لە جاران، بەڵام هێشتا سام و شکۆی ئەو دەمانەی مابوو. ئەو بە دەوری خۆیدا سووڕا بووەوە و، چاوی بە هەموو لایەکدا گێڕابوو. لە تاقەکان، لە پەنجەرەکانی سەر هەیوان و، لە گەچبڕی دیوارەکان ورد بووبووەوە. ئەوانیش تۆز و خۆڵی دەیان ساڵەیان لە سەر نیشتبوو. ئاشپەزخانەو حەمام و... بەولاترەوە ژووری باوک و دایکیشی. هەموو شوێنێکی ماڵەکە تۆز و خۆڵی دەیان ساڵەی لە سەر نیشتبوو. هەموو شوێنێکی ماڵەکە بۆنی باوکی لێ هاتبوو. بۆنی نەبوونی باوکی. بۆنی تێپەڕبوونی زەمان. بۆکۆن و فەرامۆشی و مردن. هیچی نەپرسیبوو. سۆراخی هیچی نەگرتبوو. بارام گوتبووی: «کە ئێرەمان چۆڵ کرد هەموو شت و مەکەکانمان کۆ کردەوە و، لە ژوورێکی ژێرخان لە سەر یەک هەڵمانچنین و، دەرکەمان لە سەر داخستن.» گوتبووی:
«هەموو یادگارەکان. جگە لە چەند ڕەسم کە توانای دڵ لێهەڵکەندنیانم نەبوو. ڕەسمی تۆ، ڕەسمی باوکم و... باقی شتەکانمان بۆ تۆ دانا. دەمانزانی ڕۆژێک لە ڕۆژان دەگەڕێیتەوە. هەموو یادگارەکانی بنەماڵەمان بۆ تۆ دانا. دەمانزانی چەندەت خۆش دەوێن...»

سێبەری بانەکە لە سەر هەیوان کشابووەوە. تیشکی خۆری نیوەڕۆی پاییز هەڵیکوتابووە سەر شان و ملی. هەروا بە دانیشتنانەوە کورسیە کۆن و ژەنگاویەکەی بۆ دواوە هەڵخزاند.

ڕۆژی دوایی زانیبووی هەموو یادگارەکانی بنەماڵە خەرمانێ کەلووپەلی کۆن و شکاو بوون و، لە ژێرخان هەڵڕژابوون. دوور لە چاوی بارام، مونیرەی خوشکی و مێردەکەی دوو، سێ کرێکاریان گرتبوو. ژوورەکان و بە تایبەت هۆڵەکەیان خاوێن کردبووەوە. بەشێک لە کەلووپەلەکانیان لە ژێرخان هێنابووە دەر، شتبوویان و بردبوویاننە سەر. یەخچاڵ، چراگاز، قاپ و قاچاغ، مێز و کورسی و مۆبل و... پەردە چیندارو کۆن و دڕاوەکانیشیان شتبوو، هەڵیانواسیبووەوە. ئەو بە توانجەوە گوتبووی: «بەس نیە ئەمانەش ماون!» مونیرە گوتبووی: «

ئەمانــەش پارەیــان بکردایــە دەفرۆشــران. وەک ئــەو هــەموو فەرشــە دەستچنە. وەک ئەو هەموو شتە جوان و عەنتیکانـە. وەک تەلـەفزوێن و دووخەت تەلەفوون و... کوێر بم بۆ ماڵ و دیوەخانی...»

بــەڕە و گلیمــە کۆنــەکانیان راخــستبوو. بزمــاری مۆبلــەکانیان کوتابووەوەو، کورسیو مێزی نووسینیشیان لە سـووچێکی ژوورەکـە - هۆڵـەکە- دانـا بـوو. قـاپی رەسـمەکان، ئاوێنـە شـکاوەکان، سـەعاتە دیواریەکەشیان بە سنگی دیوارەکانەوە هەڵواسیبوو. سەعاتە دیواریەکـە مێڵەکانی کەوتبوو. هێشتا کاری دەکرد. چرکە چرک. رادویۆ گەورەکەی میرزا سەعید کاری نەدەکرد. ئەو بە دڵـشکاوییەوە گوتبـووی: « ئەمانـە بوون یادگارەکانی بنەماڵە؟!» بە خۆیدا شکابووەوە. مونیرە گریا بوو. « خوشکت کوێر بێ...» مێردەکەی گوتبووی: « دەبێ خەتێک تەلەفوون بۆ ئێرە راکێشین.»

زڕەی تەلەفوونەکەی لە ژوورەوە بیست. هەستا. بارامـە؟ سـەیری هاتـێ. بـەڵام مـونیرە بـوو. هەواڵـی دەپرسـی. کـە تەلەفوونەکـەی دانـا هەستی بە برسیایەتی کرد. رۆشتە ئاشـپەزخانە. دەرکـی یەخچاڵـەکەی کردەوە و، لە شتێک گەڕا کە بیخوا. بـە درێژایـی ئـەم هـەموو ساڵـە لـە شتێک گەڕابوو بیخوا. لە هەر کوێ بوو، لە شاخ، لە عێراق، لـە تورکیـا... تەنانەت لە ئوروپاش... مونیرە دەیگوت: « خوشکت بمـرێ، کەواتـە لـەم هەموو ساڵەدا کەس نەبووە پیاڵەیەک چایت بو دەم کاو، پاروویەک نانت بۆ ساز کا؟ » لە بیری چووبووەوە، لێرە هەموو پیاوێک کەسێکی بوو چا و نانی بۆ ئامـادە بکـا. هـەموو پیاوێـک جگـە لـە ئـەو. رەنگـە جگـە لـە ناسریش. چـی بـە سـەر هـاتبوو ناسـری؟ لاوێکـی تـەڕپۆش کـە سـوار پژۆیەکی مودێل باڵا دەبوو، جاروباریش سێتاری دەژەند، ئێستا سواڵـی جگەرەی دەکرد. کلۆڵ ناسری. دیسان بـیری ئەفـسانە کەوتـەوە. کلـۆڵ ئەفسانە.

نیــوەڕۆژەی ئامــادە کردبــوو، دەبــوو بیخــوا. ئەوســا دەبــوو چاوەڕوانی من بێ. بـە هیـوا بـوو مـن بیبیـەم بـۆلای فـەرهاد. بـۆ ماڵـی فەرهاد. کامە مـاڵ؟ بـڕیاری خـۆی دابـوو. تاکـەی لـە خـۆف و رەجـای دەستپێکردنی چیرۆکەکەیدا بمێنێتـەوە؟ کـەم کـار تـا ئـەو رادە ئـازاری دابوو. حەفتەیەک، دوان... بۆ حەفتە و دوان؟ چەند مانگ بـوو بـیری لـە

نووسینی چیرۆکێکی تـازە دەکـردەوە. تەنانـەت بەرلـەوە بگەڕێتـەوە. بەرلەوەش لە بـیری نووسـینی چیرۆکێکیتـردا بـوو. چیرۆکـی فـەرهاد؟ هێشتا دڵنیا نەبوو. نە لـە مـن و، نـە لـە فـەرهادو، نـە لـە کەسـەکانیتری چیرۆکەکەی. نووسینی چیرۆکـی ئـەو کەسـانە کـە لـە ناویانـدای و، لـە ناویاندا دەژی کـارێکی دژوارە. هەمیـشە دژوار بـووە. بـە تایبـەت ئـەو کەسانە کە دەترسن و، لە ترسا لە ماڵـەوە، لـە ژوورەکـەیان دەخـزێن و دەرکە لە کەس ناکەنەوە...

من گوتبووم: « تەنانەت لە خۆشیان.» کەی ئەوەم گوتبـوو کـە ئـەو تووڕە بووبوو، هەڵچووبوو؟ گوتبووی: « بەڵێ منـیش دەترسـم. منـیش ترسنۆکم. هەموومان ترسنۆکین...» ئەوسا من پێکەنیبووم؟

دوا نیوەڕۆ چوو بۆ حەمام. هەموو جارێـک کـە دەبـوو دەسـت بـە کارێکی تازە بکا، یان کەسی چیرۆکێکی تازە ببینێ، دەچـوو بـۆ حـەمام. دەچوو لـەش و زەیـنی دەشـت. لـە ژێـر ئاوپاشـەکەدا بـوو. لـە ئاوێنـە گەورەکەی حەمامدا. بارانێک ئاوی شیلەو تێن بـە سـەر لەشـی رووتیـدا دەباری و، لەشی پیر بووبوو. لە کەیەوە ئەوەندە پیر بـووە؟ رووومـەتی تێک قوپاوەو، چاوی بـە قووڵـدا چـووە؟ لەشـی... مـونیرە گوتبـووی: « خوشکت کوێر بێ، خۆ تۆ منداڵی دوێنێی. بۆچی ئاوا...»

رووی لە ئاوێنەکە وەرگێـڕا. دەبـوو بـیر لـە شـتێکیتر بکاتـەوە. لـە کەسـێکیتر. لـەوەتی لـە حـەمام هـاتبووە دەر رۆشـتبووە پـشت مێـزی نووسینەکەی و سەری بە سەر کاغـەزێکی سـپیدا شـۆڕ کردبـووەوە و، بیری لە فەرهاد دەکردەوە.

گوتم: « فەرهاد خەوتووە. جاروبار ئەم کاتانە دەخەوێ.»

سەری بەرز کردەوە. لە ماڵ و ژوورەکەی خۆی نـەبوو. لـە مـاڵ و ژوورێکیتر بوو. ژووری فەرهاد؟ ژوورەکە تاریک بوو. تاریـک و پـڕ لـە دووکـەڵ. بۆکـۆن و بـۆنی زبـڵی سـووتاوی لـێ دەهـات. فـەرهاد لـە سووچێکی ژوورەکە لە بەر رۆشنایی کزی پەنجەرە بچووکەکەیدا راکشا بوو. جاجـمێکی دڕاوی پێوە بوو. بەملاترەوە مـن دانیـشتبووم. لـە لای مەنگەڵیەکە. قۆریەکی رەش لە سەر مەنگەڵیەکە بوو. لە سەر پـشکۆکان. ئەو سـەیری دیوارەکـان و سـەیری بنمیچـی ژوورەکـەی کـرد. رەش و تاریک بوون. قاپە رەسم و ئاوێنـەی شـکاوی سـەر تاقـەکانیش رەش و

تاریک بوون. سەعاتە دیواریەکەش توێخێک دووکەڵ و دوودەی لە سەر نیشتبوو. وەستا بوو، کاری نەدەکرد. دەتگوت سالآنێکە وەستاوە و، کاری نەکردووە. بە سەرسووڕمانەوە گوتی: «ئێوە لێرە دەژین؟ لەم ماڵ و ژوورە...»

مەبەستی من و فەرهاد بوو. من پێکەنیم. ریزێک دانی زەرد و پیس... ئەو نەیدی. بەرەو فەرهاد چوو. بەرەو پەنجەرەی بچووکی ژوورەکەی. چاوە شیشەکان دووکەڵ تەڵخی کردبوون. رۆشناییەکی کزو لاوازیان لێدەهاتە ژوور و، بە رەشایی و تاریکی ژوورەکەدا بلاو دەبووەوە. بەرە دەستی لە یەکێک لە چاوەکان هەڵسوو. بەرە دەستی رەش بوو. گوێی پێنەداو، لەو دیو پەنجەرەکەی روانی. ئەو دیو پەنجەرەکە حەسارێکی گەورەی پڕ لە دارو درەخت بوو. حەسارێکی کاولی پاییزی. لەوبەر حەسارەکەوە ماڵێکی گەورەی چۆڵ بوو. ژێرخان و سەرخان. هەیوانێکی گەورە و، سێ کۆڵەکە و، ریزێک پەنجەرە... بەلایەوە غەریب نەبوو. گوتی: «ئەو حەسارو ماڵەم بەلاوە غەریب نیە. دەڵێی پێشتر دیومە.»

دیبووی. دڵنیا بوو کە دیویەتی. بەڵام هەرچی هەوڵیدا وەبیری بێتەوە، بێسوود بوو. گوتی: «بیرو هۆشم نەماوە. لەوەتی گەڕاومەتەوە...»

قسەکەی تەواو نەکرد. باڵندەیەکی رەش و گەورە لە قاپی پەنجەرەی ژوورەکەدا سەرنجی قۆستەوە. باڵندەکە بە سەر حەسار و ماڵە چۆڵەکەی ئەوبەریەوە دەسووڕایەوە و، جاروباریش لە قاپەکەو لە ئاسۆی روانینی ئەو دەچووە دەر. ون دەبوو.

گوتم: «وەرە دانیشە، چام بۆ تێکردووی.»

ئاوڕی لێدامەوە. لە قۆری سەر مەنگەڵیەکە دوو چام تێکردبوو. قەندانێک قەندیشم دانا. لە جاران پیرتر و کەنەفتتر هاتمە بەر چاوی. بەزەیی پێمدا هات. پرسیارەکەی دووبارە کردەوە و، گوتی: «ئێوە هەردووکتان لێرە دەژین؟»

من هیچم نەگوت.

«ئێوە چی یەکترن؟»

هیچم نەگوت و پێکەنیم.

« تۆ کێیت؟ فەرهاد چیتە؟ »

گوتم: « چیرۆکی ژیانی من دوورووو درێژە. نەتبیستووە چونکا هێشتا نەمنووسیوە.»

گوتم: « چاکەت سارد نەبێتەوە.»

پیاڵە چاکەی بە سەرەوە نا. تاڵ بوو. ئەوەندە تاڵ، کلۆ قەندەکەی ناو دەمیشی پێی شیرین نەکرابوو. گوتی: « لەم وڵاتە چیرۆکی زۆر کەس نەنووسراوە. وا چاکە بڵێم، لەم وڵاتە چیرۆکی کەس نەنووسراوە.»

ئەوسا سەیری فەرهادی کرد. تەرمێکی بێجووڵە بوو لە ژێر جاجمێکی کۆن و دڕاودا. گوتی: « بریا فەرهاد بەئاگای دەبووەوە و هەڵدەستا.»

چاکەی خواردبووەوە و، بە شوێنیدا جگەرەیەکی داگیرساند. منیش جگەرەیەکم داگیرساند. گوتم: « فەرهاد بەئاگا نابێتەوە.»

داچڵەکی. گوتی: « بەئاگا نابێتەوە؟ چۆن بەئاگا نابێتەوە؟ من بۆلای ئەو هاتووم. هاتووم قسەی لە گەڵ بکەم.»

تەرمەکە جووڵا. پیرە پیاوێکی چکۆلەو زەردەڵ لە ژێر جاجمەکە هاتە دەر. خێشکە خێشک هەڵخزاو، لەبەر رۆشنایی کزی پەنجەرەکە، بە بێهیچ قسەو باسێک، بە بێهیچ نیگا و سەرنجێک پاڵی دایەوە.

گوتم: « ئەمەش فەرهاد.»

فەرهاد دەستە باریک و ئێسکنەکانی لە دەوری ئەژنۆی ئاڵاندو، سەری بە ملیەوە بۆ سەر شانی شۆر بووەوە. قژی خۆڵەمێشی سەر و ریشی، روومەتی تێکقوپاوو چاوی بە قوڵدا چووی... دەتگوت تەرمی مۆمیایی پیاوێکە دوا هەزار ساڵ لە ژێر خاک دەرهاتبێو لەبەر رۆشنایی کزی پەنجەرەیەکی بچووکدا، لە ژوورێکی تاریک و پڕ لە دووکەڵ، لە ژوورێک کە بۆکۆن و بۆنی زبڵی سووتاوی لێدێ، بە دیوارەکەوە هەڵیانپەساردبێ.

گوتم: « ئەمەش کەسی چیرۆکەکەت.»

ئەو دەستبەجێ ناسیبوویەوە. لە پشت هەوری دووکەڵ و رەشایی و پیریەوە ناسیبوویەوە. ئەو تەرمە کە تا ساتێک لەمەبەر راکشابوو، ئێستا دانیشتبوو پاڵی دابووەوە و، لە هیچ تەنانەت لە ئەویشی

نەدەڕوانی، فەرهاد بوو. پیاوێک کە لە زەینیدا بوو. ناوو پارچە پارچەیەک لە رابوردووی. پیاوێک کە قەرار بوو کەسی چیرۆکەکەی بێ.
واق و وڕماوو تاساو گوتی: «ئەم پیاوە بۆ وای لێهاتووە؟»
هەستا. هەنگاوێک لێی چووە پێش و، دوو هەنگاو لێی کشایەوە. گوتی:
«بڕوا ناکەم... نا، بڕوا ناکەم...»
ئەوسا رووی لێ وەرگێڕا. سووڕێک بە دەوری خۆیدا و، بە ناو ژوورەکەدا گەڕا. ترسا بوو. بە بیریدا هات هەڵێ. بە بیریدا هات لەو ژوورە دۆزەخیە بڕواتە دەر. بڕواتەوە بۆ ماڵی خۆیو، لە بەر ئاوێنەیەکدا راوەستێ و، بۆ جارێکیتریش لە خۆی بڕوانێ. بەڵام مایەوە. بە هەمان ترس و هەراسەوە، لە تەرمەکە، لە تەرمی دانیشتووی فەرهاد ورد بووەوە.
نووسی: «چی بەسەر هاتووە ئەم پیاوە؟ بۆ وای لێهاتووە فەرهاد؟ شان و باهۆی پیاوانەی بۆ وا تێک شکاوە؟ لە ژێر باری کام خەم و ئازاردا...»
نووسی: «لە پێناوی کام تاواندا سزا دراوە ئەم پیاوە؟ لە پێناوی کام تاواندا سزا دەدرێین ئێمە؟ لە ئاگری کام تۆڵەدا دەسووتێین؟ لە دۆزەخی کام قەدەردا دەبینە خۆڵەمێش؟ لە زبڵدانی کام مێژوودا ون دەبین؟ لە ساتەکانی کام زەماندا لە بیر دەچینەوە؟...
نووسی و نووسی... پاشان قەڵەمەکەی فڕێدا و هەستا. هەستا بۆ ئەوەی بە ژوورەکەدا بێت و بچێو، ئەم پرسیارە بێوەڵامانە بە سەر فەرهاددا بڕشێتەوە. فەرهاد تەرمێکی دانیشتوو، پەیکەرێکی شکاو و شکستی لاواز، پیرمنداڵێکی زەردەڵ. ئەژنۆکانی لە باوەش گرتبوو، سەری بە ملیەوە شۆڕ بووبووەوە و، لە هیچ، تەنانەت لە ئەویشی نەدەڕوانی. من هێشتا لە پاڵ مەنگەڵیەکەدا دانیشتبووم. فەزای رەش و تاریکی ژوورەکە پڕ بوو لە دووکەڵ.
ئەو تووشی سەرەگێژە بووبوو. دڵی تێکەڵ دەهات و هێڵنجی دەدا. بەرەو دەرکەی ژوورەکە چوو. ژوورەکەی خۆی یان ژوورەکەی فەرهاد؟ دەرکەی کردەوە و سەراسیمە رۆشتە دەر.

# چوار

من پێموانەبوو بینینی فەرهاد تا ئەو رادە دایچڵەکێنێ و ئازاری بدا. رەنگە چونکا خۆم سالانێک لە گەڵی ژیابووم و خووم پێگرتبوو. خووم بە فەرهاد گرتبوو. بەڵام ئەو... ئەو لە هەموو سالانی غوربەت و ئاوارەییدا ترسابوو شتێک یان کەسێک ون بکا. چی یان کێ؟ نەیدەزانی. ئەوەندەی دەزانی کە دەبێ هەموو ژیان و هەموو بیرەوەریەکانی رابوردووی بۆ خۆی رابگرێ. هەموو خەون و ئاوات و... هەموو ئەو کەسانە کە کەسی رابوردووی بوون. ترسا بوو فەرامۆشیان بکا. وەک فەرهاد کە هەموو شت و هەموو کەسی فەرامۆش کردبوو. تەنانەت خۆشی فەرامۆش کردبوو. ئەو چاوەڕوانی نەدەکرد فەرهاد وەها پیاوێک بێ. گوتبووی: «ئەگەر بمزانیایە فەرهاد وەها پیاوێکە هەرگیز بڕیاری نووسینی چیرۆکەکەیم نەدەدا.» بە رق و تووڕەییەوە گوتبووی. گوتبووی: «تۆ دەبوو بە منت بگوتایە ئەو بیرەوەریە پچڕ پچڕ و پارچەپارچانە کە لە زەینی مندا کەڵەکە بوون، بەشێک لە رابوردووی پیاوێکن کە خۆی فەرامۆشی کردوون. دەبوو لە یەکەم رۆژەوە بە منت بگوتایە.» یەکەم رۆژ؟ مەبەستی ئەو رۆژە بوو کە یەکترمان دیبوو. ئەو رۆژە کە لە یەکتر ئاشکرا بووبووین. سەرەتا وەک دوو کەسی لە یەک نامۆ و نەناسیاو رووبەرووی یەکتر بووینەوە. دوو کەس لە دوو دنیای جیاواز. دوو کەس لە دوو زەمانی جیاواز. دوو کەس لە دوو چیرۆکی... گوتبووم: «من دەمەوێ چیرۆکی تۆ بنووسم.» داچڵەکیبوو. گوتبووی: «چیرۆکی من؟» گوتبووم: «چیرۆکی میهرەبان. پیاوێک کە دوا سالانێک غوربەت و دووری گەڕاوەتەوە و...» نەیهێشتبوو قسەکەم تەواو بکەم. گوتبووی: «من گەڕاومەتەوە چیرۆکی کەسێکیتر بنووسم. چیرۆکی ...» گوتبووم: «فەرهاد؟» بیری کردبووەوە. سالانێک بوو حەزی کردبوو چیرۆکی فەرهاد بنووسێ. گوتبووی: «تۆ فەرهاد دەناسی؟» ئەوسا من پێکەنیبووم. ئەوە یەکەم جار بوو کە من

پێکەنیبووم و ئەو ریزێک دانی زەرد و پیسی دیبوو. ئەو رۆژە بڕیارمان دابوو ئەو چیرۆکی فەرهاد بنووسیّ و منیش...

سەرەتای شەو بوو کە گەڕایەوە بۆ ماڵ. شەکەت و بێواز بوو. کۆتەکەی داکەندو، خۆی فڕیدایە سەر یەکێک لە مۆبلەکانی ژوورەکەی. قرمەیەک لە مۆبلەکە هەستاو، بە دەمیەوە جیڕەیمەخمەڵەکەشی بیست. هەر ئەوەندە کە نەکەوتبووە زەوی گوێی پێنەدا. لە سەر مۆبلەکە درێژ بوو. چاوی لێک نا. فەرهاد هێشتا لەبەر چاویدا بوو. پیاوێکی داماوی کلۆڵ کە ژیان و رابوردووی خۆی فەرامۆش کردبوو. بۆ دەکرا پیاو ژیان و رابوردووی خۆی فەرامۆش بکا؟ باوک و دایک و خزم و کەس و کاری... منداڵی و مێرمنداڵی و گەنجیەتی... بیرەوەریەکانی... بۆ دەکرا پیاو بیرەوەریەکانی رابوردووی لە گەڵ هاوڕێ و برادەرانی تافی لاوی فەرامۆش بکا؟ عەسر، دوا ئەوەی لە ژوورەکەی فەرهاد رۆشتبووە دەر، تەلەفوونی بۆ جەلالی هاوڕێی کردبوو: «دەمەویّ دۆست و برادەرانی کۆنمان ببینم. لەوەتی گەڕاومەتەوە کەسیانم نەدیوە.» جەلالی سەیری هاتبوویە. گوتبووی: «چاکە. شەوێک لێیان دەگێڕینەوە و، لە دەوری یەکتر کۆ دەبینەوە. شەویجومعە باشە؟» ئەو گوتبووی: «دەمەویّ ئیمرۆ بیانبینم.» جەلالی بیری کردبووەوە، بۆ ئیمڕۆ؟ ئەوسا گوتبووی: «وەرە دەر، لە سەر شەقام چاوەڕوانم بە. بە ئوتومبێل دێم بە شوێنتدا.» ئەو لە دورەوەش دڵی تێکەڵ هاتبوو. هێڵنجی دابوو. خەریک بوو لە ناو جۆگەی شەقامەکەدا بڕشێتەوە کە جەلالی گەیشتبوو، سوار ئوتومبێلەکەی کردبوو. جەلالی دیبووی سەراسیمەیە و، رەنگ بە روخساریەوە نەماوە، ترسا بوو. گوتبووی: «چی روویداوە؟»

«هیچ.»

«ئەی بۆ...؟»

ئەو دووبارەی کردبووەوە. «دەمەویّ هاوڕێ و برادەرانی کۆنمان ببینم.» ئەوسا دیبوونی. هاوڕێ و برادەرانی کۆنی، ئەوانەی لێرە مابوون چەند پیاوێکی سەر و سمێڵ ماش و برینجی بوون. بەخێرهاتنەوەیان لێکردبوو. بۆ ئەوەی نەچووبوونە لای داوای لێبوردنیان لێکردبوو. گرفتاری... کێشەی کار و ژیان و... ئارام و لە سەرخۆ دوابوون و پێکەنیبوون. هیچیان لەو کوڕە گەنج و جەربەزانە

نەچووبوو کە ئەو بە جێیهێشتبوون. ئـەو کـوڕە گەنجانـە باسـی کـار و کاسبی و، قەرز و قۆڵە و، چەک و سفتەیان نەدەکرد. باسی ئیدارە و پلـە و پایەیان نەدەکرد. باسی ماڵ و دووکان و ماشێنی خۆیان و خەڵکیتر... باســی داهــاتووی منداڵــەکانیان... نەیانــدەگوت کــڵاوت ســەر چــووە گەڕاویتەوە. گەڕاویتەوە بۆ ناو ئەم خەڵکە کە لە هیچ ناگەن؟! پیاو چـۆن لە ئورووپاوە، لە ناوەندی خۆشی و گوزەرانی خۆشەوە دەگەڕێتەوە بـۆ ئێرە؟ ئەو کوڕە گەنجانە ئـەم قسانەیان نـەدەکرد. ئـەو دڵـنیا بـوو ئـەو پیاوانە کوڕە گەنجەکانیان فەرامۆش کردبوو. حەز و خـەون و ئـاوات و، تەنانەت شێوەی قسەکردنی کوڕە گەنجەکانیـشیان فـەرامۆش کردبـوو. ئەویشیان فەرامۆش کردبوو...

زڕەی تەلەفوونەکە چاوی پێهەڵێنا. بیری کردەوە رەنگـە مـونیرەی خوشـکی بـێ. مـونیرە زوو بـە زوو تەلـەفوونی بـۆ دەکـرد و هەواڵـی دەپرسی. بەڵام بارام بوو. باسی بـانی ماڵـەکەو یادداشـتەکەی ئیمـڕۆی کرد. تووڕە بوو. یان وایدەنواند کەتووڕەیە. گوتی: « بۆ من مردووم کە جەلالی هاوڕێت وەسـتات بـۆ بگـرێ؟ بـۆ مـن بێگانـەم کەیادداشـتم بـۆ بەجێدێڵی؟ »

ئەوسا کەوتە گلەیی کردن. بۆ ئەو لـە بـری نووسـینگە نـەچووە بـۆ ماڵەوەیان؟ بۆ سەریان لـێ نـادا و پـشتی تێکـردوون؟ نـەوەک هـەر لـە زمانی خۆیەوە، لە زمانی ژن و منداڵەکانیشیەوە دەیپرسـی. لـە زمـانی ئەوانیـشەوە دەدوا. منداڵـە کلۆڵـەکانی دڵـیان خۆشـە مامـەیان، بـرای باوکیـان، پـشت و پـەنای باوکیـان، دوا سـاڵانێک غوربـەت و دووری گەڕاوەتەوە، کەچی... « ئای کە زمانلووس و چەنەدرێژە بارام.» لە بـەر خۆیەوە گوتی.

بارام گوتی: « سبەینێ دەبێ بێـی بـۆ ماڵـی ئێمـە. نیوەڕۆژەکـەمان پێکەوە دەکەین و دوانیوەڕۆش...»

ئەو گوتی: « سبەینێ دەڕۆم بۆ دێ. لە گەڵ جەلالی...»

قـەرار بـوو لـە گـەڵ جـەلالی بـڕۆن بـۆ دێ. دوو شـەو لـە ماڵـی خەزووری جـەلالی بمێننـەوە و، بـە رۆژیـشدا بـڕۆن بـۆ کێـو. جـەلالی گوتبووی: « تۆ وەڕس و بێتاقەتی، منیش ماندووم. دەمێکەیە سـەردانی ماڵی خەزووریشم نەکردووە. دوو رۆژ دەچین و لەو شاخانە بـای باڵـی

خۆمان دەدەین.» ئـەم ئێـوارە گوتبـووی. دوا ئـەوەی خواحافیزیـان لـە برادەرانی کۆنیان کردبوو. ئەو پێی خۆش بوو.

بارام گوتی: «تۆ هێشتا دوو حەفتە نیە گەڕاویتەوە.»

گوتی: «تۆ نابێ...» نەیگوت تۆ نابـێ وەک سـاڵانێک لەمەبـەر، وەک تافی گەنجیت بجووڵێیتەوە و، لە گەڵ هاوڕێیانتـدا بـۆ ئـەملاو لا بـڕۆی. گوتی:

« تۆ نابێ لە بیرت بچێتەوە کەس و کـارت هەیـەو، بـۆ سـەردانی ئـەوان گەڕاویتەوە. پیاوی عاقڵ...»

بارام هەمیشە باسی پیاوی عاقڵی دەکردو، ئەو کارانە کە نایکا. یـان نابێ بیکا. پیاوی عاقڵ دوا سـاڵانێک ناگەڕێتـەوە بچێـت بـۆ دێ... پیـاوی عاقڵ واز لە ژیانی ئوروپا ناهێنێ کە لێرە بژی... پیاوی عاقڵ لـە ماڵـێکی کۆن و کاولدا... پیاوی عاقڵ...

بارام عاقڵە. هەموو عاقـڵن. لـەوەتی ئـەو گەڕاوەتـەوە، یـان رەنگـە لەوەتی ئەو لێرە رۆشتووە هەموو عـاقڵ بـوون و، باسـی پیـاوی عـاقڵ دەکەن. بارام و خێزانی. مـونیرەو روونـاکی خوشـکی و، مێردەکانیـان. هاوڕێ و بـرادەرانی کـۆنی... تەنانـەت جـەلالیش. هـەموویان جگـە لـە ناسـری. ناسـریش سـاڵانێک لەمەبـەر، ئـەو دەمـە کـە سـوار پژۆیـەکی سەوزی مودێل باڵا دەبوو، جاروباریش سێتاری دەژەند، عاقڵ بوو. ئـەو دەمە کە شوێن ئەفسانە دەکەوت و ئەفسانەش... بڕیاری دابوو ئیمـشەو کەس بۆ ژوورەکەی، بۆ خەڵوەتی ژوورەکەی رێگە نەدا. نە ناسـری، نـە ئەفسانەو، نە هیچکەسیتر. تەلەفوونەکەی دانا و لە سـەر مۆبلەکـە درێـژ بووەوە. سەریخستە سەر دەسکی نەرمی مۆبلەکە و، چەناگەی لە سنگی رەقی چەقی. بریا کەسێک دەبوو پەتوویەکی پێدا بـدا و، هـەروا خـەوی لێدەکەوت. بەڵام کێ؟ قەرار نەبوو کەس بۆ ژوورەکەی رێگە بدا. نە مـن و نە فەرهاد و نە ئەفسانەی ژنی ناسری.

## پێنج

چێشتانێکی درەنگ بوو لـە خـەو هەڵمـساند. مانـدوویی دوو رۆژی رابوردوو لە لەشی دەرچووبوو. بەڵام برسی بوو. لەوەتی گـەرابووەوە

زوو زوو برسی دەبوو. رەنگە لە بەر جیاوازی خواردنی ئێرە و... تەنها خواردن نەبوو. هەموو شتێکیئێرە لە گەڵ شوێنیتر جیاواز بوو. تەنانەت ساتەکانیشی و، ئەو دەبوو ئەم ساتانە بژی. ساتەکانی ئێرە. دەبوو لەم ساتانەدا بنووسێ.

«لەوەتی گەڕاویتەوە چیت کردووە؟»

دوێنێ ئەم کاتانە جەلالی لە کێو لێی پرسیبوو. ئەویش گوتبووی... چی گوتبوو؟ رەنگە گوتبێتی: «دەمەوێ چیرۆکێکی تازە بنووسم. لە سبەینێوە دەست پێدەکەم.» ئیمرۆ سبەینێی دوێنێیە. چوو بۆ ئاشپەزخانە ناشتا بکا و، پاشان دانیشێ و، خەریکی رێک و پێککردنی هەموو ئەو شتانە بێ کە لە زەینیدا کەڵەکە بووبوون.

من شوێنی کەوتم و لەسەر سفرە بچووکەکە لە بەرامبەری دانیشتم. سفرەی ئەم بەیانیەی رەنگینتر بوو. هەنگوین و رۆنەکەرە و پەنیری خۆماڵی. دیاریماڵی خەزووری جەلالی. نانەکەشی نانی تەنووری ئەوان بوو.

گوتم: «لەوە دەچێ ئیمشەو خۆش خەوتبێتی. پێموانیە قیژە تیژو ترسناکەکەی شەوان لە خەو راپەڕاندبێتی.»

دەمزانی. دوێشەو ئەوەندە ماندوو بوو، سەریخستبووە سەر سەرین خەوی لێکەوتبوو. قیژەکەی شەوانیش بەئاگای نەکردبووەوە. رەنگە قیژەکە نەبووبێ کە بەئاگای بکاتەوە. یان ئەوەندە دوور بووبێ پێی بەئاگا نەکرابێتەوە.

«بە پێچەوانەی تۆوە فەرهاد... ئەو تا بەیانی...»

نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم. بە تووڕەییەوە گوتی: «ئەو تا بەیانی چی؟ نەخەوتووە؟ قسەی کردووە؟ نەکا شەڕی کردبێ؟!»

پارووی لە دەمدا بوو دەدوا. هەوڵیدەدا تووڕەییەکەی وەشێرێ.

گوتم: «نەخۆش بوو. بە دەم ئازارەوە دەینالاند و گینگڵی دەدا.»

«وەک ماری بریندار؟!»

بە تەوس و لاقرتێوە گوتی و، پێکەنی. وەها کە بیەوێ لاسایی پێکەنینەکەی من بکاتەوە. ئەوسا جیدی بووەوە. گوتی: «ئیتر حەز ناکەم هیچ دەربارەی فەرهاد ببیستم.»

گوتی: «ئەمە بڕیارێکەو داومە...»

خۆشــی نەیــدەزانی چ بــڕیارێکی داوە. هــیچ بــڕیارێکی نــەدابوو. قسەیەک بوو لەو کاتەدا بە دەمیدا هاتبوو. بیرێــک بــوو لــەو ســاتەدا بــە مێشکیدا تێپــەڕیبوو. بــیری ئــەوەی زەیــنی لــە هــەموو ئــەو شــتانە وا پەیوەندیان بە ئەوەوە هەیە، ئەو کەسە ناوی فەرهادەو، سالانێکە تووشی فەرامۆشی بووە، پاک بکاتەوە. گوتی:

« گەوجیەتیە پیاو هەموو توانا و بەهرەی خۆی، ساتەکانی تەمەنی خۆی فیدای رابوردووی کەسێک بکا کە نیازی بە رابوردوو نیە.»

دەمزانی نابێ لە بەرامبەر پیاوێک دانیشم کە لــە خــۆی... لــە مــن... یان رەنگە لە هەردووکمان تووڕەیەو، نابێ لەو چاوانە ورد ببمەوە کە بە گــران تووڕەییەکــەیان شــاردووەتەوە. بۆیــە هەســتام و رۆشــتمە بــەر پەنجەرەکە راوەستام. بۆ ئــەوەی ســەیری دەرەوە بکــەم و، لــە هــەمان حاڵیشدا بڵێم: « ئەی چیرۆکەکە... چیرۆکەکە چی بەسەر دێ؟ »

« چیرۆکەکە؟!»

نەیگوت وازی لێ دێنێ. بیگوتایە بڕوام پێ نــەدەکرد. گــوتی: « ئــەم دوو رۆژە لــە دێ بــیرم لــە پڕۆژەیــەکی تــازە کردووەتــەوە. بــە تــەمام چیرۆکی کەسێکیتر بنووسم.»

گوتم: « ناسری؟ »

« بۆ ناسری؟! چیرۆکی ناسری چیرۆکێکــی کــۆن و ســواوە. تاقانــە کوڕی پیاوێکی دەوڵەمەند عاشقی کچێکــی هــەژار دەبــێ. کچــە دڵــی لای کەسێکیترە، بەلام لە هەلوومەرجێکی تایبەتدا بە ناچاری شــووی پێــدەکا و، دوایچەند ساڵ...»

نەیگوت دوای چەند ساڵ کچە دەمرێ و کوڕەکەش...

گوتم: « کەواتە ئەفسانە.»

ناشتای کردبوو، سفرەکەی کۆ دەکردەوە. جگەرەیەکی بە دەمــەوە بوو، دووکەڵەکەی چــاوی دەکزانــدەوە. ئــاوڕی لــێ دامــەوە و لــێم ورد بووەوە. نیگای، نیگای پیاوێکی مانــدوو دامــاو بــوو. گــوتی: « ئەوانــەی ژیانیــان دەدۆڕێــنن، لــە پێــشدا گەمــەکانیان دۆڕانــدووە. گەمــەی خۆشەویستی و...»

گوتی: « من ئەو گەمەیەم دەمێکەیە دۆڕاندووە. سالانێک لەمەبەر.»

ساڵانێک لەمەبەر چیرۆکی ئەو دۆڕانەی نووسیبوو. لە تورکیا، لە ژووری بچووکی رستوورانێک. چیرۆکێکی عاشقانە لە زەمینەیەکی توند و تاڵی سیاسیدا و، کۆمەڵێ دروشم و... دواتر لە ئوروپا، لە گۆفارێکدا بڵاوی کردبووەوە.
(( ئەو دڵدارەی نەبووە هاوڕێم)).
هەمیشە خۆی بۆ نووسین و بە تایبەت بڵاو کردنەوەی ئەو چیرۆکە سەرکۆنە کردبوو. تەنانەت لە کۆڕێکی ئەدەبیشدا، لە دەرەوەی وڵات گوتبووی: (( ئەو چیرۆکە خراپترین چیرۆکی منە.)) ئەو چیرۆکە چیرۆکی کچێک بوو ئەگەرچی عاشقی دەسگیرانەکەی بوو، بەڵام حازر نەبوو لە خەبات بۆ رزگاریدا هاوڕێیی بکا. دەسگیرانی کچەکە چیرۆکەکەی دەگێڕایەوە. پیاوێک کە ناچار بوو لە چیرۆکی عاشقانەی کچەکە بێتە دەرو... ئەو گوتبووی: (( بێژەری ئەو چیرۆکە راستگۆ نیە. نە لە گەڵ خۆی، نە لە گەڵ کچی چیرۆکەکەدا.)) یەکێک لە کۆڕەکەدا هەستابوو گوتبووی: (( تێناگەم راستگۆیی یان درۆزنی بێژەری ئەو چیرۆکە چ پێوەندیەکی بە تۆوە هەیە؟ )) گوتبووی: (( مەگەر نووسەر بەرپرسی چاکەو خراپەی کەسی چیرۆکەکانیەتی؟ )) ئەو داچڵەکیبوو. وەخۆی هاتبووەوە. گوتبووی: (( تۆ راست دەکەی. نووسەر بەرپرسی چاکەو خراپەی کەسی چیرۆکەکەی نیە.)) نەیگوتبوو بەڵام نووسەریش وەک هەموو کەسێکیتر بەرپرسی چاکەو خراپە و، راست و درۆی خۆیەتی. نەدەبوو بیڵێ. بیگوتایە دەیانزانی بێژەری ئەو چیرۆکە خۆیەتی. نەدەبوو بزانن. ئەوە رازێک بوو نەدەبوو کەس بیزانێ. تەنانەت منیش کە وەک خۆی چیرۆکنووس بووم و، لە بەر پەنجەرەی ژوورەکەی راوەستابووم. من کە... بەڵام من دەمزانی. دەمزانی هەندێک چیرۆکنووس لە پشت کەسی چیرۆکەکانیانەوە خۆیان دەشارنەوە. دەمزانی ئەو لە پشت بێژەری چیرۆکەکەوە خۆی شاردووەتەوە. دەمێکە بوو دەمزانی. بۆیە پێکەنیم. لەو پێکەنینانە کە... ئەو زیاتر لە هەمیشە رقی لێم بووەوە. لە من و لە هەموو ئەو چیرۆکنووسانە کە لە بەر پەنجەرە رادەوەستن، پێدەکەنن و، بە کەسی چیرۆکەکانیان دەڵێن: (( من دەزانم. تۆ ناتوانی هیچ شتێک لە من بشاریتەوە.))

من شتی وام نەگوتبوو. لە ژوورەکەی نەبووم کە بیلێم. لە هیچ ژوورێکی ماڵەکەی نەبووم. ئێستا ئەو تەنها بوو. تەنها لە بەر ئاوێنەی شکاوی سەر تاقەکە راوەستابوو. زۆربەی قژی سەر و سمێڵی سپی بووبوو. روومەتی تێکقوپا بوو، چاویبە قووڵدا چووبوو.

نیگەران و ترساو رووی لە ئاوێنەکە وەرگێڕا. کرتە کرتێکی بیست. کرتە کرتی مشکێکی بچووکی ماڵەکی کە شتێکی دەکرماند. رەنگە ساتەکانی تەمەنی... لە کوێ بوو ئەو مشکە کە ساتەکانی تەمەنیدەکرماند؟ لێی گەڕا. دۆزیەوە. لەم قوژبنەوە بۆ ئەو قوژبن و، لەم سووچەوە بۆ ئەو سووچ شوێنی کەوت. شەکەت و ماندوو گەیشتە پشت مێزەکەی. چەند پەڕە کاغەزی سپی لە سەر مێزەکەی بوو. قەڵەمەکەی هەڵگرت و...

## شەش

رۆژێکیتر بوو ئەو رۆژە کە دانیشتبوو ئەم چەند لاپەڕە نووسینەی خۆی دەخوێندەوە. دەسپێکی ئەو چیرۆکە کە دەبوو بینووسێ. دەسپێکێک لە دوا دەیان دەسپێکی ناسەرکەوتوو. بۆ ئەم چەند لاپەڕە بەلایەوە سەرکەوتوو بوو؟ هێشتا نەیدەزانی. ئەوەندەی زانیبوو کە نابێ بیاندڕێنێ و، نەیدڕاندبوون. گرمۆڵەی نەکردبوون و، نەیرشتبوونە ناو سەلەی ژێر مێزەکەیەوە. نووسیبووی:

نەقاش دەبێت تابلۆکەی بکێشێتەوە، هەروەها کە چیرۆکنووس چیرۆکەکەی دەنووسێت و، بەرامبەر بە سێپایە چێوەکەی دادەنیشێت نەقاش. لە سپیەتی زەق و قیرسیچمەی قوماشەکە ورد دەبێتەوە. لە گێژەنی خەرمانێک هێڵ و نەخشی ئالۆز و تێک چرژاودا هیچ نەخشێکی بۆ ماڵی نابێت. تەنانەت نەخشی روخساری کاڵێش. کاڵێی لە شوێنێک لە رابوردووی خۆیدا ون کردووە نەقاش.

سالآنێک لەمەبەر ونی کردووە. ئێستا ئەو تابلۆیەش نادۆزێتەوە کە رۆژێک لە رۆژان لە کاڵێی کێشاوەتەوە.

ئەو رۆژە کراسێکی ئاودامێنی تەخت شینی لە بەردا بووە کاڵێ، بە گوڵی وردی سوورەوە. لە سەر لێواری حەوزێک دانیشتووە. بە سەر ئاوی روون و زوڵاڵی حەوزەکەدا نەویوەتەوە. لە لەرە و جمەی نەرمی روخساری خۆی بە سەر ئاوی حەوزەکەوە ورد بووەتەوەو، لە سەمای ماسیەکان و گوڵە سوورەکان. خۆر لە دەرەوەی تابلۆکە زریوەی زیوی بە سەر ئاوەکەدا هەڵڕشتووە. تابلۆیەکی سەیر بووە. ئەوەی دیویە شەیدای بووە. شەیدای روخساری کچێک لە نێو ئاوی روون و زوڵاڵی حەوزێکدا. بە کەسی نەگوتووە کاڵێیە. تەنانەت بەو پیرێژنەش کە بە رێکەوت نیگای لە تابلۆکە هەڵەنگوتووە، ئاخێکی ساردی کێشاوەو، گوتوویە: «دەترسم لەو ئاوەدا بخنکێ کاڵێ.» بە کچە تەونکەرەکانیشی نەگوتووە. ئەو دەستە کچانە کە لە ژێرخانی ماڵەکاندا، باڵای قاڵی گرێ گرێ بە دەم جوولەی گورجی ئەنگوستیانەوە هەڵکشاوە. کچەکان بەرتەونانە کاڵێ وەی کاڵێیان گوتووە. جوان و میهرەبان بوون کچە تەونکەرەکان. نەقاش سیمایانی لە بیر نەماوە. جوان و میهرەبان بووە کاڵێ...

نەقاش هەروا لە نێوان تەبارێک رەنگ و فڵچەی وردو درشتدا دانیشتووە و، جگە لە چەند هێڵ، هیچیتری لە سەر سپیایی تابلۆکە نەکێشاوە. چەند هێڵی خوار و خێچ و رەش و باریک، کە هەر کامیان بەرەو لایەکی دەبەن و، هیچیان بەرەو کاڵێی نابەن. تەزوویەک وەک تیر بە لاجانگیدا تێدەپەڕێت. تابلۆ و سێپایە چێویەکە بە ژوور سەریەوە دەخولێنەوە.

«لە کوێی کاڵێ؟»

داماوانە دەنگ هەڵدەبڕێت: «لە کوێی کاڵێ؟ بۆ رووتم لێدەشاریەوە؟...»

ئەوسا دەستێک کە نازانێت دەستی کێیە، پەرداخێک ئاوو چەند دەنک حەبی دەداتێ. حەبەکان دەخوات و، لە پشت سەریەوە چپەچپێک دەبیستێت

« ئاگایله خۆی نیه. نازانێ دەڵێ چی.»
سەرەگێژەکەی نامێنێت، بەڵام هێشتا دەترسێت. دەترسێت ئەو تابلۆیەی پێ تەواو نەکرێت. دەترسێت کاڵێ نەبینێتەوە. بیر دەکاتەوە، واچاکە شوێن ئەو چەند هێڵە خوارو خێچەی سەر تابلۆکەی کەوێت. نازانێت تا کوێ. یەکەم هێڵ دەیباتە حەساری ماڵێک. بۆ سێبەری بن دارو درەختێک. حەسارو درەختەکان بە ژوور سەریەوە دەخولێنەوە. یەکێک دەڵێت: « واچاکە بۆ ماوەیەک واز لە کێشانەوە بێنێ. ماندووە. پێویستی بە پشوودانە...»
ماندووە. دەزانێت نەقاش. لەوەتی لەو ماڵ و حەسارە هەڵبڕاوە، ئەوەندەی کۆڵانەو کۆڵان کردووە ماندوو بووە. کۆڵانەو کۆڵان گەڕابوو، ئەوسا لە کۆڵانێکدا ون بووبوو. هەروەک کاڵێ کە ون بووە و، نایدۆزێتەوە نەقاش. چپەچپەکان واز ناهێنن.
« خەمۆکە تاقەتی کەسی نیە...»
« تووشی فەرامۆشی بووە...»
« دوکتۆر دەڵێ...»
« نابێ بهێڵن بە تەنها لە ماڵ بڕواتە دەر...»
دەبێت بڕۆاتە دەر نەقاش. شوێن هێڵێکیتر کەوێت و... دەبێت... تەنانەت ئەگەر سەرەگێژەش واز نەهێنێت و، تەزوو وەک تیر بە لاجانگیدا تێپەڕێت. دەبێ چەند دەنک حەبیتر بخوات و سەر ڕێ کەوێت...
ڕێ کەوتووە. لە کۆڵانێکی چۆڵدایە. گورج و بە پەلە دەڕوات. نایهەوێت کەس ببینێت. تێناگات بۆ. لەو کۆڵانەوە بۆ کۆڵانێکیترو... ئوتومبێلێکی سپیواش لە بەرامبەریەوە دێت. دادەچڵەکێت نەقاش. دەتۆقێت. سێ پیاوی تەرپۆش، ریش و سمێڵ تاشراو لێی دادەبەزن. بە ویقارو بە ئەدەب دیارن پیاوەکان. بە تایبەت سێهەمینیان کە تەمەن هەڵکشاوترە. دەخوازن سوار ئوتومبێلەکەیان بێت. میهرەبانن پیاوەکان. دەیانهەوێت بیگەیەنن. وەبیری نایەتەوە بۆ کوێ...
شوێن هێڵێکیتر دەکەوێت. ئەو ڕۆژە یان ڕۆژێکیتر. چاویان بەستووە. لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتری دەبەن. لە ڕەشاییەکەوە بۆ ڕەشاییەکیتر. شتێک وەک پێ، دێتە بەر پێی. سەرەنگڵ دەدات. لە

چەند پلیکانەوە بەر دەبێتەوە. تەختی زەوی دەبێت نەقاش. هەر ئەو سێ پیاوە بەرزی دەکەنەوە. میهرەبان نین ئیتر. هەرگیز نەبوون. پاڵی پێوە دەنین. بە دیوارێکیدا دەکوتن. چاوبێنی لێ ناکەنەوە. بە شەق و مست دەکەونە گیانی.

« لە کوێ بووی؟ »

« دەتویست بچیتە کوێ؟ کێ ببینی؟ »

سەرەگێژە... دیسان سەرەگێژە و تەزوویەک کە بە لاجانگیدا تێدەپەڕێت. دیسان پەرداخێک ئاوو چەند دەنک حەبی رەنگاوڕەنگ. دیسان چپە چپ...

« لە کوێی کاڵێ؟ دەمەوێ بتبینم. دەبێ بتبینم...»

نایبینێت. رەشایی دەرفەتی بینینی نادات. بەڵام دەنگی دەبیستێت. دەنگی کاڵێ دەبیستێت. نازانێت چۆن دەنگی کاڵێ لە سەر ئەو قوماشە سپیە بکێشێتەوە نەقاش. دەنگی کاڵێ لە قەرەباڵغی ئەو هەموو دەنگەدا... لە قەرەباڵغی ئەو هەموو قیژە تیژو ترسناکەدا... ئەو هەموو هاوار هاوار و ناڵە ناڵە... قوورە قووڕی گریان و حیلکە حیلکی پێکەنین دێت. چپە چپی مووزی کەسانێک لە پشت سەریەوەو، چرکە چرکی سەعاتە مێڵە کەوتووەکانی سەر سنگیدیوارەکان...

**گوتم: « ئەوە دواهەم تابلۆی فەرهاد بوو کە هەرگیز بۆی تەواو نەکرا.»**

**لە دەنگی من داچڵەکی. قەرار نەبوو چیرۆکی فەرهاد بنووسێ. کەواتە نەدەبوو کەسی چیرۆکەکەی منیش بێ. سەری سووڕماوی هەڵبڕی. نیگای واق وڕماوی گێڕا، بە هەموو ژوورەکەداو، من مات و خەمبار لەو بەر مێزەکەیەوە راوەستابووم. وازی لە خوێندنەوە هێنا. بیری کردەوە، لەوە ناچێ بتوانێ خۆی لە نوسینی چیرۆکی فەرهاد بدزێتەوە. دەبێ ئالای سپی هەڵکا. هەڵیکرد. تەسلیم بوو. تەسلیم؟ لە بەرامبەر کام دەسەڵاتدا؟ قیرسیچەیی من، رابوردووی فەرامۆش بووی فەرهاد، یان مەیلی نووسین؟ هەر ئەو مەیلە کە نەقاشی تا دوا ساتەکانی بوونی لە بەر سێپایە و تابلۆکە راگرتبوو. ئێستا نەقاش**

هەمان فەرهاد بوو، فەرهادیش پیاوێک وەک هەموو پیاوانی رابوردووی خۆی. وەک خۆی. خۆی؟

«رابوردووی پیاوانی نەسلێک چەندە لە یەکتر دەچێ.»

لە بەر خۆمەوە ئەوەم گوت و، ئەو گوتی: «بەڵام من نامەوێ چیرۆکی نەسلێک بنووسم. من دەمەوێ...»

نەیگوت من دەمەوێ چیرۆکی فەرهاد بنووسم. هیچی نەگوت. دەستی بۆ قەڵەمبڕەکەی برد. قەڵەمەکەی پێ تاشیو، بیری کەوتەوە جگەرەیەک داگیرسێنێ. بۆ ئەوەی بە سەر گومان و دوودڵیەکەیدا زاڵ بێ، دایگیرساند. گوتی: «تابلۆکە چی بە سەر هات؟»

ئەو کاتە من لە سەر یەکێک لە مۆبلەکان دانیشتبووم. گوتم: «هەرگیز پێی تەواو نەکرا. تا نیسکە هۆشێکی مابوو سەرئێشەو سەرەگێژە نەیانهێشت. لەودواش هەموو شتێکیلە بیر چووەوە.»

هەموو شتێکی لە بیر چووەوە؟ نەیپرسی. دەیزانی. بەڵام بڕوای نەدەکرد. لەو رۆژەوە فەرهادی دیبوو، بڕوای نەکردبوو. چۆن دەکرێ پیاو هەموو شتێکی لە بیر بچێتەوە؟ باوک و دایک و... چۆن دەکرێ پیاو ئاوات و ئارەزووەکانی فەرامۆش بکا؟ خەونەکانی... روخساری خۆشەویستەکەی... روخساری کاڵێ... گوتی: «کاڵێ کێ بوو؟»

«ونبوویەک.»

ئەوسا گوتی: «کام یەک لە ئێمە ونبوویەکمان نیە؟»

بە خەم و داخەوە گوتی: «دەڵێی ئێمە وەها ژیاوین کە بە تایبەت کەسێک یان شتێک ونبکەین، بۆ ئەوەی باقی تەمەنمان لێی بگەڕێین. لە تابلۆو نەخشەکانماندا. لە...»

ئەو لە کێدەگەڕا؟ لە خۆی پرسی. بۆ دیتنەوەی کێ لەو سەری دنیاوە بۆ ئەم سەریگەڕاوەتەوە؟

## حەوت

پرسیارێکی گران بوو. لەوەتی گەڕابووەوە هەموو رۆژێک لە گەڵ پرسیارێکی سەخت و گراندا رووبە روو دەبووەوە. پرسیاری بێوەلام و، بیری کردەوە لە کوێ دەبێ بە شوێن وەلامی ئەو پرسیارانەدا بگەڕێ؟ ئەو پرسیارانە کە تەنها پەیوەندیان بە ئەوەوە بوو. بە ژیان و رابوردوویەوە.

من گوتم: «لە پشت مێزەکەت. لەو لاپەڕانەدا کە دەیاننووسی.»

لە پشت مێزەکەی نەبوو. لە ژوورەکەش نەبوو. لە هەیوان، لە سەر کورسیە ژەنگاویەکە دانیشتبوو لە حەساری دەڕوانی. حەوزەکە دیسان وشک و لارووخاو بوو. درەختەکانیش گەلایان دەوەری و، دار تووە گەورەکەی حەساری ماڵی دروایسێکەشیان... لە دارتووەکەی حەساری ماڵی دراوسێکەشیانی دەڕوانی. لە هێلانەی چۆڵی لەقلەقەکان بە سەر لقە بەرزەکانیەوە. لەقلەقەکان رۆژێک بەر لە گەڕانەوەی ئەو کۆچیان کردبوو. ئەگەر لێرە بوونایە لەوانیشی دەڕوانی و، گوێی بۆ تەقە تەقی شیرینی دەندووکیان شل دەکرد. باڵندەیەکی گەورەش جاروبار بە چارۆکەی رەشی باڵە کراوەکانیەوە بە سەر ماڵ و حەسارەکەدا دەسووڕایەوە. گوێی بۆ دەنگی تیژو ترسناکی ئەویش شل دەکرد.

لە هەیوانەوە بەشێکی شار دیار بوو. بەشێک لە گەڕەکەکەو، ئەگەر لایبکردایەوە ماڵەکانی ئەو بەر شەقامیشی دەدی. شەقامێک کە تازە کێشرابوو. لەم سالانەدا کە ئەو لێرە نەبووە و، لایەک لە ماڵ و حەسارەکەی ئەوانیش کەوتبووە سەر شەقام. بارام گوتبووی: «تمەنی سەد تمەن نرخی ماڵ و حەسارەکەی بەرز کردووەتەوە. ئەم شەقامە سیمای گەڕەکەکەی گۆڕیوە.» سیمای شارەکەش گۆڕابوو. تازە بووبووەوە. گەورە بووبوو. ماڵ بە داوێنی شاخەکاندا هەڵگەڕابوون. بەرامبەر بە ماڵەکەی ئەوان تەپۆڵکەیەکی گەورەیان داپۆشیبوو. پێشتر ئەو تەپۆڵکە، کانی و ئەستێرێکی خۆشی لێبوو. چەند داری بە بەرو...

کە منداڵ بوو هەموو جومعەیەک لە گەڵ منـداڵانی گـەڕەک و قوتابخانـە دەچوونە ئەویَ و...

بە بیریـدا هـات جـارێکیتریش بچێتـەوە. ماڵـەو مـاڵ و، حەسـارەو حەسار بگەڕیَ و کانیەکە بدۆزێتەوە. من پێکەنیم. پێکەنینەکـەم ئـازاری نــەدا. دوو ســیَ ڕۆژ بــوو ئــازاری نــەدەدا. گــوتم: « وا کانیەکەشــت دۆزیەوە. بە تەنها...»

جگە لە یەک دوو کەس کە تا ئێستاش لە گەڕەکەکەدا مابوون، ناوی باقی منداڵەکانی ئەو دەمەی لە بیر نەمابوو. بـە بیریـدا هـات بـڕوا مـاڵ بەماڵی شارەکەیان بۆ بگەڕیَ. بۆ دۆستانی سەردەمی منداڵی. هەروا کە بۆ هاوڕێیانی تافی گەنجی و بەر لە ڕۆشتنی گەڕابوو. لە گـەڵ جـەلالی، کۆلان بە کۆلان و ماڵ بە ماڵ. زۆربەیان نەمابوون. یان لێرە نـەمابوون و، هەرکامە لە شوێنێکیتر و لە سووچێکیتری ئەم وڵاتە و ئـەم دنیایـە... ئەوانەش کە مابوون... جەلالی گوتبووی: « ئەوان ئێستا ئەو هاوڕێیانـە نین کە سالانێک لەمەبەر بە جێتهێشتوون.» جەلالی بە خـەم و مەراقـەوە گوتبووی. بەڵام بارام بـە تیـز و توانجـەوە دەیگـوت: « شــەقی زەمانـە هــەموویانی گۆڕیــوە. پــارە تــۆو ســەدانی وەک تــۆی پــیَ لــە بــیر بردوونەتەوە.» دەیگوت: « لە ناو هەموویاندا تۆ کلاوت سەرچوو. تۆ و چەند کەسێکی وەک تۆ. بـە قسـەی ئـەوان وازتـان لـە ژیـان و کـەس و کارتان هێناو، شوێن خەونێکی منداڵانە کەوتن. ئەوسا ئەوان پـشتیان لـە خۆتان و خەون و کەس و کارتان کـرد... کـە تـۆ ڕۆشـتی هـاوڕیَ زۆر نزیک و خۆشەویستەکانت لە ڕێبازیشدا خۆیان لـیَ لادەدایـن. وەهـا کـە ئێمە گـول بـین. لـە پرسـەی باوکیـشمدا زۆربـەیانم نـەدی...» ڕەنگـە نەیگوتبیَ زۆربـەیان، گـوتبێتی هیچیـانم نـەدی. دەیگـوت: « دەترسـان ئەگەر مەرحەبایی ئێمە بکەن، بیانگرن.»

بیانگرن؟ بۆ ئەو کیَ بوو؟ چی کردبوو؟

دیسان زڕەی تەلەفوونەکەی بیست. داچڵەکی. بە خۆشیەوە بـەرەو پیری چوو. بە خۆشیەوە؟ لەو ساتەدا پێی وابوو لە دەرەوەی وڵاتە. لـە شارێکی دوور و غەریب. لـە ماڵـێکی چـل و ئەوەنـدە مەتریـدا و، چەنـد مانگە چاوەڕوانی تەلەفوونی کەسـێکە. چـاوەڕوانی بیـستنی دەنگێکـی

ئاشنا. دەنگی ئاشنای مونیرەی خوشکی بوو. گوتی: « خۆ لە بیرت نەچۆتەوە ئەم عەسرە میوانت دەبێ؟ »

میوان؟ بە هیوای میوان نەبوو. مونیرە دەیزانی. گوتی: « من و نەشمیل و لەیلا. نەکا بڵێی کامە لەیلا؟ »

نەیگوت کامە لەیلا. دەیناسی. کچێکی شاعیر بوو. مامۆستای نەشمیلی خوشکەزای. نەشمیلی کچی مونیرە. مونیرە بە پێکەنینەوە تەلەفوونەکەی دانا.

لەیلا... ماوەیەک لەمەبەر لە کۆڕێکی ئەدەبی دیبووی. لە کۆڕی مانگانە یان حەفتانەی ئەنجومەنی ئەدەبی. داوەتیان کردبوو، چووبوو. کۆڕێکی بچووک لە هۆڵێکی بچووکدا. سەد کەسێک کە زۆربەیان شاعیر و نووسەری گەنج بوون. بەرلەوە ئەو قسە بکات چەند کەسێکیان هەستا بوون و شێعریان خوێندبووەوە. ئاخر کەسیان کچێک بوو، چارشێوی بە سەرەوە بوو. روومەتی سپی و سووری لە قاپی رەش گرتبوو. لە هەموو ئەو ماوەدا کە شێعری خوێندبووەوە، زەردەخەنەی لە سەر لێو بوو، لە ئەوی روانیبوو. وەها کە شێعرەکەی هەر بۆ ئەو خوێندبێتەوە. ئەو هەموو شێعرەکەی لە بیر نەماوە. جگە لە دوا دێڕەکانی...

ئەو دوای خوێندنەوەی شێعرەکان هەستا بوو، چووبووە پشت میکرۆفۆنەکە و... کچەکە لە ریزی ئافرەتەکاندا، شان بە شانی نەشمیلی خوشکەزای دانیشتبوو، دیسان لە ئەوی روانیبوو. ئەو باسی زمان و ئەدەب و، باسی ئەو شێعرانەی کردبوو کە لە کۆڕەکەدا خوێندرابوونەوە. لە کۆتاییشدا وەڵامی پرسیارەکانی دابووەوە. پرسیاری دانیشتوانی کۆڕەکە دەربارەی چیرۆکەکانی و دەربارەی خۆی...

کە کۆڕەکە دوایی هاتبوو ئەو ئاخر کەس بوو لە هۆڵەکە چووبووە دەر. نەشمیلی خوشکەزای و ئەو کچە کە شێعری خوێندبووەوە، لە دەرەوە چاوەڕوانی بوون. بەرەو پیری چووبوون. کچەکە دیسان زەردەخەنەی لە سەر لێو بوو. روومەتی سپی و سووری لە قاپی رەش گرتبوو. گوتبووی: « ماندوو نەبی...» گوتبووی: « ئێمە هەر دەزانین نووسەرو هونەرمەندەکانمان مەحکەمە بکەین.» سەمیمی و بێپێشەکی

گوتبـووی. ئەوسـا پێکـەنیبوو. نەشـمیلیش پێکـەنیبوو. ئـەو سـەیری نەشـمیلی کردبوو، سەیرکردنێکی بە پرسیار.
« ئەم خانمە کێیە؟ » دڵنیا بوو دەستەخوشکی نیە. بە تەمەنتر بوو. کچە نەیهێشتبوو نەشـمیل بیناسـێنێ. خـۆی گوتبـووی: « مـن لـەیلام. لـەیلا تلووعی. ساڵێکە لە گەڵ چیرۆکەکانتدا ئاشنام و، بـۆ ئـەم ئاشـنایەتیەش سوپاسی نەشـمیلی خوشکەزات دەکـەم.» چاوەکـانی بریـسکابوونەوە. چاوەکانی نەشـمیلیش بریـسکابوونەوە. لـەیلا گوتبـووی: « نەشـمیل قوتابیمـە و مونیرەخـانمی دایکـی...» ویـستبووی بـڵێ هاوڕێمـە و، نەیگوتبوو.
مونیرە گوتبووی: « لەیلا خانمێکی میهرەبان و هەست ناسکە. ئێمە ساڵێکە دەیناسین و لەم ماوەدا...»
ئەو بۆ دووهەم جار لەیلای لە ماڵی مونیرە دیبووەوە. بە رێکەوت؟ رەنگـە رێکـەوتیش نـەبووبێ. خۆشـحاڵ بـوو کـە دیبوویـەوە. لـەیلاش خۆشحاڵ بـوو. دیـسان زەردەخەنـەو، روومـەتی سـپی و سـووری لـە قاپێکی رەشداو... پێکەوە قسەیان کردبوو. دەربارەی شـێعر و ئـەدەب و، دەربارەی ئەو شتانە کە لـەو کاتـەدا باسـیان هـاتبووە گـۆڕێ. ئـەو هەستی بە خەمێکی تەنک لـە روومـەت و گـوتنی لـەیلادا کردبـوو. ئـەو کاتەش کە شێعری خوێندبووەوە، خەمێکی تەنک لە روومـەت و گوتنیـدا بـوو. زەردەخەنەکەشـی پێـی نەشـاردرابووەوە. پێکەنینەکەشـی... دوا رۆشتنی، مونیرە گوتبووی: «باوکی نـەماوە. کـوژراوە. ئەوکاتـە لـەیلا منداڵ بووە.» رەنگە ئەو خەمە لەو کاتـەوە نیـشتبێتە سـەر روومـەت و گوتنی. ئەمەیان مونیرە نەیگوتبوو. نەشـمیل گوتبووی: « یەکەم جار کە باسی تۆو چیرۆکەکانتی دەکرد، نەیدەزانی باسیخالۆی من دەکـا.» ئـەو پێکەنیبوو. مونیرە گوتبووی:
« تۆی زۆر خۆش دەوێ. تەنانەت بەر لەوە زانیبێتی کەسی ئێمەی، تۆی خۆش ویستووە. گوایە گوتوویەتی...»
« دەیگوت ئاواتم ئەوەیە رۆژێک بیبیـنم. لـە نزیکـەوە بیبیـنم و...»
نەشـمیل گوتبووی. ئەو گوتبـووی: « کەواتـە رۆژێـک لـە گـەڵ خۆتـان بیهێنن بۆ ماڵەوە.» بـە مـونیرەی گوتبـوو. هـەر ئـەو رۆژەش قـەراری ئیمڕۆیان دانابوو.

مونیره و کچەکان بێدەنگ و بێچرپە هاتبوونە حەسار و، پاشـان بـە پلیکانەکانـدا هەڵـگەڕابوون. مـونیره کلیلـی دەرکـەی حەسـاری پێبـوو، دەرکــە ئاســنیەکەی ســەر شــەقام. گوتبــووی: «نــایکوتین، خۆمــان دەیکەینەوە.» گوتبووی: «خوشکی بمرێ، کە میوانی دەچێ دەبـێ بـەو هەموو پلیکانەدا داگەڕێ و دەرکەی لێبکاتەوە.» لەیلا بیری کردبووەوە، خۆشە بێخەبەر خـۆی بـە مـاڵ و ژووری نووسـەرێکدا بکـا و لـە پـشت مێزەکەی، لە کاتی نووسیندا بیبینێ. بـیری لـەوە نـەکردبووەوە رەنگـە ئەو لە پشت مێزەکەی نەبێ. بەڵام ئـەو لـە پـشت مێزەکـەی نـەبوو. لـە ژوورەکەش نـەبوو. بـۆ کـڕینی هەنـدێک کەلووپـەلی پێویـست لـە مـاڵ رۆشتبووە دەر و، کە گەڕایەوە مونیره خەریکی شتنەوەی هەیوان بوو. نەشـمیل و لەیلاش شانیان دابووە بەر کۆڵەکەکان و چاویان لـە دەرکـە ئاسنیەکەی حەسار بڕیبوو. ئەو لە دەروازەی سـەر کۆڵانـەوە هـاتبووە ژوور. تا نەگەیشتبووە ناوەراستی حەسارەکە کەسیان نەیاندیبوو. لەیلا پێشتر بە هۆی نەشــمیلەوە بـە حەسـارەکەدا گـەڕابوو. بـە نـاو مـاڵ و ژوورەکاندا و، چەپکێک گوڵی نێرگس

-کە خـۆی هێنـابووی- خـستبوویە گوڵـدانێکی بلـوورەوە و لـە سـەر مێزەکەی دانابوو.

مونیره گوتی: «میوانداری کردن هەر لە خۆی جوانە! ئێمە هیچ، لەیلا خانم یەکەم جارە دێت بۆ ئەم ماڵە. نەدەبوو...»

لـەیلا چارشـێوی رەشـی بەسـەرەوە نـەبوو. کـراس و دامـەنێکی بنەوشی مێڵداری لە بەردا بوو. بالای بەرزتر دیار بـوو. باخەیـەک قـژی نەرم و کاڵی بە سەر شانیدا بەردابووەوە. ئەگـەرچی یەکـەم جـار بـوو هاتبوو بۆ ئەم ماڵە، بەڵام ئاسوودە و رەحەت بـە ژوورەکـەدا دەگـەڕاو دادەنیشت. دیمەنێکی جوان بوو. دیمـەنی کچێـک کـە کـراس و دامـەنی بنەوشـی لەبـەردا بـێ، باخەیـەک قـژی نـەرم و کاڵـی بـە سـەر شـانیدا بەردابێتەوە و، ئاسوودەو رەحەت بە ژوورەکەیدا

-ژووری ئەو- بگەڕێ و دانیشێ. دیمـەنی مێزێـک کـە چـەپکێ گوڵـی نێرگسی لە گوڵدانێکی بلووردا لە سەر بێو...

لەیلا گوتی: « کە بە ژوورەکاندا دەگەڕام بیرم لەوە دەکردەوە، بۆ نووسەرێکی وەک ئێوە ئەم ماڵ و حەسارە گەورە -نەیگوت ئەم ماڵ و حەسارە چۆڵ و کاولە باشترین شوێنە بۆ نووسین.»

ئەو بە بزەیەکی تاڵەوە سەری لەقاند. گوتی: « کارێک کە من دەیکەم.»

چارەنووسێکی سەیر بوو. ماڵ و حەسارێکی چۆڵ و کاول و... ئەو کچە چەندە دڵنیا دەیگوت باشترین شوێنە بۆ نووسین. نەشمیل گوتی: « باشترین شوێنیش بۆ شایی و زەماوەند.»

مونیرە بە کەشفەیەک چاوە لە ئاشپەزخانە هاتە دەر. قسەکانی بیستبوو. گوتی: « کارێک کە بەمزوانە دەبێ بیکەی.»

دایک و کچ پێکەنین و، ئەو هێشتا لە بیری مابوو باسی ژنهێنان و زەماوەند لە لای کچێکی غەریب و میوان جوان نیە. ڕەنگە شەرم بکا و، لە شەرما کولمەکانی سوور هەڵگەڕێن. بەلام لەیلا کولمەکانی سوور هەڵنەگەڕان. تەنها باسەکەی گۆڕی. گوتی: « وتووێژەکەتم خوێندەوە. خۆشحاڵم کتێبەکانت لێرە چاپ دەکەیتەوە.»

لەوەتی گەڕابووەوە ئەمە دووهەم وت وویژ بوو لە گەڵ ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردیەکاندا کردبووی. وتووێژێکی تێر و تەسەل کە هێشتا خۆی بە چاپکراوی نەیدیبوو.

لەیلا گوتی: « هەروەها خۆشحاڵم کارێکی تازەشت بە دەستەوەیە. چیرۆکێکی تازە...»

ئەو داچڵەکی. سەیری سەر مێزەکەی کرد. بەرلەوە میوانەکانی بێن دەستنووسەکانی کۆ کردبووەوە و، هەڵیگرتبوون. لەیلا چۆنی زانیبوو کاری تازەی بە دەستەوەیە؟ لە وتووێژەکەدا گوتبووی؟ چیتریشی گوتبوو؟

من پێکەنیم. چووم لە سەر مۆبلەکە شان بە شانی دانیشتم و گوتم: « پێم خۆشە درکاندووتە.»

چەند ڕۆژ لەمەبەر گوتبووی جارێکە لای کەس باسی فەرهاد و چیرۆکەکەی ناکات. دەترسا لە نووسینی ژێوان ببێتەوە. دەترسا پێی تەواو نەکرێ. گوتی:

« نابێ هیچم گوتبێ. نابێ درکاندبێتم.»

بە دەنگی بەرز گوتی. لەیلا سەری سوورڕماوی هەڵبڕی و گوتی:
« بەڵێ...؟ »
مونیرەو نەشمیل هیچیان نەگوت. ئەو بە خۆیدا شکایەوە. گوتی:
« بیستوومە تۆش بە تەمای شێعرەکانت چاپ و بلاو بکەیتەوە.»
لەیلا لەوبەریەوە دانیشتبوو. پیاڵەیەک چای بە دەستەوە بوو. زەردەخەنە کەویەکەی سەر لێوی پشکووت و، بۆ ساتێک بێدەنگ ما. پاشان گوتی: « هێشتا دڵنیا نیم. دوودڵم... پێموایە...»
گومان و دوودڵی لە چاوو نیگاشیدا بوو. ئەو دەیدی. لە گوتنیشیدا. لەیلا پیاڵە چاکەی دانا. دەفتەری شێعرەکانی لە کیفەکەی دەرهێنا و، بە شەرمەوە لە سەر مێزە شیشەییەکەی بەردەستی داینا. ئەوسا بە نووکی پەنجە بەرەو لای ئەو پاڵی پێوەنا.
« حەز دەکەم ئێوەش بیخوێننەوە. ئەگەر بە پێویستتان زانی...»
ئەو دەستی بردو دەفتەرەکەی هەڵگرت. دەفتەرێکی جوان بوو. بەرگەکەی بە سەلیقەی کچانە رازابووەوە. لێوەکانی لەیلا بێئەوە زەردەخەنەکەیان تاراندبێ، بە حاستەم لەرینەوە. نیگای لە جێی چۆڵی دەفتەرەکە لە سەر مێزە شیشەییەکەوە شوێن دەستیئەو کەوت. ئەو یەکەم کەس بوو دەفتەرەکەی دەکردەوە؟ یەکەم پیاو بوو؟ لەیلا گوتی:
« بەشێک لە شێعرەکان...»
نەیزانی بڵێ چی. گوتی: « بەشێک لە شێعرەکان بە لای خۆشمەوە لاوازن.»
ئەو دەفتەرەکەی کردبووەوە. یەکەم لاپەڕە و یەکەم شێعر...
دەفتەرەکەی دانابوو کە میوانەکانی رۆشتبوون. مونیرەو نەشمیل و... لەیلا قژە نەرم و کاڵەکەی لە چنگیدا کۆ کردبووەوە. لە پشت سەریەوە بەستبووی و، لە ژێر لەچکەیەکی خۆڵەمێشی گوڵداردا شاردبوویەوە. کراس و دامەنە بنەوشەکەشی لە ژێر چارشێوە رەشەکەیدا شاردبووەوە. ئەوسا گوتبووی:
« حەز دەکەم بە چاوێکی رەخنەگرانەوە بیانخوێنیتەوە.» ئاماژەی بۆ دەفتەری شێعرەکانی کردبوو. بەدەم زەردەخەنەوە و، لێوەکانی دیسان لەریبوونەوە. ئەو تا دەرەوە بە رێی کردبوون. لە حەسار، لەیلا بۆ جارێکیتر سەیری ئەملاولای کردبوو. گوتبووی: « ئێستا بیرم

دەکەوێتـەوە، مـن پێـشتر ئـەم باخچـە و حەسـارەم دیـوە. حـەوزێکی گەورەی پڕ لە ئاوی روون، ریزی گوڵە رەنگاورەنگـەکان و، ئـەم داروو درەختەش... پێموابوو ئەو دارتووە گەورەش کە هێلانـەی لەقلەقـەکانی لـە سـەرە، دەبـێ لـەم حەسـارەدا بـێ.» لـە چیرۆکێکـدا دیبـووی. خوێندبوویـەوە. ئـەو نەیپرسـیبوو کامـە چـیرۆک؟ گوتبـووی: « بـەڵام ئێستا، وەک دەیبینی چۆڵ و کاولە.» مەبەستی حەسارەکە بوو. لەیلا بە هێلانەی چۆڵـی لەقلەقـەکان تێگەیـشتبوو. گوتبـووی: « لەقلەقـەکان کـە گەڕانەوە ئاوەدانی دەکەنەوە.» لەیلا نەیگوتبوو، مونیرە گوتبووی.

من گوتم: « شێعرەکانی چۆنن؟ شێعرەکانی لەیلا.»

ئـەو هێـشتا دەفتەرەکـەی بـە دەسـتەوە بـوو. دواهـەم لاپـەڕەی خوێندەوە. کۆپلەیەک لە دواهەم شێعری.

قاموسەکان بدڕێنە و
وشە ساردوو مردووەکان دەم با بدە،
من جوانترین شێعری بوونت لە دێڕێکدا دەنووسـمەوە.
رابوردوو بسڕەوەو
رۆژە تاریکەکانی فەرامۆش کە،
هەمیشەییترین خەونت لە ساتێکدا دەهێنمە دی.

لەیلا ئەم شێعرەی تازە نووسیبوو.

## هـەشت

گوتم: « لەیلا خەونێکە مونیرەی خوشکت و نەشـمیلی خۆشـکەزات بۆیان دیوی.»

سـەری هەڵـبڕی. لـە پـشت هـەوری دووکەڵـی جگەرەکەیـەوە مـن پێدەکەنیم. رەنگە پێکەنینێکی گاڵتەجاڕیانە و... قەڵـس نـەبوو. گـوتی: « وشیار نەبی چیرۆکەکە لە گرێژنە دەردەچێ.»

گوتم: « کامە چیرۆک؟ چیرۆکی تۆ یان چیرۆکی فەرهاد؟ »

تێفکری. نەیدەزانی لە ماڵ و ژووری خۆیەتی یان لە ماڵ و ژووری فەرهاد. ساتەکانی خۆی دەژی یان ساتە فەرامۆش بووەکـانی فـەرهاد. رەنگە هیچیان...

«یان هەردووکیان.»

لەو قسەی خۆی داچڵەکی. بۆ پشت مێزەکەی چووەوە. من هێشتا لەوێ بووم. رووی لێکردم و گوتی: «دەمەوێ دواهەم تابلۆی فەرهاد ببینم. ئەوەی وا دەیویست کاڵێی تێدا بدۆزێتەوە.»

بۆ چەندەمین جار گوتم: «نەیدۆزیەوە. تابلۆکەی پێ تەواو نەکرا. جگە لە چەند هێڵی باریک و خوار و خێچ ...»

گوتی: «دەمەوێ بیبینم. هەر ئێستا.»

بینی. بیری کردەوە، حەق بە من بوو. چەند هێڵی باریک و خوار و خێچ... گوتی: «ئەم هێڵەیان گەیاندیە کوێ؟»

ئاماژەی بۆ درێژترین هێڵی تابلۆکە کرد. ئەو هێڵە کە گەیاندبوویە ژوورێکی تەنگ و تاریک... نووسی:

لە ژوورێکی تەنگ و تاریکدا هۆش خۆی دێتەوە فەرهاد. ژوورێک بە قەدەر مەباڵێک. بە بێهیچ دەلاقەو رۆچنەیەک. لادیوارێکی ژوورەکە ئاسنە. بە هەناسەی وشک و ساردیدا تێدەگات فەرهاد. دەرکەی ئاسنی کە دەکوترێت دەنگدانەوەی سەیر و ترسناکی هەیە. وەک زرنگەی ناقووسی کلێسەکان. دەیهەوێت هەستێتە سەر پێ. ناتوانێت. هەموو ئەندامەکانی لەشی دەزیرێنن. سەری... دەستی... پێی... پێیدەچێت تا بیری دەکەوێتەوە لە کوێیەو، چی بەسەر هاتووە. بیری ئۆتومبێلەکە و سێ پیاوە تەرپۆشەکەش دەکەوێتەوە. بیری ئەو شەق و مستانەش کە بە چاوی بەستراوەوە لێیان داوە. جگە لە چەند پرسیاری ئاسایی چیتریان لێ نەپرسیوە. خۆشحاڵە فەرهاد. خۆشحاڵە گرتنەکەی پەیوەندی بە رابوردوویەوە نیە. پەیوەندی نیە؟ لە خۆی دەپرسێت. ئەی بۆ گرتوویانە؟

ناو دەمی تاڵە. چڵم و خوێن کونە لووتەکانی ئاخنیوە. دەڵەمەیەکیش بە قورگیەوە نووساوە. هەناسەی بە گران دێت و دەچێت. دانێکی شکاو زمانی دەگەزێت. بڵێی بەوەندە لە کۆڵی بنەوە؟ ورو کاسە فەرهاد. وەڵامی ئەو پرسیارە و هیچ پرسیارێکیتری پێنادرێتەوە. رادەکشێتەوە.

(( له گەڵ خۆت بمبه. بمبه بۆ شوێنێک کەس نەماننناسێ و کەس نەماندۆزێتەوه...))

کەسێک ئەوەی پێ دەڵێت. نازانێت کێ.

(( به جێم مەهێڵه. من ئەم خەمەم پێ هەڵناگیرێ.))

لە هۆش خۆی چۆتەوه یان خەوی لێکەوتووه؟ ئەمجارەش زرنگەی ناقووسی کلێسەیەک چاوی پێهەڵدێنێت. لە گوێیدا و لە ژوورەکەدا دەنگ دەداتەوه.

(( هەسته و، پشت له دەرکه بکه.))

هەڵدەخزێت، بەڵام هەستانی بۆ ناکرێت. وەردەسوورێت و پشت له دەرکه دەکات. دەرکەی ئاسنی بەدەم جیڕەی سارد و وشکیەوه دەکرێتەوه. ژوورەکه روون دەبێتەوه. سێبەری پیاوێکی دانیشتووی داماو دەکەوێتە سەر دیوارەکەی بەر دەمی. سێبەری گەورەی پیاوێکیتر دایدەپۆشێت. ئەوسا دوو دەست، دوو دەستی گەورە و گۆشتن چاوی دەبەستن. هەڵیدەستێنن. ناتوانێت بە پێی خۆی بڕوات. بەرۆکی دەگرن و بە شوێنێکدا رایدەکێشن... لە سەر کورسیەک دایدەنیشێنن. چاوی هەروا بەستراوه فەرهاد. دوو، یان سێ کەسی به دەورەوەیه. به دەنگیاندا و، به تەقه تەقی پێڵاوەکانیاندا دەزانێت.

(( ناوت؟ ))

(( فەرهاد.))

(( پیشەت؟ ))

(( نەقاش.))

(( نەقاش یان خوێندکار؟ ))

له دەمی دەدەن. ناو دەمی دەکولێتەوه و، دەزوولە لیکێکی گەرم به لا لێویەوه شۆڕ دەبێتەوه.

(( نەقاش یان خوێندکاری ئاژاوەگێڕ؟ ))

دەڵێت: (( خوێندکار بووم، وازم هێناوه و، ئێستا کار دەکەم.))

(( وازت هێناوه یان هەڵاتووی؟ کار دەکەی یان رێکخراوه دادەمەزرێنی؟ ))

ئـەو پرسـیارانه دڵخۆشـیەکەی بـزڕ دەکـەن. کەواتـە زانیویانـە... هیوابڕاو دەبێت. نائومێد خۆی بـە چارەنووسـی نادیـاری دەسـپێرێت فەرهاد...

گوتم: « پیاو دەبێ گێل بێ کە پێی وابێ ئەوان دوا ماوەیەک هەموو شتێکیان لە بیر دەچێتەوە. لە یەکـەم رۆژی هەڵاتنەکـەی لـە زانکـۆ، بـە شوێنیەوە بوون و لێی گەڕابوون.»

ئـەو سـا لـە قـۆری سـەر مەنگەڵـیەکە پیاڵـەیەک چـایم بـۆ ئـەوو، پیاڵەیەکیشم بۆ خۆم تێکرد.

کەواتە لە ماڵی فەرهاد بوو. ماڵـی فـەرهاد یـان ماڵـی مـن؟ فـەرهاد چووبوو لە ناو دەرکە، لە کەوشکەنەکە دانیشتبوو. وەک منداڵـێکی کـزو نەخۆش، تەنانەت تاقەتی نـەبوو یـاری بـە کەوشـەکانیش بکـا. ئـەو بـە سەرسووڕمانەوە گوتی:

« لە زانکۆ؟ ... بۆ مەگەر فەرهاد...»

خوێندکار بوو. لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکان، لە تاران، هونـەری دەخوێند و... دوا دوو ساڵ دیسان لە تاقیکردنەوەی کونکـور بەشـداری کردەوە و، بۆ ماف وەرگیرا. زۆربەی هاوڕێکانیـشی مافیـان دەخوێنـد. جگە لە خەوگەی زانکۆ، لـە ناوشـاریش خانوویـەکی بچووکیـان بـەکرێ گرتبـوو. زۆربـەی شـەوان لـەوێ لـە دەوری یـەکتر کـۆ دەبوونـەوە. دەستەیەکی هاوبیر و را بوون و، کتێب و بڵاوکراوەی نهێنی رێکخـراوە سیاسـی و چەکداریـەکانی ئـەو دەمـەیان دەخوێنـدەوە. لـە بـەریان دەنووسیەوە و، لە زانکۆ، بـە دزیـەوە بڵاویـان دەکـردەوە. تـا ئـەوەی رۆژێک پۆلیس پێی زانین و، بۆ شەوێدا چەند کەسێکی لێگرتن. گوتم:

« ئەو شەوە کە هاوڕێکانی گیران، فەرهادیان لە گەڵنەبوو. بەیانی بـۆی چووبوونە زانکـۆ بـەڵام ئـەو زانیبـووی و، بەرلـەوە دەسـتیان بیگاتـێ، هەڵاتبوو.»

فەرهاد ماوەیەک لەوێ، لە تاران، خۆی شـاردەوە. چەنـد شـەو لـە ماڵی برادەرەکانی و، چەند شەویش لە هوتێل مایەوە. کـە پـارەی لێبـڕا ناچار گەڕایەوە بۆ ئێرە. بۆ ماڵی باوکی. زۆر زوو تێگەیی کـە لـە ماڵـی باوکیشی ئەمین نیە. زیاتر بۆ ئەوەی کەس بە ئاگری ئەوەوە نەسووتێ، لەویش رۆیی.

« بۆ کوێ؟ »

گـوتی ژیـانێکی نـوێ دەسـت پێـدەکا. ژیـانێکی نهـێنی. داوای لــە هاوڕێکانی ئێرەی کرد یارمەتی بدەن. لە کارگەیەک لـە دەرەوەی شـار کارێکیـان بـۆ دۆزیـەوە. بـەڵام لـەوێش زۆر نەمایـەوە. وەڕس بـوو. گەڕایەوە بۆ ناوشار. بۆ گەڕەکە کۆن و هەژارنـشینەکان و، تـاوی دایـە نەقاشی کردنی ماڵان. پیشەیەکی خۆش بوو، هەر ڕۆژە لە ماڵێک و...

« دەبێ لە یەکێک لەو ماڵانە عاشقی کاڵێ بووبێ.»

فـەرهاد لـە کەوشـکەنەکەوە هـاتبووە ژوور و، لـە بـەر پەنجـەرە بچووکەکەدا چوار مێلکەی دابووەوە. ژوورەکە وەک هەمیشە تاریـک و، توێ توێ دووکەڵ بە ژوور سەریەوە لەنگەری گرتبوو.

گوتم: « کاڵێ کچێکی شۆخ و شەنگ و جوان بوو. بەهرەیەکی خودا پێداوی سەیری بۆ دڵداری و شـەیدایی بـوو. نەیـدەزانی. تـا ئـەو کاتـە فەرهادی نەدیبوو، نەیزانیبوو. نـەیزانیبوو نیگایـەکی عاشـقانە دەتوانـێ ژیان و چارەنووسی بگۆڕێ. نیگایعاشقانەی فەرهاد...»

گوتی: « پاشان چی؟ »

گوتم: « پاشان؟ ساڵێکی نەخایاند فەرهاد گیراو، بەر نەبوو تـا ئـەو ڕۆژە خەڵک لە گەڵ هەموو دیلە سیاسیەکانیتر ئازادیان کرد.»

هاوینــە ڕۆژێکیگــەرم بــوو. ئــەو ڕۆژە کــە دیلــە سیاســیە ئــازاد کراوەکان، ئەو پیاوە لەڕ و لاوازو ڕەنگ پەڕیوانە بە ئاڵقە گوڵـی دەوری ملیانەوە، بە سەر شانی شـەپۆلی خەڵـکەکەوە، لـە شـەقامی زیندانـەوە بەرەو مەیدانی ئازادی دەچوون. خۆشحاڵ بەڵام سەراسیمە و حەپەساو دەستە باریک و سپیەکانیان بۆ جەماوەرەکەو، بۆ ئەو رادەوەشاند. ئەو لە ناو قەرەباڵغی جەماوەردا لە ئەفسانە دەگـەڕا. ئەفسانە؟ نەیـدەدی. ئـەی لــە کـوێ بـوو؟ شــەپۆلی جـەماوەر، لــە نیگـای وێـڵو وەیـلانی ئەویشاردبووەوە.

خەڵک لە شەوی ڕابوردووەوە، لـەو کاتـەوە کـە بیـستبوویان دیلـە سیاسیەکان بەر دەبن، دەستە دەستە لـە ماڵـەکانیان هاتبوونـە دەر. لـە بــەر دەرکــەی زینـدان و، لــە شــەقام و کۆڵانــەکانی ئــەو نــاوە کــۆ بووبوونەوە. ئەو لە گەڵ چەند برادەرێکی لە مزگەوت بوون. مزگەوتیش قەرەباڵـغ بـوو. خەڵـک تـەدارەکی پێـشوازیەکەی سـبەینێیان دەگـرت.

دەستەیەک دروشمەکانیان دەنووسیەوە. دەستەیەک تاج و ئاڵقە گوڵەکانیان دەڕازاندەوە. دەستەیەکی بە تەمەنتریش لە گەڵ مەلای مزگەوتەکە لای مینبەرەکە خەریکی نووسینی بەیاننامە بوون. کۆمەڵێ کوڕی تازە پێگەیشتووش لە دەوری دیلێک کە پێشتر ئازاد کرابوو، کۆ بووبوونەوە. ئەوان بە خۆشی و سەرسووڕمانەوە گوێیان بۆ ئازیەتی و خۆ راگری دیلەکان، ئەو پاڵەوانانە کە سبەینێ بە بینینیان شاد دەبوون، شل کردبوو. کابرا یەکە یەکە دیلەکانی دەناسی و، باسی ئازایەتیانی لە ژێر ئەشکەنجەدا دەکرد. باسی فەرهادیشی کردبوو؟ ئەو لە بیری نەمابوو. کوڕەکان بەریان بۆ خەیاڵی مێرمنداڵانەیان شل کردبوو. خۆزگە لە بری ئەو دیلانە دەبوون. گیران و ئەشکەنجە بە لایانەوە خەونێکی دووری خۆش بوو. هەواڵی کۆ بوونەوەی خەڵک لە بەر دەرکەی زیندان گەیشتە مزگەوت. گەنجەکان و، تەنانەت پیاوە بە تەمەنەکانی لای مینبەرەکەش خۆشحاڵ بوون. ئەویش خۆشحاڵ بوو. گوتی:

«حەتمەن ئەفسانەش لەوێیە.» لە بەر خۆیەوە گوتی. دەبوو لەوێ بێ. شۆڕش میهرەبان بوو. لە بەر دڵی ئەویش بووبێ، دەبوو ئەفسانەی لە ماڵ کێشابێتە دەر. بێگومان کێشابوویە دەر. ئەفسانە بەشێک لە شۆڕش بوو. کچی بوو. کچە چکۆلەی. لە زۆربەی خۆپیشاندانەکاندا ئامادە بوو. وەک خۆی کە لە هەموو خۆپیشاندان و کۆبوونەوەیەکدا ئامادە بوو. ئەویش کوڕی شۆڕش بوو. خۆزگە شۆڕش زوو سەر دەکەوت. گوتبووی: «تا رۆژی سەرکەوتنی شۆڕش دان بە جەرگمدا دەنێم و ئەفسانە نادوێنم.» بە جەلالی هاوڕێی گوتبوو. گوتبووی:

«لەو رۆژە خۆش و پیرۆزەدا ئەگەر ئەفسانە لە ناو هەزاران کەسیشدا بێ، ئەگەر لە ماڵەوە و، لە باوەشی کەس و کاریشیدا بێ، دەچم و رازی خۆشەویستیەکەمی لە لا دەدرکێنم.»

نزیکەو نیوە شەو ئەو خۆی گەیاندبووە دەورووبەری زیندان. کەس و کاری دیلەکان خۆشحاڵ و چاوەڕوان لە بەر دەرکەی زیندان دانیشتبوون. کۆ بوونەوەکە سات لە دوا سات پەرەی دەساند. گەنجەکان بە کۆڕ سروودیان دەخوێند. پۆلیس لە بڵیندگۆکانەوە تکای لێدەکردن بڵاوە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان. سەدان سەرباز لە

سـەربان و سـەر دیوارەکـانی زینـدان بـە چەکـەوە راوەسـتابوون. نوورئەفکەنە گەورەکان ئـەو ناوەیـان وەک رۆژ روونـاک کردبـووەوە. ئەفسانە لە سـووچێک لـە نـاو کچەکانـدا بـوو. وەک هەمیـشە جامانـەی کردبـوو بـە لەچکـە. ئـەوی دیبـوو؟ حەتمـەن دیبـووی. نیگاکانیـان لـە رووناکی نوورئەفکەنەکاندا کۆتری نامەبـەر بـوون. پـۆلیس دیـسان لـە بڵیندگۆکانەوە...

بەیانی دەرکەی زیندان کرایەوە و، دیلەکان یەکـە یەکـە لێـی هاتنـە دەر. جـەماوەر بووبـوون بـە دوو دەسـتە. ژنـان و کچـان لـە پـێش دیلەکانـەوە و، کـوڕان و پیـاوانیش بـە دوایانـدا. ئـەو لـە مابەینیـدوو دەستەکەدا بـوو. لـە قەرەباڵـغی دەسـتەی پێـشەوە ئەفـسانەی لـێ ون بووبوو. نەیدەدی. یان دەیدی و... چ دوور بوو ئەفسانە. نیگـای شـەیدا و سەرگەردانی ئەوی نەدەگەیشتێ. چ دوور بوون ئەو رۆژانە. سات بـە ساتی وەبیر نەدەهاتەوە. بەو حاڵەش دەبوو ئەو رۆژانـە بنووسـێتەوە. دەبوو سات بە ساتیئەو رۆژە دوورانە بژیەنێتەوە. نووسی:

خەڵـک، بـە ژن و پیـاو منـداڵ و مێرمنداڵـەوە رژاونەتـە شـەقامەکان. پیرێـژن و پیرەپیـاوە خانەنـشینەکانیش لـە پەنجـەرەو باڵـکۆنی ماڵـەکانیانەوە چەپکـە چەپکـە گـوڵ هەڵـدەڕێژن. بـە سـەر خەڵکە خرۆشاوەکەدا و بە سەر دیلـە ئـازاد کراوەکانـدا. گوڵـبارانیان دەکـەن. شـار دەمێکـەو بەخێرهاتنـەوەی رۆڵـە بەندیـەکانی دەکـات. رۆژ، رۆژی حەشـرە. حەشـری خەڵـکێکی ئیمانـدار. خۆشـحاڵ و سـەرکەوتوون خەڵـک. تەنانـەت پـۆلیس و سـەربازەکانیش بـە سـەر تانگ و نەفەربەرەکانیانەوە خۆشحاڵن.

ئەو لافـاوە کـە دیلـەکان و، بـە تایبـەت فـەرهادی لـە زینـدان، لـە ژووره تاریـک و بچووکەکـەی هێناوەتـە دەر، بـۆ هـەر شـوێنێک پێـی خـۆش بێـت دەیبـات. حەپەسـاوە فـەرهاد. هاوارەکـان، سـروودەکان، دروشـم و پێکوتانی توندی گەنجە خرۆشاوەکان دەیترسێنن. ترسـاوە فەرهاد. لەو هەموو خۆشـی و شـەیدایییە ترسـاوە. دەیهـەوێ هەڵـێت. لەو کەرنەواڵـی شـادی و، لـەو گۆوەنـدە کـە بـە بۆنـەی ئـازادی ئـەو و برادەرەکانیەوە بەرپا بووە هەڵێت. لە دەسـت ئـەو پیاوانـە کـە ناهێـڵن خێـری چوونـە ژێـر تـابووتی مردوویـان لـە کـیس بچێـت و، بـە نـۆرە

دەیخەنــە ســەر شــانیان هەڵــێت. هەڵــێت و پــەنا بــۆ تــەنهایی و بێدەنگیەکەی خۆی بباتەوە. ئەو تـەنهایی و بێدەنگیـە کـە ساڵـەهایە خووی پێگرتووە. هەڵێت و خۆی بە خەڵوەتی یەکێک لـەو کۆڵانانـە بسپێرێت. ئـەو کۆڵانـە کـە کاڵـێی تێـدا ون کـردووە. لـە خەڵـوەتی یــەکێک لــەو کۆڵانــە تەنگەبەرانەدایــە کاڵــێ. دەڵــێت: « بــەجێم مەهێڵە... من ئـەم خەمـەم پێهەڵـناگیرێ... دەرەقـەت نایـەم.» کاڵـێ دەڵێت. فەرهاد گوتوویە: « تۆ دنیایـەک خـەمت هەڵـگرتووە کاڵـێ. تەمەنێک ئازارت کێشاوە. ئازا بە کچێ، ئازا بە... دەرەقـەت دێیـی.» گوتوویەتی؟

پڕ بـە هـەموو کۆڵانەکـە هـاواری کـردووە کاڵـێ: « ئـەم خەمـەم پێهەڵناگیرێ.» ئەوسا لەپڕمەی گریانی داوە « دەرەقەت نایەم.»

ئەو قەڵەمەکەی لە سەر کاغەزەکە داناو، لە پشت مێزەکەی هەستا. هەر دوو پێی سڕ بووبوون. سەر و خوارێکی ژوورەکەی کرد و گـوتی: « فەرهاد لە کەیەوە لە ماڵ نەچووەتە دەر؟ »

مـن مانـدوو بـووم. مانـدوو، وەڕس وەڵامـم دایـەوە. ئەوسـا ئـەو بڕیاریدا رۆژێک لەم رۆژانە بێت و دەستی فەرهاد بگرێ و، لە گەڵ خۆی لە ماڵ بیباتە دەر.

## نۆ

گـوتم: « تـۆ بەڵـێنت داوە. بەڵـێنت داوە لـە نووسـینی چیرۆکەکـە بەردەوام بی و...»

نەیدەنووسی. چەند رۆژ بوو هیچـی نەنووسـیبوو. نەیاندەهێـشت. نەیاندەهێـشت بچێتـە پـشت مێزەکـەی و، کـە دەچـوو، کـە دەسـتی بـۆ قەڵەمەکەی دەبرد، لە دەرکـەیان دەدا. دەرکەکـەی دادەخـست. هـەموو دەرکـەکان و، پەنجـەرەکانیش. تەلەفوونەکەشـی دەقرتانـد. کـە ئـاوڕی دەدایـەوە دەیـدی لـە حەسـارو ماڵـەکەدان. بـاوکی، دایکـی، بـراو خوشکەکانی، هاوڕێیـانی کـۆن و تـازەی... ماوەیـەک بـوو لەیلاشـیان دەهێنا. لەیلا تلووعی. مونیرەو نەشـمیلی کچی دەیانهێناو، بە حەسـارو ژوورەکاندا دەیانگێڕا. ئەوسا ئەویش چەپکێک گوڵی نێرگسی لـە سـەر مێزەکەی دادەنا. هەموو رۆژێک چـەپکێک گوڵـی نێرگسی هێنـابوو، لـە سەر مێزەکەی دانابوو. هەموو رۆژێک چارشێوە رەشـەکەی لـە سـەر خۆی داماڵیبوو. قژە نـەرم و کاڵـەکەی بـە سـەر شـانیدا بـەردابووەوە. هەموو رۆژێک بـەدەم زەردەخەنـەوە گوتبـووی: « بـۆ کەسـێکی وەک ئێوە ئەم ماڵ و حەسارە گەورە

-نەیگوتبوو ئەم مـاڵ و حەسـارە چـۆڵ و کاولـە- باشـترین شـوێنە بـۆ نووسین.»

باشترین شوێنە ئەگەر بهێڵن و، نەیاندەهێشت. ناسری نەیدەهێشت. ناسـری کـە زەمانێـک سـوار پژۆیـەکی سـەوزی مودێـل بـاڵا دەبـوو، جاروباریش سێتاری دەژەند، ئێستا سواڵی جگەرەی دەکرد. ئەفـسانەی کلۆڵ...

گوتم: « واز لە ئەفسانە بێنە. خەریکی نووسینی چیرۆکەکەت بە.»

گوتی: «ناتوانم. چەند شەوە دیسان ئەو قیژە تیژو ترسناکە...»
نەمدەزانی ئەو قیژە تیژو ترسناکە چ پەیوەندیەکی بە ئەفسانەوە هەیە. گوتم: «درەنگە. رۆژەکان یەک لە دوا یەک دێن و دەڕۆن. دەترسم...»
قسەکەی پێبڕیم و گوتی: «دەترسی؟ لە چی دەترسی؟ »
ئەوسا بیری کردەوە، بڵێی من بۆ بترسم؟ لەچی بترسم؟ نەکا پێموابێ ئەویش وەک فەرهاد... خۆزگە دەیزانی کاتێک فەرهاد لە ژوورە تاریک و دووکەڵاویەکەی کە بۆکۆن و بۆنیزبڵی سووتاوی لێدێ، لە بەر رۆشنایی کز و لاوازی پەنجەرە بچووکەکەی دادەنیشێ و سەری بە ملیەوە شۆر دەبێتەوە، بیر لە چی دەکاتەوە؟ لە کێ؟... یەک، دووجار گوێی لە قسەکانی گرتبوو. کۆمەڵێ وشەو رستەی ناتەواوی پچڕ پچڕ... چی گوتبوو؟ باسی چی کردبوو؟ ئەو لە بیری نەماوە. شتێکی نەگوتبوو کە لە بیری بمێنێ.
گوتم: «جاری وایە قسە دەکا. لە بەر خۆی شتێک دەڵێ کە منیش تێی ناگەم، خۆشی تێی ناگات. چونکا لە پشت ئەو قسانەوە هیچ شتێکی لە بیر نەماوە. بیر لە هیچ شت و هیچ کەس ناکاتەوە.»
ئەو پێی وەرنەدەگیرا پیاوێک، ئەگەرچی تووشی فەرامۆشیش بووبێ بیر لە هیچ شتێک و هیچ کەسێک نەکاتەوە. گوتی: «دڵنیام بیر لە کەسێک دەکاتەوە... کاڵێ...»
خۆزگە دەیزانی ناسری بیر لە چی دەکاتەوە. ناسری نابێ هیچی فەرامۆش کردبێ. رەنگە بیر لە ئەفسانە بکاتەوە. لە منداڵەکانی. بڵێیئەفسانە منداڵی بووبێ؟ کچ یان کوڕ؟ رەنگە کوڕ و کچێک. هیوا و هێرۆ... هیواو هێرۆی ناسری. لە بیری نەماوە ئەو دەمانە ئەو و ئەفسانە باسی منداڵیان کردووە یان نا. ئەو دەمانە ئەو و ئەفسانە تەنها باسی خۆیان دەکرد. باسی خۆیان و ئەو رۆژانە کە تێیدا دەژیان. رۆژانی دوا سەرکەوتنی شۆڕش. ئەو رۆژانە کە شار دەبوو پشوو بدا. پشووی دوا ماندووییەکی سەدان ساڵەو، کێ بوو نەیهێشتبوو خەونی خەڵکی شار بێتە دی؟ ئەو رۆژانە هەمووی هەرا و هوریا و، شەڕ و شۆر و، بگەرەو بەردە بوو. ئەفسانە گوتبووی:«شار خەریکە خوو بەم شەڕ و شۆرە دەگرێ. وەرە با ئێمە لێرە بڕۆین. بڕۆین بۆ...» ئەو

گوتبووی: «چارەنووسی شۆڕش و، چارەنووسی گەل و...» چیتری گوتبوو؟ ئەفسانە چ وەڵامێکی دابووەوە؟ چەند ڕۆژ لەمەبەر نووسیبووی: «کاڵێ گوتی: من ئەم خەمەم پێهەڵناگیرێ. دەرەقەت نایەم.»

دەمێکە بوو دەرکەیان دەکوتا. گوتم: «هەستە. هەستە بڕۆ دەرکەکە بکەرەوە.»

تازە دەیبیست. بڵێی کێ بێ؟ بارام؟ بارام گوتبووی: «سبەینێ وەستایەک دەهێنم بانی ماڵەکە چاک بکاتەوە.» بەڵام ئەوە قسەی چەند ڕۆژ لەمەبەر بوو. وەستای هێنابوو. بانەکەشی چاک کردبووەوە. کەواتە...

جەلالی بوو. گوتی: «کوڕی باش، سەعاتێکە ئەو دەرکە کلۆڵە دەکوتم. ئیتر خەریک بوو نائومێد دەبووم.»

ئەو دیسان لە بیری چووبووەوە. سێ ڕۆژ بوو ئیدارەی میراتی فەرهەنگی لە مۆزەخانەی شار پیشانگای بۆ گەنجینەکەی زێویە کردبووەوە. گەنجینەیەک کە دوا سێهەزار ساڵ دۆزرابووەوە. لە ژێر خاک دەرکێشرابوو. لە ژێر پێی ئەو خەڵکە... سامانی نەتەوەیەک... ئەو هەموو ڕۆژێک گوتبووی دێم و، نەچووبوو. ئەمبەیانیە جەلالی تەلەفوونی بۆکردبوو. گوتبووی عەسر دێت بەشوێنیداو،هاتبوو.

گوتی: «لەوە ناچی زۆر دڵت بەمیراتی فەرهەنگی پێشوونیانت خۆشبێ.»

جەلالی بە پێکەنینەوە گوتی. ئەو قسەکەی بارامی برای بیر کەوتەوە.

«دەترسم میراتی پێشوونیانیش وەک میراتی بنەماڵەکەم...»

ترسەکەی لە خۆوە نەبوو. پێشتر لە مۆزەخانەکانی دەرەوەی وڵات بەشێکی زۆر لە شتە کۆن و عەنتیکەکانی زێویەی دیبوو. خەنجەر و تیرو کەوان... گورز و گۆپاڵ... زین و کڵاوخود و سوپەر و مەتاڵ...

جەلالی گوتی: «بێگانە هەموو چەک و سیلاحەکانیان بردووە. مۆر و لۆحە مێژووییەکانیش. تەنانەت کاسەو کەوچک و قاپ و قاچاغەکانیش... هەموویان لە ناو خۆیاندا دابەش کردووە. ئەوەی ماوە...»

ئـەوەی مـابوو لـە نـاو مەحفـەزە شیـشەییەکاندا بـوو. لـە هۆڵـی مۆزەخانەکە و... ئەو لەو خشڵ و زێڕ و زیوانە ورد بووبووەوە کـە دوا سێهەزار ساڵ هێشتا شوێن ئەنگوستی زێڕینگـەرەکانی لـە سـەر دیـار بوو. ئارەقەی ناوچاوانیـشیان نەیـسڕیبووەوە. خـاکیش وەک هەمیـشە ئەمانەتدار، میراتەکەی پاراستبوو. بـەڵام بیرەوەریـەکان... حـەزەکان و حەسـرەتەکان... تەنانـەت ناوەکـان و ناونیـشانەکان... کامیـەک لـە پێـشوونیانی سـێهەزار سـاڵ لەمەبـەر ئـەو تۆقـە زێـڕە گـەورە و پـڕ وردەکاریـەی دروسـت کردبـوو؟ بـۆ گـەردنی کێ؟کامـە نـازدار و خۆشەویست؟ ئەو بازنە توولـە ماریـە قـۆلی کێـی رازانـدبووەوە؟ ئـەو گوارە گوڵ نێلوپەڕیە بە گوێی کێدا شۆڕ بووبووەوە؟...

جەلالی پارچە عاجێکی شکاوی بچـووک، بـە قـەدەر بـەرە دەسـتی منداڵێکی سـاوای نیـشان داو، گـوتی: « بڕوانـە ئـەم هـەموو کـەژاوە و عارەبانەو، شاو وەزیـر و سـوار و پیـادە، لـە سـەر ئـەم پارچـە عاجـە بچووکە هەڵکەندراوە. هونەرمەنـدێکی لای خۆمـان نەخـشێکی دیـواری گەورەی لێ ساز کردووە. حەتمەن دیوتە. ئیتر پێویست ناکـا قورئانێـک بە دەستەوە بگرین و، بڵێین بەم قورئانە لە سـێهەزار سـاڵ لەمەبـەرەوە ئێمە لێـرە ژیـاوین. خـاوەنی لەشـکر و سـوپا و شـاو شـاژنی خۆمـان بووین.»

تۆقەکە ئێستاش لە پشت شیشەی ئەستووری مەحفەزەکەوە بـۆنی نـــامرادی لێـــدەهات. توولـــە مارەکـــەش دەیفیـــشکاند و، گوڵـــە نێلووپەڕیەکانیش حەسرەتی چرپەیەکی عاشقانەیان سێهەزار سـاڵ لـەو ژێر خاکە هەڵگرتبوو.

ئـەو گـوتی: « مێـژووی ئـەم وڵاتـە، مێـژووی عاشـقە بـە مـراد نەگەیشتووەکانە.»

جەلالی گوتی: « دوا دۆزینـەوەی ئـەم سـامانەش هێـشتا بـڕوا بـە مێژوومان ناکەن.»

ترپـەی دڵـی هونەرمەنـدە زێڕینگەرەکـە، ئـەو پیـاوە عاشـقە کـە سێهەزار ساڵ لەمەبەر ژیابوو دەبیسترا. ئەو دەیبیست و، رەنگە کچێکی چارشێو بەسەریش کە لە دەرکەی مۆزەخانەکە دەهاتە ژوور. لەیلا؟

گوتم: « لەیلا بۆ بینینی تۆ هـاتووە. بڕوانـە چەنـدە خۆشحاڵـە کـە دەتبینێ.»

ئەو سەری هەڵبڕی و، لەیلای دی. دەتگوت لە ڕێگەیـەکی دوورەوە هاتووە. هەنگاوەکانی ماندوو بوون. ماندوو بەڵام قـورس و قـایم. ئـەو خۆشحاڵ نەبوو. حەپەسا. سەیری هاتـێ. نـەیگوت بـە چیـدا دیـارە بـۆ بینینی من هاتبێ؟ نەیگوت چۆنی زانیوە من لێرەم؟ هیچی نەگوت.

لەیلا بەرەوپیری هات. گورج و بە پەلە. چاوەکانی دەبریـسکانەوە. زەردەخەنەکەی سەر لێویشی بەشـێک لـە ڕوومـەتی بـوو. بەشـێک لـە ڕوومەتە سپی و سوورەکەی و، بە دەگمەن نەدەبیندرا. کە تـەواو لێیـان نزیک بووەوە، گوتی:

« ڕێکەوتێکی سەیرە، پێموانەبوو ئێوەش لێرە بن.»

نزیـــک و ســـەمیمانە گـــوتی. وەک ناســـیاوێکی کـــۆن. ئـــەویش بەخێرهاتنی لێکرد. ڕووی لە جەلالی کرد و گوتی: « حەز دەکەم یـەکتر بناسن. لەیلاخانمی تلووعی...»

یەکتریان دەناسی. ڕەنگە لە دەمێکەوە. جـەلالیش خۆشـحاڵ بـوو. گوتی:

« سێ ڕۆژە ئەم پیشانگایەمان کردووەتەوە و، لەیلا هەر سـێ ڕۆژەکـە هاتووە.»

بــە زەردەخەنەیــەکی ئەمەکدارانــەوە گــوتی و سوپاســی لێکــرد. سوپاس بۆ ئەوەی کە هەموو ڕۆژێک هاتبوو، سەیری سامان و مـیراتی پێشوونیانی خۆی کردبوو. لەیلا چارشیێوەکەی گورج کردەوە و، چاوی بە هۆڵەکەدا گێڕا. هۆڵەکە چۆڵ بوو. خەرمانێک ڕوونـاکی ڕەنگنامـە لـە هــەزاران چــاوەی بچــووکی عەرووســیە گەورەکــەوە دەهاتــە ژوور. مۆسیقایەکی نەرم و کز بلاو دەبووەوە. دەنگی پیانۆ... دەتگوت باریکـە ئاوێکە لە شیوەڵـێکەوە دەگـوزەرێ و گـۆرانی دەخوێنـێ. گـۆرانی بـۆ هۆڵێکی چۆڵ. لەیلا نیگای بۆ مەحفەزە شیشەییەکان گوێزایەوە. گوتی:

« بە دڵنیاییەوە تا ئەم پیشانگایە ببێ، هەموو ڕۆژێـک دێم. مـن هــەرگیز ئەوەندە شتی جوانم نەدیوە. شتی جوانی سێهەزار ساڵە...»

لە دەوامەی قسەکەی جەلالیدا گوتی و، ئەوسا ڕووی لە ئەو کرد.

« من پێشتر پێموانەبووە داهێنانی خەڵکی سێهەزار ساڵ لەمەبەر ئەوەندە جوان بێ.»

ئەویش زەردەخەنەی کرد. گوتی: « مرۆف لە سەرەتای پەیدا بوونیەوە حەزی لە داهێنانی شتیجوان کردووە.»

لەیلا گوتی: « بۆچی؟ »

بە شەرمەوە گوتی. گوتی: « ببوورن ئەم پرسیارە کەمێک گێلانەیە، بەڵام بەڕاست بۆچی؟ »

ئەو دەست بەجێ وەڵامی نەدایەوە. کورتەیەک راما، ئەوسا گوتی: « رەنگە بۆ ئەوەی دنیای دەورووبەری خۆی پێ برازێنێتەوە. رازاندنەوە هەمیشە بەشێک لە تەقەلای مرۆف بووە. رازاندنەوەی خۆی و دنیای دەورووبەری.»

خزمەتکاری مۆزەخانەکە لێیان نزیک بووەوە. کاری بە جەلالی بوو. شتێکی بە گوێیدا چرپاند. ئەوانیش بیستیان « چا ئامادەیە. بۆتان بێنم بۆ ئێرە یان...»

جەلالی گوتی: « نا، دەڕۆینە سەر.»

لەیلا گوتی: « وەک ئێستا.»

ژن و پیاوێک لە دەرکەی هۆڵەکەوە هاتنە ژوور. ژن و پیاوێکی گەنج. بە ناو مەحفەزە شیشەییەکاندا گەڕان و، نزیک لە ئەوان لای تۆقە زێڕەکەو بازنە و گوارەکان راوەستان. ژنەکە سەرەتا بە حەز و، پاشان بە حەسرەتەوە لە خشڵەکان ورد بووەوە. جوانی خشڵەکان لە چاویدا بریسکانەوە. لە چاوی پیاوەکەشدا. پیاوەکە بە شەرمەوە لە ژنەکەی روانی. خۆزگە دەیزانی ئەو ژن و پیاوە لەو کاتەدا بیر لە چی دەکەنەوە...

گوتم: « ژنەکە نازانم. بەڵام پیاوەکە بیر لەوە دەکاتەوە کە بۆ نەیتوانیوە ژنەکەی بەختەوەر بکا.»

ناسری بۆ نەیتوانیبوو ئەفسانە بەختەوەر بکات؟ ئەفسانە گوتبووی: «ماڵەوە زۆریان هێناوە، دەڵێن دەبێ شوو بە ناسری بکەم. ئەو پیاوە کە سوار پژۆیەکی...» گوتبووی: « دەڵێن لە رۆژی وەک ئیمڕۆدا تەنها ناسری دەتوانێ بەختەوەرت بکا. ئەو کوڕی سیاسەت و گەل و نیشتمان و شتیوا نیە...» بە پێکەنینەوە گوتبووی. بە خەمەوە. « دەڵێن ئەو

پیاوێکی ساماندارە و، قەرارە لە تۆقی سەرمەوە تا بەری پێم لە زێڕ بگرێ.» بە پێکەنینەوە گوتبووی. بە پێکەنینەوە؟ رەنگە بە حەسرەتەوە...

جەلالی گوتی: « بڕۆینە سەر چایەکەمان بخۆینەوە.»

کە بەرەو پلیکانەکان دەچوون خەڵک تاک و تەرا دەهاتنە ژوور. کوڕێکی تەنهای رەشتاڵەش دەهاتە ژوور. سەرنجی ئەوی راکێشا. کوڕە خۆی لە نیگای شاردەوە. ئەو کوڕە رەشتاڵەی پێشتر لە کوێ دیبوو؟... بە پلیکانەکاندا هەڵگەڕان. بۆ ژووری مودیری مۆزەخانەکە. جەلالی لە پشت مێزەکەی دانیشت. ئەو لەمبەر مێزەکەوە لە پەیکەری بچووکی ژنێک بە سەر چوارپایەیەکەوە راما. چوارپایەکە لە قوڕنەی لای خوارووی ژوورەکە بوو. ژنە سەری قوڕینەی خستبووە نێو کاسەی قوڕینەی هەردوو بەرە دەستیەوە، چاوە قوڕینەکانی لە زەوی بڕیبوو. لەیلاش بەرامبەر بە ئەو دانیشت و، لە پەیکەرەکە ورد بووەوە. چەندە لە یەکتر دوور بوون لەیلا و ئەو ژنە قوڕینە کە سەریخستبووە ناو کاسەی بەرە دەستەکانیەوە؟ ئەو لە خۆی پرسی و، چەند جار نێوانی ئەو دوانەی بە نیگا پێوا. لە گڵەوە بۆ گۆشت و خوێن. لە گۆشت و خوێنەوە بۆ گڵ. لە ئەفسانەوە بۆ لەیلا. لە لەیلاوە بۆ ئەفسانە. چەندە لە یەکتر دوور بوون لەیلا و ئەفسانە؟ ئەو رۆژە کە بۆ دواجار ئەفسانەی دیبوو. رەنگە دوا رۆشتنی ئەو، ئەفسانە سەری خستبێتە کاسەی بەرە دەستەکانیەوە و، چاوی لە زەوی بڕیبێ.

خزمەتکارەکە چای بۆ هێنا بوون. جەلالی گوتی: « وا دیارە ئەو پەیکەرە سەرنجی راکێشاوی.»

بە دەم خواردنەوەی چایەکەوە گوتی: « پەیکەرێکی جوانە. کاری هونەرمەندێکی...»

جوان؟ کەواتە ئەو پەیکەرەش بۆ رازاندنەوەی شوێنێک ساز کرابوو. رازاندنەوەی دنیای دەورووبەری هونەرمەندە پەیکەر سازەکە. کاتێک دنیا بە

بەرهەمی حەسرەت و مەراقی مرۆڤەکان برازێتەوە...

جەلالی گوتی: « پێشتریش گوتوومە ئەم شارە پڕە لە هونەرمەندی گەنج و خاوەن بەهرە.»

ئەوسا باسی لەیلای کرد. باسی شێعرەکانی لەیلا. ئەو کچە دەمێکە بوو چاوەڕوانی ئەم ساتە بوو. وەخـۆی هاتــەوە. لـە جـەلالی روانی و، لێوەکانی وەلەرزین کەوتن. ئەو لە ئان و ساتدا بیری کردەوە، نەکا ئـەم کچە بۆ بیستنی قسەی ئەو دەربـارەی دەفتــەری شـێعرەکانی هاتبـێ؟! سێ رۆژی بەردەوام هاتبوو. بەو هیوایە کە ئەو لێرە بـێ و... حەتمــەن زۆر خەمی خواردووە کە ئەوی لێرە نەدیوە. ئەو بـە خۆیـدا شـکایەوە. دەبوو زووتر لە ئێستا، لانیکـەم کاتێـک لـەیلا بـە پەلـە خـۆی بـە هۆڵـی مۆزەخانەکەدا کردبوو، باسی شێعرەکانی بکردایە. بۆ گوێی نەدابوویە؟ بۆ پەی بە چاوەڕوانیەکەی نەبردبوو؟ چاوەڕوانیەک کـە لـە چاوەکانیـدا بــوو. لــە نیگــای پــڕ لــە پرســیاریدا. گــوتی: «حەفتەیەکــە لــە گــەڵ شێعرەکانی...»

نەیگوت لەیلا. گوتی: «حەفتەیەکە لە شێعرەکانی خـانمی تلووعیـدا دەژیم»

خانمی تلووعی؟ ناوبردنێکی سارد بـوو. گـوتی: «لـەم حەفتەیـەدا چەند جار دەفتەری شێعرەکانیم خوێندووەتەوە.»

ئەوسا نیگای بۆ لەیلا گوێزایەوە. لەیلا خۆشحاڵ بوو. خۆشحاڵ بۆ ئەوەی کە ئەو شێعرەکانی خوێندبووەوە و، چاوەڕوانی بیـستنی بـاقی قسەکانی بـوو. جـەلالیش چـاوەڕوان بـوو. ئـەو تێگـەیی، بۆیـە باسـی شێعرەکانی کرد. سەرەتا باسی زمـان و فـۆڕمی شـێعرەکان و، پاشـان ئاوڕی لە بابەت و تێمی شـێعرەکان دایـەوە. تـووڕەو دەمـارگرژ دیـار بوو. رەنگە بۆ ئەوە کە چەند رۆژ ئەو کچەی چـاوەڕوان هێـشتبووەوە، یان بۆ ئەوە کە دەیزانی لەیلا پێی خۆشە زۆر شت دەربارەیشێعرەکانی ببیستێ. بە تایبەت دەربارەی بابەت و تێمیشێعرەکان و، هەڵوێـستی لـە بەرامبەر چەمکەکاندا. چەمکی وەک خۆشەویستی و تاوان و... گوتی: «تێمی سەرەکی زۆربەی شێعرەکان عەشق و خۆشەویستیە...»

گوتی: «یەکەم شێعرەکان دەربڕینی سۆزێکی کچانەو تا رادەیـەک منداڵانەیە بە نیسبەت باوکی کۆچکردوویەوە. باوکێک کەشـاعیر دان بـە مردنیـدا ناهێنــێ. باوکێـک کەلــە زەیـن و دەروونی شــاعیردا دەژی و، شاعیر وەک بەشێک لە بوونی خۆی دەیگێڕێ.»

ئەو دەستە قورس و گەرمە بۆ هەمیشە لە سەر شانم دەبێ
و
سۆزی ئەو چاوە خەمبارانە لە گەڵ خۆم دەگێڕم.
لە گەڵ خۆم دەتبەم
بۆ هەموو شوێنێک
تەنانەت بۆ شوێنێکیش کە نابێ تۆی لێ بی.

ئەو لە کاتی گوتنی شێعرەکەدا سەیری لەیلای دەکرد و، ئەو دلۆپە فرمێسکانەی دەدی کە کاتی گوتنی ئەم شێعرە لە چاویدا پەنگی خواردووەتەوە. ئێستا ئیتر ئەو دلۆپە فرمێسکانە لە چاویدا نەبوو. ئەو خۆی لە ئاوێنەی بیلبیلەکانیدا دەدی. گوتی: «لەم نموونە شێعرانەدا شتێکی شاز و نوێ نیە. هەموو کەس باوکی خۆی خۆش دەوێ و، هەموو کەس، تەنانەت ئەوانەی کە شاعیریش نین بە وەها زمانێک باسی ئەو خۆشەویستە دەکەن. بەڵام لەیلا...»

ئەو خۆشحاڵ بوو کە گوتی لەیلا. گوتی: «بەڵام لەیلا وردە وردە ئەم قۆناغە تێدەپەڕێنێ و، هەڵوێستی لە بەرامبەر چەمکە گشتیەکان و تێمی سەرەکی شێعرەکانی دەگۆڕێ. لەمەدوا ئیتر بە زمانی هەموو کەس و بە شێوەی هەموو کەس لە عەشق و خۆشەویستی نادوێ. لەمەدوا واز لەو ڕێگە گشتیە دێنێ کە هەموو خەڵک پیایدا دەڕۆن و، تێدەکۆشێ ڕێگەی خۆی لە ڕێگەی خەڵکیتر و، زمانی خۆی لە زمانی خەڵکیتر و، تەنانەت بۆچوونی خۆی لە بۆچوونی خەڵکیتر جیا بکاتەوە. ئەم هەوڵە بۆ کچە شاعیرێک لە کۆمەڵگەیەکی سوننەتی وەک کۆمەڵگەی ئێمەدا کە هەموو شتێک، تەنانەت خۆشەویستیش پێناسە و مانای داسەپاوو وەرگیراو، گشتی و نەگۆڕی هەیە، هەوڵێکی ئازایانەیە. لەمەدوا مامڵەی شاعیر لە گەڵ هەموو شتێکدا و، لە گەڵ تێمی سەرەکی شێعرەکانیدا مامڵەیەکی تایبەت و شەخسیترە کە بە پێی ساتەکان و دۆخە دەروونیە جیاوازەکان، لە گۆڕاندایە. بۆ نموونە لە شێعرێکیدا دەڵێ:

بۆ هەمیشە خۆشم دەوێی
تۆ شایستەی ئەوەی ئەم خەڵاتە پیرۆزەت پێشکەش کەم.

بەڵام لە شێعرێکیتردا

داوێکت بۆ دەنێمەوە لە خۆشەویستی و
نەفرەتی هەموو خواکانت بە سەردا دەبارێنم.

ئەو شێعرەکانی وەک خۆیان لە بیر نەمابوو. بە هیوا بوو لەیلا یارمەتی بدا، بەلام لەیلا سەری داخستبوو، هیچی نەدەگوت. ئەو گوتی: «ئیتر ناکرێ بە راشکاوی بلێین شاعیر ئەم شێعرانەی تەنها بۆ باوکی گوتووە. گریمان بۆ باوکیشی گوتبێ، ئەم باوکە هەمان باوکی شێعرەکانی پێشووی نیە. پیاوێکی نموونەیی پیرۆز لە زەین و دەروونی شاعیردا. بەلکو خۆشەویستێکە کە لە دەرەوەی زەین و دەروونی شاعیریش بوونی هەیە...»

ئەوسا گوتی: «ئەگەر لەم روانگەوە درێژە بە خوێندنەوەی شێعرەکان بدەین، بۆمان دەردەکەوێ شاعیر وردە وردە ئەو پیاوە نموونەییە پیرۆزە، ئەو خۆشەویستە، لە زەین و دەروونی خۆی دەهێنێتە دەرو، لە بەرامبەر خۆی دایدەنێ. بەڕای من دوو تایبەتمەندی سەرەکیئەم پرۆسەیە بریتین لە، یەکەم، شاعیر بە دابڕان لەو پیاوە زەینیە لە خۆی نزیک دەبێتەوە. لە ناسینی خۆی. لە سەربەخۆیی خۆی وەک مرۆڤ و ئافرەت نزیک دەبێتەوە. دووهەم، لە گەڵ ئەو پیاوە خۆشەویستە دەکەوێتە وتووێژ و دیالۆگ. ئەمە سەرەتای ئازادی شاعیرە. شاعیر بۆ ئەوەی بتوانێ بژی و، بنووسێ و، تەجرەبەی شێعریتایبەت بە خۆی ببێ، پێویستی بەم ئازادی و سەربەخۆییە هەیە. تەنانەت ئەگەر لەم ئازادی و سەربەخۆییەدا، لەم رووبەروو بوونەوە لە گەڵ بەرامبەرەکەیدا، جۆرێک دەمارگرژی و هەڵچوونیش ببێ. بە رای من ئەمە تا رادەیەک سروشتیە. هەڵچوونێکی ئافرەتانە لە سەرەتای ئازادی و سەربەخۆییدا. بۆ نموونە:

مار نەبوو کە فریوی دایت
سێوە لاسوورە و ئیشتیای گەنم و
داری تێگەیشتن هەمووی بەهانە بوون.
مار نەبوو کە فریوی دایت
من بووم
من بووم ویستم تۆ دابەزیت
من بووم ویستم تاوان بکەیت

تاوان بکەیت و تۆبە بکەیت
تاوان، تۆبە
تاوان، تۆبە
حەوا تۆبە لە تاوانەکەی خۆی ناکات.

ئێستا ئیتر دڵنیا بوو ئـەم شـێعرە زۆر لـەوە جـوانتر بـوو کـە ئـەو گوتبوویـەوە. هێـشتا لـە لـەیلای دەڕوانی. هێـشتا بـە هیـوا بـوو لـەیلا یارمـەتی بـدا و، هەڵـەکانی بـۆ راسـت بکاتـەوە. هێـشتا لـەیلا سـەری داخـستبوو، هیچـی نـەدەگوت. ئـەو هەسـتی بـە شـەرمێکی غـەریب لـە روومەتیدا دەکرد. پێشتریش هەسـتی پێکردبـوو. لـە ماڵـی خـۆی، ئـەو رۆژە کـــە دەفتەریـــشێعرەکانی لـــێ وەرگرتبـــوو. لێوەکـــانی لـــەیلا لەریبوونەوە. ئێستاش لێوەکانی دەلەرینەوە. لە کچێک دەچـوو لـە بـەر چاوی بێگانەدا رووتیان کردبێتەوە. یان بـە تـەما بـن رووتی بکەنـەوە. ئەو تێنەدەگـەیی. یـان تێدەگـەیی و پێـی وابـوو یـادەوەری سـاتەکانی رابوردووی، ئەو ساتانە کە ئەم شێعرانەیان تێدا نووسـرابوو، یـان ئـەو رووداوانە کە بووبوونە هۆی نووسینی ئەم شێعرانە، پاڵیان بە تـەوژمی خوێنی پشت پێستە سپی و سوورەکەی روومەتیەوە دەنا. ئەو درێژەی بە قسەکانی دا. زیاتر بۆ ئەوەی هەموو شتێکی دەربارەی شـێعرەکانی گوتبێ. یان پاکانەی بۆ کەمتـەر خەمیەکـەی کردبـێ. یـان رەنگـە خـۆی چێژی لە گوتنەکەی دەبرد. لە گوتنی خۆی. جەلالیش قسەکانی پێخـۆش بوو. ئەو گوتی: «بە داخــەوە مـن شـێعرەکانم لـە بـەر نیـە و، لـەیلاش یارمەتیم نادا.»

لەیلا سەری بەرز کردەوە. ئـان و سـات شـەرمەکەی رەویـەوە و، زەردەخەنە بۆ لێوەکانی گەڕایەوە. ئەوسا نیگایان لە یەکتر هەڵەنگووت. بۆ ساتێک و، ئـەو لـەو سـاتە کورتـەدا شـتێکی سـەیری دی. لـە نیگـای لەیلادا. دڵی داخورپا. گوتی:

قامووسەکان بدڕێنە و
وشە ساردو مردووەکان دەم با بدە
من جوانترین شێعری بوونت لە دێڕێکدا دەنووسـمەوە.
رابوردوو بسڕەوە و
رۆژە تاریکەکان فەرامۆش کە

هەمیشەییترین خەونت لە ساتێکدا دەهێنمە دی.
ئەو گوتی یان لەیلا؟ جەلالی کە تا ئێستا گوێگر بوو گوتی: «من پێشتر هیچکام لەم شێعرانەم نەبیستبوو. ئەوەی بیستبووم کۆمەڵێ شێعری جوانی بەسۆز بوون کە...»
نەیگوت کە بۆ باوکی نووسیبوو. گوتی: «ئەڵبەت ئەم شێعرانەش جوانن. بەڵام ئەم شێعرەی ئاخر داخوازیەکی ترسناکە. دڕاندنی قامووسەکان و سڕینەوەی رابوردوو... ئەگەر ئێمە بە قسەی شاعیرەکانمان بکەین چیمان بۆ دەمێنێتەوە؟ »
بە پێکەنینەوە گوتی. رەنگە لەو کاتەدا لە بیری گەنجینەکەی زێویە و، میراتی پێشوونیانیدا بووبێ کە لە نهۆمی خواروو، لە هۆڵی مۆزەخانەکە، لە ناو مەحفەزە شیشەییەکاندا بوون. رەنگە خۆشحاڵ بووبێ کە لەیلا دەسەڵاتی لە نێو بردنیانی نەبوو. گوتی: «مرۆف بەبێ زمان و بەبێ رابوردوو چی هەیە؟ »
لەیلا گوتی: «شێعرێکی کورت و ساتێکی هەتا هەتایی...»
ئەویش پێکەنی. دەرکەی ژوورەکە کرابووەوە و، خزمەتکارەکە هاتبووە ژوور. کەسێک لە دەرەوە جەلالی خواستبوو. گوتی: «ئەوە هاتم و...» رۆشتە دەر. ماوەیەک لەوە دوا خزمەتکارەکە دیسان بە کەشەفەیەک و دوو پیاڵە چاوە هاتە ژوور. ئەو گوتی: «جەلالی چی لێهات؟ »
خزمەتکارەکە گوتی: «نیو سەعات دەبێ رۆشتووەتە دەر. برادەرێکی هاتبوو بە شوێنیدا و، ناچار بوو لە گەڵی بڕوا.»
ئەوسا بە سەرسووڕمانەوە گوتی: «مەگەر خواحافیزی نەکرد؟ »
«خواحافیزی کرد؟ »
لەیلا گوتی: «ببوورە. وادیارە زۆر ماتڵم کردووی.»
ئەو تێنەگەیی. ئایا مەبەستی لەیلا ئەوە بوو کە جەلالی خواحافیزی کردووە، یان نا؟ لەیلا سەیری سەعاتەکەی دەستی کرد. درەنگ بوو. هەستا و چارشێوەکەی گورج کردەوە. ئەویش هەستا. ئەوسا لە ژوورەکە هاتنە دەرو، بە پلیکانەکاندا داگەڕان. هۆڵی مۆزەخانەکە قەرەباڵغ بوو. ژن و پیاوەکە هێشتا لە سەیرکردنی تۆقی زێڕ و، بازنەی

تووله ماری و، گواره گوڵه نیلووپـەڕەکان نەبووبوونـەوە. ئـەوان بـەبێ هیچ نیگا و سەرنجێک لە هۆڵەکە ڕۆشتنە دەر.

## دە

ئیمڕۆ ئەو ڕۆژەیە کە گوتبووی دەستی فەرهاد دەگـرێ و، لـە مـاڵ دەیباتە دەر. بۆ کوێ؟ بـۆ ناوشـار. بـۆ کـۆڵان و شـەقامەکان و... ئـەو دنیایە کە فەرامۆشی کردبوو. فەرهاد لـە کەیـەوە لـەو ژووره تاریـک و دووکەڵاویە، کە بۆکۆن و بۆنی زبـڵی سـووتاوی لێـدەهات نـەچووبووە دەر؟ من گوتبووم: «لە ساڵانێک لەمەو بەرەوە.»
گوتم: «بردنە دەرەوەی فەرهاد، گەڕاندنی تەرمێکە بـە ناوشـاردا. نابێ بە هیوا بی هیچی وەبیر بێتەوە، یان هیچ وەبیر کەس بێنێتەوە.»
گوتی: «ئەی بۆ دەتەوێ چیرۆکەکەی بنووسم؟ »
بە خەمەوە گوتی. ئەوسا سەیری فەرهادی کرد. پێدەچوو زانیبێتی دەیبەنە دەر. چاوە چاوی بوو.
گوتم: «چۆنی دەبەی؟ بە ئۆتومبێل؟ »
گوتی: «دەترسم قەرەباڵـغی شـەقامەکان و، هـات و چـوو، هـەراو هوریای خەڵک و ئۆتومبێلەکان ماندووی بکەن. بیتۆقێنن.»

دەمزانی دەیبا بۆ کوێ. بە ئیشارەت تێی گەیاندم ئامادەی بکەم. تێدا مابووم چی بۆ لە بەر بکەم. ژوورەکەم پشکنی. سەری سندووق و مجریە کۆنەکانم هەڵدایەوە و، پاڵتۆ کۆنەکەیم دۆزیەوە و، بۆم لە بەر کرد. ملپێچ و کڵاوە کۆنەکەشی...

ئەو هێشتا سەیری دەکرد. بزەیەکی تاڵ نیشتبووە سەر لێوی. گوتی:

« کاتێ خەڵک بەم شێوە و، بەم جل و بەرگەوە بیبینن...»

نەیگوت کاتێک خەڵک بەم شێوە و، بەم جل و بەرگەوە بیبینن چیان بیر دەکەوێتەوە؟ فەرهاد ئێستا ئامادە بوو. ئەو پێش خۆی خست و لە ژوورەکە ڕۆشتنە دەر. منیش ناچار شوێنیان کەوتم. دەرەوە سارد بوو. کزەبایەک هەڵیکردبوو. پەڵە هەورە خۆڵەمێشیەکان لە باوەشی ئاسماندا تێک چرژا بوون. خۆمان بە کۆڵانێکدا کرد. نووسی:

کۆڵانەکان باریک و تەنگەبەرن.ماڵەکان بچووک و گوێسپانە داتەپیو. دیوارەکان کاگڵ و پەنجەرەکان شینن. گوڵدانەکانی ئەمدیو و ئەو دیوی پەنجەرەکان و، گوێ باڵکۆن و هەیوانەکان تەنەکە پووتی گەورە و بچووکی سەرهەڵبڕاون. پڕ لە شەمدانی و ڕێحانە و... بەرامەی نانی تازەی نانەواخانەی سەر سووچی چوار ڕێیانەکە بە هەموو گەڕەکدا بڵاو بووەتەوە...

ئەو لە چەقی چوار ڕێیانەکە ڕاوەستا. گوتی: « ئێستا دەبێ بە کامە کۆڵاندا بڕۆین؟ »

دوو دڵ بوو. ئاوڕی دایەوە، بەڵکو من پێی بڵێم. بەڵام من بە دوایەوە نەبووم. من بە شوێن فەرهاددا خۆم بە یەکێک لەو کۆڵانە تەنگە بەرانەدا کردبوو. پێی هەڵگرت، بەڵکو پێمان بگاتەوە.

« ئەم کۆڵانە تەنگەبەرانە زۆر لە یەکتر دەچن. وریا بن ڕێگەمان لێتێکنەچێ.»

« کامە ڕێگە؟ »

خۆی گوتی و خۆی پرسی. بەڵام وەڵامی خۆی پێ نەدرایەوە.»

فەرهاد زیندوو بووبووەوە. گەنج بووبووەوە و، وەک ساڵانێک لەمەبەر دەستی ئاخنیبووە ناو گیرفانی پاڵتۆ کۆنەکەی و، گورج و بە پەلە، بە پێچاو پلووچی کۆڵانەکەدا تێدەپەڕی. کزەی سەرما ڕوومەت و

بناگوێی دەگەست. ئەو بە من گەیشتەوە. گوتی: «پیاو لەم کۆلانانەدا ون دەبێ. دەیەوێ تا کوێ بە شوێن خۆیدا رامانکێشێ؟»

گوتم: «زۆرمان نەماوە بیگەیەنێ. لە کۆتایی ئەم کۆلانە داخراوەدایە. دەرکەکەیەکی چێوی کۆن...»

گوتم: «ئەڵبەت ئەگەر دوا ئەم هەموو ساڵە هێشتا بە سەر پێوە مابێ.»

کامە دەرکە؟ دەرکەی کامە ماڵ؟ دەرفەتی پرسیار نەبوو. ژنێکی نێوان ساڵ لە دەرکەی یەکێک لە ماڵەکانەوە هاتە دەر. فەرهادی دی و، راوەستا. ژنە بزەیەکی سوپاسگوزارانە، وەک پەروانەیەکی جوان و سووکەڵەی بەسەر لێوەوە بوو. شتێکی لە فەرهاد پرسی. فەرهاد بە شەرم و شکۆیەکی پیاوانەوە وەڵامی دایەوە. بەولاوەتر پیرەپیاوێکی رەقەڵە لە سەر خواجەنشینی بەر دەروازەی ماڵێکیتر دانیشتبوو. لە پشتێن بەرەوژوور بە سەر تەنەکە پووتێکی پڕ لە ئاگردا نەویبووەوە. لە بەری هەڵنەستا. پێدەچوو نەیدیبێ.

«گەیشتین.»

لە کۆتایی کۆلانەکە، لە بەر دەرکەی چێوی ماڵێک رادەوەستێت فەرهاد. دەرکە پێوەدراوە بەڵام دانەخراوە. دەزانێت فەرهاد. بەر لەوە دەستی بۆ ببات بە حاستەم، وەها کە تاوانێک لە خەڵوەتی کۆلانەکە وەشێرێت ئاوڕ دەداتەوە. بە سیلەی چاو لە پەنجەرەی ماڵەکەی ئەو بەر دەڕوانێت. پەنجەرەیەکی بچووک و شین. لە پشت شیشەی پەنجەرەکەوە گوڵدانێکی سواڵەت دەبینێت. گوڵدانێک و گوڵە هەنارێک. وردتر دەبێتەوە. هەنارێکی سووری بچووک، گەورەتر لە بەلالووکێک بە شیشەی پەنجەرەکەوە نەنووساوە.

«نەکا وەریبێت؟»

دڵی دادەخورپێت فەرهاد. دەست بۆ تەقولبابی دەرکەکە دەبات و، یەک، دوو، سێجار نزم دەیکوتێت. ئەوەندە نزم کە تەنها کەسێک لە پشت پەنجەرەی بچووکی ماڵەکەی ئەو بەر بیبیستێت...

گوتم: «ئێستا دەستێکی سپی و ناسک لەو دیو پەنجەرە بچووکەکەوە پەردە لادەدا و پەرداخێک ئاو دەکاتە بنکی گوڵە هەنارەکە.

**ئەوسا فەرهاد خۆشحاڵ و دڵنیا دەرکە چێویەکە دەکاتەوە و، دەڕواتە ژوور.»**

**ئەو پێی خۆش بوو. گوتی: « وێنەیەکی جوان و عاشقانەیە.» نووسی:**

دیسان سەیری پەنجەرەی ماڵەکەی ئەو بەر دەکاتەوە. هیچ دەستێکی سپی و ناسک پەردەی دادراوەی پەنجەرەکە لانادات و، پەرداخێک ئاو ناکاتە بن گوڵە هەنارەکە. دەترسێت فەرهاد. دەرکە دەکوتێتەوە. تەقەی ئەمجارەی بەرزترە. چاو قایمتر لە پەنجەرە و، پاشان لە دەرکەی تەنەکەی ماڵەکەی ئەو بەر دەڕوانێت. هیچ نابزوێت.

« نەکا لە ماڵ نەبێ؟!»

رەنگێک دەبا و دێنێت فەرهاد. بەرزتر لە جاری پێشوو دەرکە دەکوتێت. پیرەمێردە رەقەڵەکە سەر لە تەنەکە پووتە ئاگرەکەی هەڵدەبڕێت و، قیت دەبێتەوە. کۆترێک لە سەر بانی ماڵەکەی ئەو بەر هەڵدەفڕێت و، دەنیشێتەوە. لەو دیو دەرکە چێویەکەوە کەسێک هەرا دەکات: « کێیە؟ دەرکە ئاوەڵایە.»

دەنگی پیرێژنی خاوەن ماڵە. دەخەجڵێت فەرهاد. نائومێد پاڵ بە تای کراوەی دەرکەکەوە دەنێت. خۆی بە دالانێکی تاریکدا دەکات. پلیکانەی نهۆمی ژووروو لە سەر ئەو تونێلە تاریکەیە. بەر لەوە پیایدا هەڵگەڕێت، هەرای پیرێژن لەو دیو دالانەکەو، لەوبەر حەسارێکی بچووکەوە رایدەوەستێنێت. سەری لە پەنجەرەی ژوورەکەی خۆیەوە دەرکێشاوە، پیرێژن. دەم لێک نانێت:

« کێیە؟ کێ بوو؟ »

« منم. فەرهاد.»

هەست بە کزی و خەمۆکی دەنگی فەرهاد دەکات پیرێژن. وەک هەمیشە میهرەبان دەڵێت: « کوڕم، خۆ تۆ دەزانی من دەرکە داناخەم. لە بەر ئێشی پێ و پشتم...»

باقی قسەکانی نابیستێت فەرهاد. بە پلیکانەکاندا هەڵدەگەڕێت. بە پەلەیە. لە سەرەوە دەرکەی هەردوو ژوورەکەی ئاوەڵایە. خۆی بە ژووری سەر کۆڵانەکەدا دەکات. دەڕواتە بەر پەنجەرەکە و، لەوێوە

لەماڵەکەی ئەوبەر کۆڵان دەڕوانێت. ماڵێکی بچووکی یەک نهۆم. کۆترخانێکی گەورە لە سەر بانی ماڵەکەیە. قەفەسێکی تۆڕی. کۆترەکان، جگە لە دوو، سێیەک بە سەر بانەکەدا بڵاو بوونەتەوە. کۆترستانە بانەکە. کۆتری سپی، شین، خاڵوو بەڵەک، پۆپنەدار و بێپۆپنە. تاکە تاکە دەگمێنن. لە دەوری یەکتر دەگەڕێن. لە خوار بانەکەوە پەنجەرەی بچووکی سەر کۆڵانەکە دیارە. گوڵە هەنارەکەش هێشتا ئاوی بن نەکراوە. نیگای وەیلانی بۆ حەساری ماڵەکە دەگوێزێتەوە فەرهاد. حەسارێکی بچووک و دەرکەیەکی تەنەکە. ئەویش چەند کۆتری لێیە. کۆترێکی باڵ نەخشین لە سەر لێواری حەوزێکی بچووک سەری هەڵبڕیوە. دەندووکی بۆ تنۆکی ئاوی شێرەکە کردووەتەوە.

نا، کەس لە ماڵ نیە... دڵتەنگ و نیگەران دەڕواتە ژوورەکەیتر فەرهاد. ژووری روو لە ماڵ و حەساری پیرێژن. کلۆڵە پیرێژن! هێشتا نەیزانیوە فەرهاد رۆشتووەتە سەر. لێکدا لێکدا قسەی بۆ دەکات. رەنگە لە تاو ئێشی پێ و پشتی... چاو بە ژوورەکەیدا دەگێرێت فەرهاد. سەتڵێکی خاڵی سەرنجی دەڕنێتەوە. تاوی دەداتێ. بە بیانووی ئاو هێنانەوە هەمدیس بە پلیکانەکاندا دادەگەڕێت. بۆ داڵانە تاریکەکە و لەوێوە بۆ حەسار.

**حەساری ماڵی پیرێژن وەک خۆی مابوو. هەروا شپرزە و هەڵنەپەردێراو. دارمێوی بن دیوارەکەش... پیرێژن هەمیشە لەو مێوە بە گلەیی بوو. گوتبووی:**

**« زڕە مێوە. حاشا لە بۆڵێک بەرسیلەش.» پەیژەکەش هەروا هەڵپەسێردرابوو. پلەیەکی ناوەراستی شکابوو. پیرێژن گوتبووی: « چلێک دارو دوو دەنک بزماری دەوێ، بەلام...»**

**ئەو چوو لە لای پەیژە هەڵپەسێردراوەکە راوەستا. هەردوو دەستی خستە سەر پلەیەک و، سەری بەرز کردەوە. دەتگوت لە چاڵێکدایە کە تەنها پلەکانی ئەو پەیژە دەیگەیەننەوە سەر زەوی.**

سەتڵەکەی دەخاتە بەر شێری ئاوەکەی حەسار. دەمی لێکناوە پیرێژن. تای کراوەی پەنجەرەکەی پێوە دەدات. بە بیستنی شۆڕەی ئاوەکە ژیوان دەبێتەوە. چاو دەگێڕێت.

« لێرەی کورم؟ »

سەتڵەکە بە جێدەهێڵێت و بەرەو پیری دەڕوات فەرهاد. بزەیەکی شەرمێونی لە سەر لێوە. لیبوردنی لێ دەخوازێت. بۆ ئەوە کە دەرکەی کوتاوە و، بۆ ئەوەی لە بیری چووەتەوە پیرێژن دەرکە داناخات. دەڵێت: « نازانم بۆچی پێموابوو رەنگە کەسێکت لە لابێ کە دەرکەم لێ بکاتەوە.»

دەزانێت بۆچی پیرێژن. شتێک وەکوو زەردەخەنە بە چرچوو لۆچی روومەتیدا تێدەپەڕێت. تێگەییوە. لە مەرامی دڵی فەرهاد گەیشتووە. دەڵێت: « کێم هەیە لە لام بێ کورم؟ جاروبار ئەو زەعیفەی دراوسێمان لایەکم لێدەکاتەوە، ئەویش ئێمڕۆ...»

« نەکا نەخۆش بێ؟ »

لەو قسەی خۆی دادەچڵەکێت فەرهاد. بزەی دێتێ پیرێژن. دەڵێت: « بەرلە نیوەڕۆ بە سەر پێوە هاتە لام، لە نەخۆش نەدەچوو. تەنانەت زۆریش بە دەماخ بوو.»

« نەکا بۆ شوێنێک چووبێ؟ »

« قەرار بوو عەسرەو دوا بێت و، حەسارەکەم بۆ هەڵپەردێوێ. بە بەختی چاک بێ. قەرار بوو ئەگەر تۆش لە ماڵ نەبیدەستێک بە ژوورەکەتدا بێنێ.»

دەزانێ چی دەڵێت پیرێژن. هەمیشە زانیویە دەبێ چی بڵێت. بۆ ئەوەی دڵی فەرهاد، ئەو کورە گەنجە کە پێی دەڵێت دایە و، جاروباریش دایەگیان،رابگرێت. میهرەبانە پیرێژن. هەمیشە میهرەبان بووە. پشووی دڵنیایی دەدا فەرهاد. رەنگ بۆ روخساری و، بریسکە بۆ چاوەکانی دەگەڕێتەوە.

**ئێمە بەر لە فەرهاد لە دالانە تاریکەکەوە بە پلیکانەکاندا هەڵگەڕاین. کە گەیشتینە سەر گوتم: « ئێرە ماڵی فەرهاد بووە، سالانێک لەمەبەر.»**

**ماڵی فەرهاد بوو. دوو ژوور لە سەررارەوێکی بچووک.**

**گوتم: « ئەم ژوورە کارگەیەتی.»**

**لە ژووری سەر کۆلانەکە بووین. هەر چوار دیوارەکەی بە تابلۆ داپۆشرابوو. سێپایەی ناوەڕاستی ژوورەکەش تابلۆیەکی نیوەتەواوی لە سەر بوو. کۆگایەک رەنگ و فلچە لە خوار سێپایەکە هەڵڕژا بوو. ئەو**

لـه نێـوان هێـڵی تونـد و، روخـساری گـرژ و مـۆن و، رەنگـی سـاردی تابلۆکاندا سـەرمای بـوو. موچڕکـەی بـە لەشـدا دەهـات. جگەرەیـەکی داگیرساند و، لە سەر کورسی بەر سێپایەکە دانیشت. دووکەڵی خەسـتی جگەرەکەی بە ژوورەکەدا بڵاو بووەوە.

گوتم: « زۆربەی ئەم تابلۆیانەی بەر لە هاتنی بۆ ئەم ماڵە کێـشاوە. لێرەش چەند کارێکی تازەی کردووە کە هێشتا هەڵینەواسیوە.»

ئەو سەیری تابلۆی نیوە تەواوی سەر سێپایەکەی کرد. پیاوێـک لـە زەمینەی رەش و شینی... ئەوسا هەستا و رۆشتە ژوورەکەیتر. منـیش شـــوێنی کـــەوتم. گـــوتم: « ئێـــرەش ژووری خـــەوتن و خـــواردن و، جاروباریش میوانداری کردنە.»

ئەو قونچکی جگەرەکەی لە پەنجەرەوە بۆ حەساری پیرێـژن فڕێـدا و، چاوی بە ژوورەکەدا خـشاند. جگـە لـە یـەک، دوو رەسـمی کـۆن و سەعاتێکی دیواری کە مێڵەکانی کەوتبوون، هیچیتر سەرنجی رانەکێـشا. گوتی: « ئەوانە رەسـمی کێن؟ »

من ماندوو بووم. رۆشتم لە سەر چرپاکەی فەرهاد راکشام. گوتم: « ئەوەیان رەسـمی باوکیەتی.»

پیـاوێکی بـە سـەرو سـیما لـە پـشت شیـشەی تـۆز لێنیـشتووی رەســـمەکەوە، لـــە بـــن ســـێبەری درەختێکـــدا دانیـــشتبوو. گـــوتم: « ئەویتریشیان...»

وشەکان پچڕ پچڕ بە لالێومـەوە هەڵـوەرین. پێـڵووەکانم ئـارام لـە سەر یەکتر نیشتن...

فەرهاد هاتبووە سەر. لە بـەر پەنجـەرەی ژوورەکـەیتر چـاوی لـە چۆڵی کـۆڵان و ماڵـەکەی ئەوبـەر بـڕیبوو. ئێـستا یـان سـاتێکیتر... دوا دلۆپی ئاو بە دەم شێری حەساری ماڵەکەوە بەستی. دلـۆپی پێـشتریش بەر لەوە بگاتە دەندووکی کۆترە باڵ نەخشینەکە لە جـمین کەوت و، بـە حەواوە هەڵواسرا. بـزوەی ئـارامی هـەورە چـڵکن و تێکچـڕژاوەکانیش نەما. ساتەکان مانیان گرت و هەموو شتێک راوەستا...

خەڵـووزی قەڵـەمەکەی ئـەو لـە گۆشـتە چێویەکەیـدا ون بووبـوو. قەڵـەمەکەی دانـا و، جگەرەیـەکی داگیرسـاند. پەلـەی بـوو. کـەمتر لـە سەعاتێکیتر دەبوو لەو ماڵە کە ساڵانێک لەمەبەر ماڵی پیرێژنێکی نەخۆش

و تەنها بووە و، فەرهاد ماوەیەک لە دوو ژووریدا ژیاوە، بڕواتە دەر. دەبوو فەرهادیش لە گەڵ خۆی بباتە دەر. بیباتەوە بۆ ماڵەکەی ئێستای. بۆ ژوورە تاریک و دووکەڵاویەکەی ئێستای... دەبوو بە کۆلانە تەنگەبەرو پێچاو پلووچەکاندا، لە پاڵ دیوارە کاگڵەکانەوە، لە ژێر پەنجەرە شینەکانەوە... «هەندێک لە گەڕەک و کۆلانەکان لەم هەموو ساڵەدا نەگۆڕاون.» ڕۆژانی سەرەتای گەڕانەوەی ئەوەی گوتبوو. گوتبووی: «هەندێک شوێن پێناچێ هەرگیز بگۆڕێن.» بە هەڵە چووبوو. ئەو ڕۆژە زانیبووی بە هەڵە چووە کە بۆ یەکەم جار دوا گەڕانەوەی، بە کۆلانەکاندا گەڕابوو. ماڵەکان، کاگڵی دیوارەکان، ڕەنگی شینی پەنجەرەکان، شەمدانی و ڕێحانەی ناو گوڵدانە تەنەکەکان و... بگرە خەڵکەکەش گۆڕابوون. کەسیانی نەناسیبووەوە. وەک فەرهاد... فەرهادی ساڵانێک لەمەبەر نا، وەک تەرمەکەی فەرهاد کە کەسی نەدەناسیەوە. هەموو کەس و، هەموو شتێکی فەرامۆش کردبوو. ئەو بیری کردەوە. «نەکا منیش وەک فەرهاد...»

لەو بیرە داچڵەکی. تۆقا. لە پشت مێزەکەی هەستا وسووڕێک بە ناو ژوورەکە و، بە ناو هەموو ژوورەکانی ماڵەکەدا گەڕا. هەموو سووچ و قوڕنەیەکی ماڵەکە شتێکی وەبیر دەهێنایەوە. کەسێک. شوێن یادەوەریەکانی نەکەوت. گەڕایەوە بۆ پشت مێزەکەی. کاغەزەکان لە سەر یەکتر کەڵەکە بووبوون. پەڕە سپیەکان لە لایەک و، پەڕە نووسراوەکان لە بەر دەستیدا. چاوی بە پەڕە نووسراوەکاندا خشاند. وشەکان وەک منداڵی سەرچڵ و لاسار لە ریزی ناڕێکو پێکدا وەستا بوون. ڕستەکان وەک هێڵی دوا تابلۆکەی فەرهاد خواروو خێچ بوون. نەیاندەگەیاندە...

گوتم: «تۆ هەمیشە خەتت ناخۆش بووە. تەڕە شووڵەکانی مامۆستا و، گوێ بادانەکانی باوکیشت هیچیان پێنەکرا.»

بە پێکەنینەوە گوتم. ئەو سەری بەرز کردەوە و سەیری کردم. چاوم هەڵێنا بوو. هەستا بووم و لە سەر چرپاکەی فەرهاد دانیشتبووم. گوتم: «سووکە وەنەوزێکی خۆش بوو. ماندوویی لە لەشم دەرچوو.»

گوتی: «درەنگە. زۆر درەنگە. ماوەیەکی زۆرە لێرەم، بە بێئەوەی زانیبێتم فەرهاد لە چی دەگەڕێ، یان چاوەڕوانی کێیە.»

چەند دلۆپ باران نیشتنە سەر پەنجەرەی ژوورەکەو بە هێڵی خوارو خێچدا شۆڕ بوونەوە.

گوتی: «ئەوە بارانیش دایکرد.»

«چاوەڕوانی فەرهادیش کۆتایی هات.»

ئەو بە خۆشیەوە تاوی دایە قەڵەمبڕەکەی. تا لە تاشینی قەڵەمەکەی بووەوە، هێڵە خوارو خێچەکانی سەر شیشەی پەنجەرەکەش پەرەیان سەند. ئەو هەستا و رۆشتە ژوورەکەیتر.

هێشتا لە بەر پەنجەرەکەدایە فەرهاد. لە کۆڵان و لە رێژنەی زولاڵی خوڕەمە بارانەکە راماوە. کۆترەکانی سەر بانی ماڵەکەی ئەوبەر، تەڕ و تلیس خزاونەتە کۆترخان و، بە کۆرس دەگمێنن. ترساون کۆترەکان. خوڕەی باران و تەپ و کوتی سەر بانی کۆترخانەکەیان ترساندوونی. پیاوێک و دوو کوڕی مێرمنداڵە لەو سەری کۆڵانەوە دەردەکەون. بە بینیان شاد دەبێت فەرهاد. بۆ ئەوەی نەبیندرێت هەنگاوێک لە پەنجەرەکە دەکشێتەوە. پیاوەکە گەنجە. دەستی هەردوو مێرمنداڵەکەی گرتووە و، راکێش راکێش بە کۆڵانەکەدا رایاندەکێشێت. لە دەرکەی تەنەکەی ماڵەکەی ئەوبەریان نزیک دەخاتەوە. دوا ئاوا بوونیان، لە پەنجەرەکە نزیک دەبێتەوە فەرهاد. مل بۆ ئەو سەری کۆڵان درێژ دەکاتەوە هەمدیس. لەو سەری کۆڵانەوە کچێک لە بەر رێژنەکەدا وردوو بە کاوەخۆ دێت. کچی ئاوو بارانە. هەنگاوی نەرم و سووک هەڵدەهێنێت. ناوە ناوەش سەر بۆ ماڵی فەرهاد و، بۆ پەنجەرەیژوورەکەی هەڵدەبڕێت. پێناچێت بیبینێت. تا دێت خەرامانتر دێت. کراسێکی ئاودامێنی تەخت شینی لە بەردایە کچەکە. گوڵە وردە سوورەکانی بە دەم باو بارانەکەوە دەشەکێنەوە. بە سەر یەکتردا دەخزێن. تەنها گوڵەکانی سەر سنگ و بەرۆکی وەک پەپوولەی قیرسیچمە بە مەمکەکانیەوە نووساون. بەدەم لەرینەوەیانەوە دەلەرنەوە. دوگمەی سووخمەکەیان ترازاندووە مەمکە قوتەکانی. هەموو گیانی چاوە فەرهاد. بێبیانوو دەست بۆ دەستگرەی پەنجەرەکە دەبات و، تایەکی دەکاتەوە. بەرامەی باران و بۆگڵی ناو کۆڵان و سەربانەکان خۆی بە ژوورەکەدا دەکات. بە حەزەوە هەڵیدەمژێت فەرهاد. کچە نایبینێت، هەستی

پێدەکات. دیسان سەر هەڵدەبڕێتەوە. باران لە سەرو قژیەوە بە تەوێڵ و هەنیەیداو، لەملاولای چاوە گەشەکانیەوە بە گۆنا و دەم و لێویدا دادەچۆڕێت. شیلەی بزە و زەردەخەندەی پێیە باران. بە لامل و بەرۆکیدا دەیباتە خوار.

فەرهاد بە ترس و بە حاستەم سەری سەلامی بۆ دادەنەوێنێت. کچە دەبینێت و لە خۆشیدا دەخنێتەوە. دەست هەڵدەبڕێت و، بێپەرواتر لێی رادەتەکێنێت. هەوداکانی باران بەدەم پەنجەکانیەوە دەئالۆزێن. خونچەی لێوی بۆ سەلامێکی بێدەنگ دەپشکوێت. ئەوسا لە ژێر رێژنەی باران و، لە بەر نیگای جووتێک چاوی تینوودا، لە دەرکەی تەنەکەی حەساریماڵەکە ئاوا دەبێت. لە دەرکەی ماڵەکەش.

بەر پەنجەرەکە چۆڵ دەکات فەرهاد. سەراسیمە و هەڵوەدا لە ژوورەکەش دەڕواتە دەر. بۆ کوێ؟ ئان و سات دەگەڕێتەوە. حەجمینی نیە. ئارامی لێبڕاوە...

**گوتی: «فەرهاد بۆوا دەکا؟ بۆ وەک شێت بە دەوری خۆیدا هەڵدەسووڕێ؟»**

**گوتم: «عاشقە.»**

**«عاشق؟!»**

بۆ بەر پەنجەرەکە دەگەڕێتەوە هەمدیس. لە پەنجەرەی ماڵی کچە دەڕوانێت. لە پشت پەنجەرەکە، هەنارێکی بچووک، گەورەتر لە بەلاڵووکێک، لە ناو لقووپۆپی ناسکی گوڵە هەنارەکە بە چاوە شیشەکەوە نووساوە. شیرینی ماچی پشت شیشە وەبیر دەهێنێتەوە. دەیبینێت فەرهاد. لەو دیو روونی و زولاڵی رێژنەکەوە دەیبینێت و ئۆخەی دێتێ.

**عاشقان لە خووی خۆیان نانێن. رەمز و نیشانەی نابێ لە بیر بکرێ. کاری ئەو دەستە سپی و ناسکەیە. حەتمەن پەرداخێک ئاویشی کردووەتە بن گوڵەهەنارەکە.**

**کردبووی. ئەو نەیدیبوو. گوتی: «نەکا ئەو کچە کاڵێ بێ!»**

**کاڵێ کچێکی دراوسێیان بوو. کچۆڵەیەکی منداڵکار. رەسمێک لە قاپی شینی پەنجەرەیەکدا. ئەو دەمە فەرهاد تازە پێدەگەیی. تازە خەتی**

سمێڵی دابوو. دەنگی بۆر بووبوو. دوو دەنک چواڵە لە ژێر پێستی سەر سنگیەوە هەڵتۆقیبوون. شەوان... هەموو شەوێک دوا ئەوەی گەڕەک دەنووست، دوور لە چاوی دایکی و باوکی، بێچرپە دەڕۆشتە سەر بان و، تا روون بوونەوەی بەیانی لە پەنجەرەی ماڵی کاڵێ ورد دەبووەوە. لە تاریکی پشت شیشەکانی و...

گوتی: « چیرۆکی یەکەم حەزی مێرمنداڵی... پاشان چیبوو؟ »

گوتم: « وەک هەموو چیرۆکێکیتری لەم بابەتە، دوا ماوەیەک باوکی کچە ماڵەکەی فرۆشت و، لەو گەڕەکە، تەنانەت لەم شارەش رۆیی. ژن و منداڵەکەشی لە گەڵ خۆی برد. فەرهاد کاتێک بەوەی زانی نەخۆش کەوت. نەخۆشی لە جێدا خستی. کە هەستایەوە تاوی دایە قەڵەم و کاغەز و، شەوو رۆژ خەریکی کێشانەوەی روخساری کچێک بوو کە هەرگیز تێر نەیدیبوو.»

« دەی لەوە دوا؟ »

لەوە دوا فەرهاد گەورە بوو. قوتابخانەی تەواو کرد و لە زانکۆ وەرگیرا. ئێوارەی رۆژێک کە بۆ تاران دەچوو، لە ئوتوبووسەکەدا دیسان کاڵێی دیەوە. ئەمجارە کاڵێ کچێکی فارسی تارانی بوو. لە گەڵ دایکی بۆ سەردانی برا سەربازەکەی هاتبوو، دەگەڕایەوە. دایک و کچ کراوە و میهرەبان بوون. لە لاشانی فەرهادەوە لە سەر دوو کورسی دانیشتبوون. کچە لە دواندنی کوڕێکی خوێندکار کە وەک برا سەربازەکەی شەرمن و بە ئەدەب بوو، تێر نەدەبوو. ئەو شەوە فەرهاد تا درەنگان لەبەر رووناکایی کزی گلۆپێکی بچووکدا، یان گوێی بە چرپەی ناسکی کاڵێ سپارد، یان بە سیلەی چاوە برسیەکانی لە روومەتی ورد بووەوە. دوانیوە شەو کاڵێ پەتوویەکی ئاوریشمی لە خۆی ئالاند و، سەری خستە سەر شانی دایکی و خەوت. شەوێکی ئەفسووناوی بوو بۆ فەرهاد. تا بەیانی خەو لە چاوی نەکەوت. بەیانی زوو بەر لە خۆرکەوتن گەیشتن. کە دابەزین دایکی کاڵێ تاکسیەکی راگرت. « شەقامی ئەمیرئاباد.» ئەو کاتە بوو فەرهاد بیریکردەوە، ناوو نیشانی کاڵێی نەپرسیبوو. دەستی هەڵبڕی و شوێن تاکسیەکە کەوت. تاکسی دووروو دوورتر بووەوە. فەرهاد دیسان کاڵێی بێناونیشان ون کرد.

تیزە بزەیەکی تاڵ وەک کەکرە نیشتبووە سەر لێوی ئەو و بە خـەم و مەراقەوە گوتی: (( ئیتر هەرگیز نەیدیەوە؟ ))

گـوتم: (( زۆری بـۆ گـەڕا. چەنـد مانـگ هـەموو رۆژێـک لـە زانکـۆ دەرۆشتە دەر و، بە شـەقامی ئـەمیرئابادا دەسـووڕایەوە. ئـەمیرابادی سەروو، ئەمیرئابادی خواروو... ئەگەرچی دەیزانی کچە دەرسی تـەواو کـردووە، بـەو حالـەش هـەر رۆژە و لـە بـەر دەرکـەی قوتابخانەیـەکی کچانەی ئەو نـاوە رادەوەسـتا و، یەکـە یەکـە لـە کچـە قوتابییـەکان ورد دەبووەوە. بەڵام نەیدیەوە. وەها کە کچێکی وا هەرگیز نەبووبێ تا ئـەو بیبینێتەوە. وەها کە ئەو شەوە نەک بـە واقیـع، بەڵـکو بـە خـەون کاڵـێی دیبێ. کێ چووزانێ؟!))

نابارێت ئیتر. لەو دیو پەنجەرەی ژوورەکەی فەرهاد، کچە کراس تەختـشینەکە هاتووەتـە دەر. حەساریماڵـەکەیان دەماڵـێت. پیـاوە گەنجەکەش بە پەیژەدا هەڵگەڕاوە و لە سـەر بـان، دان بـۆ کۆترەکـان رۆ دەکات. تاک و تـەرا لـە کۆترخـان هاتوونەتـە دەر کۆترەکـان. بـە سەر بانی هێشتا تەڕی ماڵەکەدا وەر بوون. دوو کوڕە مێرمنداڵەکەش رادەسـتی یـەکتریان گرتـووە و، کـوێرە کـوێر، بـە تـرس و گومـانی هەڵخلیسکانەوە، لە دەرکەی تەنەکەی حەسارەکە دێنە دەر. لـە بـەر پەنجەرە نەماوە فەرهاد. لە ژوورەکەش رۆشتووەتە دەر.

گوتی: (( ئەی ئەو کچە جوانە کێیە؟ ))

ماندوو بووبووم، بەڵام سەر خۆم نەهێنا. لەزەتی یادەوەری سـاتە فەرامۆش کراوەکانی رابوردووی فەرهاد و، مـەیلی ئـەو بـۆ زانـین، بـۆ بیستن و نووسین... گوتم: (( کاڵێ؟ ماوەیەکە دیسان کاڵێی دیوەتەوە.))

نەیپرسی چۆن؟ پێشتر گوتبووم. رۆژێک لە شـوێنێک. گوتبـووم: (( فەرهاد کاتێک لە زانکـۆ هـەڵات و گەڕایـەوە بـۆ ئێـرە پیـشەی نەقاشـی هەڵبژارد. تاوی دایە رەنگ کـردنی دەرکـەو پەنجـەرەی ماڵـی گەڕەکـە کۆن و قەدیمیەکان.))

گوتم: (( نـاو مـاڵ و پەنجـەرەی زۆربـەی ماڵـەکانی ئـەم گەڕەکـە فەرهاد رەنگی کردووە.))

گوتی: (( ئەوسا شەیدای ئەم کچە بووە و...))

# یانزده

دانیشتووە بە ژیانیدا بچێتەوە. وەک هەموو جارێکیتر کە دادەنیشت و بە ژیانیدا دەچووەوە. هەستیبە مەترسی دەکرد. هەستێکی ئاشنا کە هەمیشە لە گەڵیدا بوو. لە سووچێکی دووری دەروونیدا و، هەموو جارێک لە وەها کاتێکدا سەری هەڵدەدایەوە و، هەڕەشەی لێدەکرد. کام مەترسی هەڕەشەی لە ژیانی دەکرد؟ هەموو ژیانی بیرەوەریە پچڕ پچڕەکانی رابوردووی بوون و ئێستاش... لەوەتی گەڕابووەوە دووروو نزیک کۆمەڵێ کەسی بەدەورەوە بوو، هەندێک رووداویش لەملاولایەوە دەقەوما کە زۆربەیان کەس و رووداوی رابوردووی بوون. جگە لە لەیلا.

لەیلا دوێنێش هاتبووەوە. لە گەڵ نەشمیل، بۆ ئەوەی دەفتەری شێعرەکانی لێ وەربگرێتەوە. گوایە بە تەمایە شێعرەکانی پیتچنی بکا و، گوتبووی:

« دەمەوێ یەکەم کۆمەڵە شێعرم پێشکەش بە تۆ بکەم.» گوتبووی « تۆ»، ئەو داچڵەکیبوو. پێشکەش بە من؟ نەیپرسیبوو. تەنانەت نەیگوتبوو بەڵام لە یەکەم لاپەڕەی دەفتەرەکەدا پێشکەشت کردووە بە باوکت. لەیلا گوتبووی: « من گەلێ شت لە تۆ فێر بووم. لە چیرۆکەکانت و، لەم یەک، دوو دیدارەشدا، لە قسەکانت.» ئەوسا رۆشتبوو. بۆ شەوێدا مونیرە تەلەفوونی بۆ کردبوو. مونیرە خۆشحاڵ بوو. بیستبووی لەیلا بە تەمایە شێعرەکانی پێشکەش بە ئەو بکا و، باسی لەیلای کردبوو. باسی بنەماڵەی لەیلا. باسی باوکی کە ساڵانێک لەمەبەر کوژرابوو. دایکی کە شووی کردبووەوە. لەیلا کچێکی ئازاو بە جەوهەر بووە کە لەوەها وەزعێکی ناخۆشدا دەرسی خوێندووە، لیسانسی وەرگرتووە و، ئێستاش ئەگەر مەجال و ئیمکانی ببێ درێژە بە خوێندنەکەی دەدا. گوتبووی: « تۆ دەبێ لە گەڵی میهرەبانتر بی.» بە پێکەنینەوە گوتبووی. گوتبووی: « دەبێ لە گەڵ ئێمەش میهرەبانتر بی.» پاشان بۆ سبەینێ نیوەڕۆ لێی گێڕابووەوە. ئەو پێی نەدەکرا بچێ. یەک، دوو حەفتەی داهاتوو پێی نەدەکرا زوو زوو سەریان لێبداو، هەواڵیان بپرسێ. گوتبووی: « ئەگەر تەلەفوونتان بۆ کردم و هەڵمنەگرت نیگەران مەبن. جاروبار تەلەفوونەکە دەقرتێنم.» گوتبووی: « دەبێ...» نەیگوتبوو دەبێ چیرۆکی فەرهاد بنووسم. گوتبووی: « گەلێک کاری ناتەواو هەیە کە دەبێ تەواوی کەم.» مونیرە گوتبووی: « باشترین کار ئەوەیە کە دوا ساڵانێک گەڕاویتەوە. ئێستاش دەبێ تۆزێک بە ئێمەو بە ژیانی خۆتدا رابگەی.»

« ژیانی چیرۆکنووس چیرۆکێکە کە دەینووسێ.»

پێشتر لە شوێنێک ئەوەی گوتبوو. یان نووسیبووی. کەواتە دانیشتبوو بە چیرۆکەکەیدا بچێتەوە. ئەو چیرۆکە کە قەرار بوو بینووسێ. خەریک بوو دەینووسی و، لە بەشەکانی سەرەتایدا تووشی ژنێک بووبوو. ژنێک کە نەیدەناسی. بیری کردەوە، جگە لە دایکی و

خوشــکەکانی... تەنانــەت دایــک و خوشکەکانیــشی نەدەناســی. ئــەی ئەفسانە؟ ئەفسانەی دەناسی؟

گوتم: «بۆ ئەوەی کەسێکت خۆش بوێ پێویست ناکا بیناسی. بەڵام بۆ ئەوەی چیرۆکی کەسێک بنووسی دەبێ حەتمەن بیناســی. ناســینێکی هەمەلایەنە و تێر و تەسەل.»

تیــزە بــزەی هاتــێ. گــوتی: «چــۆن دەکــرێ کەســێک بناســی کــە نەبووبێ؟ »

نەبووبێ؟ کاڵێ کەسێک نیە نەبووبێ. حەتمەن بووە. تەنانەت ئەگەر نــەقاش لــە دواهــەم تابلۆکەشــیدا نــەیتوانیبێ نەخــشی روخــساری بکێشێتەوە، بووە. هەزار و یەک نیشانە بــوونی دەســەلمێنن. کــۆلانێکی تەنگەبەری داخراوو، دیوارە کاگڵەکان... پەنجەرەیەکی بچووکی شین و گوڵە هەنارێک لە گوڵدانێکی سواڵەتدا... هەنارێکی بچووک، گەورەتر لــە بەلالووکێک کە جاروبار بــە شیــشەی پەنجەرەکــەوە دەنووســێ و، زۆر شتیتر... کوڕێکی نەقاش کاتێک دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ، سێ جــار دەرکــەی کراوە دەکوتێ و چاوەڕوان دەبــێ دەســتێکی ســپی و ناســک لــەو دیــو پەنجەرەکەوە پەرداخێک ئاو بکاتە بن گوڵە هەنارەکە. لە هــەر کۆلانێــک کوڕێکی نــەقاش ســێ جــار دەرکــەی کــراوەی ماڵــەکەی بکوتــێ، دەبــێ دەستێکی سپی و ناسک... کەواتە کاڵێ بووە. بووە بۆیە هاتووەتــە نــاو ئەم چیرۆکەوە.

ئەو بیری کردەوە، رەنگە من زۆر شت دەربارەی کاڵێ بزانم. بەڵام هیچی لێ نەپرسیم. رووی کردە کاڵێ و گوتی: «خــۆت قــسەم بــۆ بکــە کاڵێ. باسی رابوردووتم بۆ بکە.»

«رابوردوو؟ هیچ رابوردوویەک لــە ئــارادا نیــە. هــەموو شــتێک لــە ئێستاوە دەست پێدەکا. لەو ساتەوە کە فەرهادی تێدا دەبینم.»

کاڵێ گوتی. لە زەینی ئەودا، بە تووڕەییەوە گوتی. ئەو ســەری بــە کاغــەزەکانی ســەر مێزەکــەدا شــۆڕ کردبــووەوە. مــن پێکــەنیم. وەک هەمیشە کە پێدەکەنیم و... گوتم: «بە خۆتدا شکایتەوە؟ »

ئەو بە خۆیدا شکابووەوە. هەستی بە کەمبوون دەکرد. نــەوەک لــە بەرامبەر کاڵێ و تووڕە بوونەکەی، بەڵکو لە بەرامبەر خۆی و کارێک کە دەبوو بیکا. شتێکی کەم بوو. بۆ بەردەوام بوون لە نووســینی چیرۆکــی

فەرهاد، چیرۆکی فەرهاد و کالێ، شتێکی کەم بوو. بە بێزاریەوە گوتی: «تێناگەم. ئەم کچە بۆ ئاوا لە رابوردووی خۆی دابڕاوە؟ بۆ ئاوا لە رابوردووی خۆی بێزارە؟»

گوتم: «تێناگەی؟»

گوتی: «نابێ... دەبێ لانیکەم سووکە ئاوڕێک لە رابوردووی بدەمەوە. بەڵام من هیچ لە رابوردووی نازانم.»

گوتم: «دەزانی. هەندێ شتی لێ دەزانی. دەزانی کە دایک و باوکی نەماوە و، لە گەڵ براکانیدا دەژی...»

گوتی: «برا گەورەکەی کۆترباز و قومارچیە و، دوو برا بچووکەکەشی کوێرن... بەم سووکە ئاگاداریە هیچ چیرۆکێک نانووسرێ.»

تا من هاتم شتێک بڵێم، ئەو بەردەوام بوو: «یان با بڵێم دەیان چیرۆکی جیاواز دەنووسرێ.»

گوتم: «تۆ یەکێک لەو دەیان چیرۆکە بنووسە.»

«کە چۆن کۆتایی پێ بێ؟»

چۆن کۆتایی پێبێ؟ گوتم: «ئەمەیان بە دەست تۆ نیە. تۆ بەر لەوە دەست بە نووسینی بکەیت کۆتایی پێهاتووە. هەموومان دەزانین. تەنانەت کاڵێش دەزانێ کە کۆتایی پێهاتووە.»

ئەو سەری لە سەر کاغەزەکانی سەر مێزەکە هەڵبڕی. هێشتا نیشانەی بێزاربوون بە روومەتیەوە بوو. جگەرەیەکی داگیرساند و، گوتی: «تێناگەم. تۆ دەڵێی هەموو شتێک لە رابوردوودا کۆتایی هاتووە و، کاڵێ دەڵێ هیچ رابوردوویەک لە ئارا دا نیە. ئەم چیرۆکە چۆن چۆنی دەخوێندرێتەوە؟!»

گوتم: «تۆ دەربەستی خوێندنەوەی مەبە. تۆ بینووسە.»

نووسی:

بە کۆڵانەکەدا تێدەپەڕێت کە دەبینێت پەنجەرەیەکیتر لە ریزی پەنجەرەی ماڵەکانی کۆڵان رەنگ کراوە. شینێکی ئاسمانی. بیر دەکاتەوە کچەکە. ئەوە کێیە هەر رۆژە پەنجەرەی ماڵێک رەنگ دەکات؟ ئەو سا لە دەرکەوە دەڕواتە ژوور. دەرکەی ماڵێک کە تازە پەنجەرەی رەنگ کراوە. کچانی ماڵەکە لە ژێرخان تەون دەکەن. بە

ڕۆشتنە ژووری تەپ و کوتی تەون کردنیان نامێنێت. کۆرسی بەرتەونەیان دەقرتێت. بە خۆشیەوە پێشوازی لێدەکەن کچە تەونکەرەکان. ئەویش وەک وەستایەکی کارامە لە گوڵی قاڵیەکەیان ورد دەبێتەوە. یەکیان چەند گرێی سووری گوڵێکی بە زەرد چنیوە. لچی لێ هەڵدەقرچێنێت. ((دیسان هەتیوە بێوەفایی کردووە؟ ))

پێدەکەنێت و کچەکانیش بە شوێنیدا پێدەکەنن. لە نهۆمی سەرووەوە قاقایان دەبیستێت فەرهاد. دایکی کچە تەونکەرەکانیش دەیبیستێت. قاقای کچانی پێخۆشە دایکی کچە تەونکەرەکان. هەمیشە پێی خۆش بووە. دەڵێت: ((ئەو کچەی دراوسێمان پێو قەدەمی شادە. بریا دەهاتە سەر.))

لە ژێرخان دێتە دەر کچەکە. بە پلیکانەکاندا هەڵدەگەڕێت. بە دەنگی پێیدا دیارە، نزیک و نزیکتر دەبێتەوە. دەرکە ئاوەڵایە. فەرهاد لە ناوەڕاستی ژوورەکە ڕوو لە دەرکەی ئاوەڵا دانیشتووە و ڕەنگ دەگرێتەوە.

((ئەوە تۆی پەنجەرەی ماڵان شین دەکەی؟ ))

بەرز نەیگوتووە کە فەرهاد بیبیستێت. دادەچڵەکێت فەرهاد. بە بینینی دادەچڵەکێت. دڵی دادەخورپێت.

((ئەوەتۆی کاڵێ؟!))

گوتوویە کاڵێ؟ گوتبێتی یان نا، وەک گوڵ دەگەشێتەوە کچە. کاڵێ... چ سیحرێک لەو ناوەدایە؟ بە بیستنی ناوی خۆی لە بیر دەچێتەوە.

**گوتم: ((لەو ڕۆژە و، لەو کاتەوە ئەو کچە بوو بە کاڵێ.))**

**کاڵێ ماوەیەک دواتر، ڕۆژێک کە هەموو خەڵکی کۆڵان و تەنانەت گەڕەکیش ناوی پێشوویان لە بیر چووبووەوە و، بە ناوی تازە بانگیان دەکرد بە فەرهادی گوت: ((دەمەوێ لە سجیلەکەشمدا ناوم بگۆڕم.))**

**ئەو ڕۆژە فەرهاد لە ماڵی پیرێژنێک، بەرامبەر بە ماڵی کاڵێ کاری دەکرد. ماڵی پیرێژن دوو دەستە بوو، لە ئەمبەراوبەری حەسارێکی بچووک. دەستەی ئەو بەر حەسارەکە دوو ژوور بوو کە پیرێژن بە تەنها تیایاندا دەژیا. دەستەکەیتر سەرخان و ژێرخانێک بوو لە سەر کۆڵان. ژێرخان باریکە دالانێکی تاریک و کۆنە عەمارێکی چۆڵ بوو.**

**سەرخان دوو ژوور و، ڕاڕەوێکی بچووک. پێشتر کرێچیان تێدا بوو. ژن و مێردێکی گەنج کە ماوەیەک بوو چۆڵیان کردبوو. پیرێژن بە تەمای بەکرێدانەوە ڕەنگی دەکردن. فەرهاد گوتبووی: « من ئامادەم بەکرێیان بگرم.»**

**پیرێژن ژوورەکانی بەکرێ دابوو، فەرهادیش بۆ یەکەم جار بووبووە خاوەنی ماڵی خۆی.**

**گوتم: « ماڵی پیرێژن دواهەم ماڵی ئەو کۆڵانە بوو کە فەرهاد پەنجەرەکانی ڕەنگ کرد.»**

**ئەو سەری بەرز کردەوە. جگەرەیەکیتری داگیرساند. ئەوسا بە گومانەوە گوتی: « دواهەم ماڵ؟ کەواتە پێشتر پەنجەرەی ماڵی کاڵێشی...»**

**درێژەی بە قسەکەی نەدا. دەستی بۆ قەڵەمەکەی بردەوە. ڕەنگە بە تەمای ڕۆشتن بۆ ماڵیکاڵێ. بەڵام کاڵێ لە ماڵ نەبوو.**

**نووسی:**

لە ماڵی فەرهادە کاڵێ. گوتوویە: « ئەجری دراوسێ لە سەر دراوسێیە. دەچم دەستێک بە ماڵەکەیدا دێنم و، کەلوپەلی ژوورەکانی بۆ دادەمەزرێنم.» بە پیرێژنی خاوەن ماڵیش دەڵێت. پیرێژن بەلایەوە سەیر نیە. دەزانێت ئازا و ڕۆح سووکە کاڵێ. هەموو ڕۆژێک دەچێت و یارمەتی ئەویش دەدات. ژوورەکان و تەنانەت حەسارەکەشی بۆ خاوێن دەکاتەوە.

« بڕۆم؟ »

بە شەرم و زەردەخەندەوە دەیڵێت. پیرێژن دوو دڵە.

« دەترسم پێی گران بێ.»

« پێی گران بێ؟ پێی گران بوایە دەرکەی ژوورەکانی دادەخست.»

تەسلیمە پیرێژن. میهرەبانە. سەری ڕەزامەندی بۆ دەلەقێنێت. کاڵێ لە دالانە تاریکەکەوە بە پلیکانەکاندا هەڵدەگەڕێت. سەرەتا بۆ ژووری سەر کۆڵان. ژووری سەر کۆڵان کارگەیە. پەنجەرەکەی هێشتا پەردەی پێوە نیە. لەو دیو پەنجەرەکە دەڕوانێت. لە کۆڵان و، بەولاوەتر لە ماڵی خۆیان. لە سەر بان و، لە کۆترخانی ڕەحیمی

برای. نارِواتە پێش. دەترسێت کەسێک لە کۆڵانەوە تێپەڕێت و... لە کۆڵانی داخراوەوە تێپەڕێت؟ چاو بە ژوورەکەدا دەگێڕێت کاڵێ. کۆمەڵێک تابلۆی گەورە و بچووک بە دیوارەکانەوە هەڵواسراون. نیگای لە تابلۆکان دەسوێت. ڕەنگی زەرد و بۆرەقنەی تابلۆکان و، ڕوخساری تێشکاوو، چاوی خێل و دەرتۆقیوی کەسەکان دەیترسێنن. خۆی لە شەرگەی گەرمە شەڕی چەند دەستە ژن و پیاوی شەل و شێتدا دەبینێتەوە کاڵێ. ناوبژیانی پێناکرێت، بە ناچار لە بەریان هەڵدێت. دەڕواتە ژوورەکەیتر. قەرەوێڵەیەک لە لایەکی ژوورەکەیە. کەلووپەلی لە سەر کەڵەکە بووە. قۆڵ هەڵدەماڵێت و داوێنی هەڵدەکات. سەرەتا ناو ژوورەکەی و داڵانەکەش گەسک دەدات. چاو دەگێڕێت. جگە لە پەتوە شڕێک ڕاخەریتری لێ نیە، ڕایدەخات. یەکە یەکە کەلووپەلی سەر قەرەوێڵەکە دادەگرێت. سەعاتە دیواریەکە و، پاشان ڕەسمەکان. ڕەسمی کێن؟ هەڵیاندەواسێت. ئەوسا چراو، قاپ و قاچاغ و، قۆری و پیاڵە و... هەموویان تازەن. تازە کڕدراون. لە سەر تاقی پەنجەرەکە هەڵیاندەچنێت. دەمێنێتەوە چەند کارتۆن. یەکیان باوەشێک کاغەزی تێدایە. ڕۆی دەکات. هەر پەڕە کاغەزێک نەخشێکی لە سەر کێشراوە. کارتۆنەکانیتریش پڕن لە کتێب. لە هیچ ماڵێک ئەوەندە کتێبی نەبینیوە کاڵێ. کتێبەکان لە سەر کارتۆنە خاڵیەکان لە پاڵ دیوارەکە ریز دەکات.

چی ماوە بیکات؟ گوتوویە: «دەچم کەلووپەلی ژوورەکانی بۆ دادەمەزرێنم...» بیر دەکاتەوە کاڵێ. بڵێی هەموو ماڵ و سامانی فەرهاد ئەمەندە بێت؟ چەند تابلۆی ناحەز و، کۆمەڵێک کتێب و... لە پەنجەرەوە دەڕۆانێت. پیرێژن هێشتا لە حەسارە. خێشکە خێشک خۆی بۆ ژوورەکەی رادەکێشێت. «خۆزگە ئێستا فەرهاد دەهاتەوە.» لە بەر خۆیەوە دەیلێت. بە شوێن ترووسکەی بیرێکدا بەرەو ژوورەکەیتر هەڵدێت. بۆ بەر پەنجەرەکە هەمدیس. کۆترەکانی ڕەحیم لە کۆترخان هاتوونەتە دەر. کوڕە کوێرەکان لە حەسار، شان بە شانی یەکتر هەڵتووتاون. سەر بۆ کۆڵان دەکێشێت. کۆڵان چۆڵە و، فەرهاد دیار نیە. چاوەڕێی ناکات کاڵێ. نائومێد بۆ

ژوورەکەیتر دەڕواتەوە.
(( خۆزگە فەرهاد لە ماڵ بوایە.)) لە سەر پەتووەکە، لە پاڵ ریزی کتێبەکاندا دادەنیشێت. کتێبێکی گەورە لە ریزەکە دەردەکێشێت.
(( ژان... کریس...تۆف.)) دایدەنێت و کتێبێکیتر هەڵدەگرێت. بە خەت و زمانێکیتر. رەنگە ئینگلیسی. (( بڵێی بزانێ ئەم کتێبانەش بخوێنێتەوە؟ )) کتێبەکە لێک دەکاتەوە. پڕە لە رەسم. رەسمی پەیکەری جۆراو جۆر. پەیکەری ژنێکی رووت سەرنجی دەڕنێتەوە. دادەچڵەکێت. سەر لە کتێبەکە هەڵدەبڕێت و، چاو بە ژوورەکەدا دەگێڕێت. ژوورێکی بە بێ ئاوێنە! سەیری دێتێ. (( بۆچی فەرهاد...)) سەیری پەیکەری ژنەکە دەکاتەوە. لە کەڵەموستی پێیەوە تا تۆقی سەری. (( بڵێی...)) هیچ ناڵێت کاڵێ. لاپەڕە هەڵدەداتەوە. پەیکەری ژن و پیاوێکی رووت و عوریان. ژنە لە باوەشی پیاوەکەدا بوردووەتەوە. لێوی خۆی دەگەزێت کاڵێ. شەرمی دێتێ. کتێبەکە لێک دەنێت و، دووبارە دەیکاتەوە. ئەمجارە بە پەلە و ترسەوە لاپەڕەکان هەڵدەداتەوە...
فەرهاد هاتووەتەوە. لە سەر پلیکانەکانەوە دەنگێک دەبیستێت. دەنگێکی نامۆ بە چۆڵیماڵەکەو، تاریکی راڕەوو پلیکانەکان. سەری سووڕ دەمێنێت فەرهاد. دەنگێکی ژنانەیە. گۆرانیەک کە ژنێک لە بەر خۆیەوە دەیخوێنێت. شەپۆلی دڵڕفێنی خوێندنەکە لە کۆتایی پلیکانەکاندا رایدەوەستێنێت. هەناسەی لە سنگیدا حەپس دەکات. دەرکەی هەردوو ژوورەکەی لە سەر پشتە. دەنگەکە لە کارگەوە نایەت. بێچرپەو بە حاستەم سەر بۆ ژوورەکەیتر هەڵدەبڕێت. لەودیو دەرکە کە دانیشتووە کاڵێ. پشتی لە ئەوە. بسکی لە سەر شانیەوە بەلا مل و سەرسنگیدا بەرداوەتەوە. پشتە مل و بناگوێی سپی دەدرەوشێنەوە. سەمای درەوشانەوەیان لە چاوی فەرهاددا ئاگر لە شەرم و سەرکۆنەی بەردەدەن. پێڵوو ناتروکێنێت فەرهاد. نیگای بە دوو هێڵی تەریبی گەردنیدا، بۆ سەر شان و ناو پشتی شۆڕ دەبێتەوە. کراسێکی رەشی پیاوانەی لە بەردایە کاڵێ. تان و پۆی بە پێستی لەشیەوە چەسپاوە. دەنگی و، بۆنی خۆشی لەشی بە راڕەوو ژوورەکاندا بلاو بووەتەوە.

دەنگـی وردە وردە نـزم دەبێتـەوە کاڵـێ. ئێـستا ئیتـر چرپەیـە. چرپەی کاڵـێ و تـەپ و کوتی دڵـی خـۆی تێکـەڵ دەبـن. دەترسـێت فەرهاد. هەست بە لەرزینی ئەژنۆی دەکـات. بـە بیریـدا دێت، هـەروا بێـدەنگ بگەڕێتـەوە. هـەنگاوی لـەرزۆکی بـەرەو دوا هەڵـدێنێتەوە. خشپەی پێناشاردرێتەوە فەرهاد. خشپەی پێـی. دادەچڵەکێت کاڵـێ. تەزوویـەک لـە گیـانی دەگـەڕێت. وەک ئاسـکێکی سـرک و سـلۆک وەردەسووڕێت...

فـەرهاد نازانـێ کاڵـێ چـۆنی بینیـوە. شـپرزە و هەراسـان، یـان خۆشحاڵ و تامەزرۆ؟

(( خۆزگە دەکرا هەزار ساڵ ئاوا سەیرت کەم و، گوێ لـە دەنگـت بگرم.))

بەرز گوتوویە؟ تەریق دەبێتەوە فەرهاد. شەرم دەکـات. لـە خـۆی و، لـە کاڵـێ کـە لـە بەرامبـەری راوەسـتاوە و، پەنجـەکانی لـە یـەکتر گرێداوە. زەردەخەنەیـەکی شـیرین لـە سـەر لێـوە رەنـگ پـەڕیوەکانی کاڵێیە. ترسەکەی هێشتا نەڕەویوەتەوە. فەرهاد بە شەرمەوە دەڕواتـە ژوور. ژوورەکـەی دامـەزراوو خاوێنـە. سوپاسـی ئـەو پەنجـە سـپی و ناسکانە دەکات. ئەوسا بێئیختیار لە سەر قەرەوێڵەکەی دادەنیـشێت. کاڵـێ هـەروا بـە پێوەیـە. بـۆ دانانیـشێت؟ ئامـاژە بـۆ لایـەکیتری قەرەوێڵەکە دەکات فەرهاد.

(( دەزانم زۆر ماندووی...))

هیچیتری پێناگوترێت. بیشیڵێت کاڵێ نایبیستێت. هێشتا مەست و سەرخۆشی یەکەم گوتنیەتی کاڵێ. دادەنیشێت. لـە سـەر قەرەوێڵەکە نا، لە سەر پەتوە راخراوەکە دادەنیشێت. پاڵ بـە دیوارەکـەوە دەدات. فەرهادیش دادەخزێت و پاڵ بە قەرەوێڵەکەوە دەدات...

بێدەنگی لە ژوورەکەدا پەنگی خواردووەتەوە. کچ و کـوڕ نـازانن دەبێ چی بڵێن. خۆیان لە نیگای تامەزرۆی یـەکتر دەشـارنەوە. سـەر دادەخـات و لـە گرێـی پەنجـەکانی ورد دەبێتـەوە کاڵـێ. لەشـی بـە ئـامێزی نیگـای شـەرمنی فـەرهاد دەسـپێرێت. بێـدەنگی کوولەکـەی رۆحی غەریبیە، بە زەویدا دەکوتێت کاڵێ. دەیشکێنێت.

(( پیرێژن پێی وابوو پێت گران دەبێ بێمە ژوورەکەت.))

پێدەکەنێت. هەستێکی سەیر و نامۆی هەیە. دەمێکەیە چاوەڕوانیی پرسیارێک ئازاری دەدات. خۆی رادەگرێت و نایدرکێنێت. پرسیارێکیتریلێدەکات: « پیریژن زانیویەتی هاتوویتەوە؟ »

دەرفەتی وەڵامی پێنادات.

« گوتم دەچم دەستێک بە ژوورەکانیدا دێنم و، بەرلەوەیبگەڕێتەوە...»

بە دەم گوتنەوە هەڵدەستێت کاڵێ. بۆ جارێکیتر چاو بە ژوورەکەدا دەگێڕێت. بە تەمایە بڵێت، کارێک نەماوە بیکەم. بەڵام نایڵێت. فەرهاد دەڵێت: « نەیدیوم. پیریژن نازانێ کە هاتوومەتەوە.»

بزەی دێتێ کاڵێ. ئان و سات هەست بە ئاسوودەیی دەکات. غەریب نامێنێت. پێدەکەنێت و دەڕوات لە سەر لێواری قەرەوێڵەکە دادەنیشێت.

ئەو قەڵەمەکەی دانا و، جگەرەکەی لە تەپڵەکی سەر مێزەکەدا کووژاندەوە. تەپڵەک پڕ بوو لە قونچکە جگەرە و، لەملایەوە چەند پاکەتی خاڵی. ئەگەر مونیرەی خوشکی لێرە بوایەو ئەم دیمەنەی بدیبایە... هەستا و، تەپڵەکەکەی رۆ کرد. چەند پاکەتە خاڵیەکەش. نەگەڕایەوە بۆ پشت مێزەکەی. ماندوو بوو. لە سەر مۆبلێک دانیشت و، پێی راکێشا. من بەرامبەری دانیشتبووم، سەیری کردم. گوتی: « بێسوودە. ئەم دیدارە بەم شێوە...»

نەیگوت، ئەم دیدارە بەم شێوە بە لاڕێمدا دەبا. گوتی: « ئافرەتی ئەم دیدارە لە کاڵێ ناچێ.»

« لە کاڵێ ناچێ؟!»

بە سەرسووڕمانەوە گوتم.

« چۆن دەزانی؟ خۆ تۆ کاڵێ ناناسی. دەیناسی؟ »

گوتی: « نایناسم. بەڵام فەرهاد دەناسم و هێشتا هەندێک بۆچوونی ئەخلاقی ئەو ساڵانەم لە بیرە. ئەو ساڵانە، رەنگە ئێستاش، بۆ هونەرمەندێکی وەک فەرهاد... خوێندکارێکی سیاسی و بەرپرس...»

گوتی: « کاڵێ نابێ وەها کچێک بووبێ. کارەکەرێکی سووک و ساویلکە... دەبێ لە کەسایەتی کاڵێدا شتێکی سەیر بووبێ کە فەرهادی شەیدای خۆی کردبێ.»

«شتێکی سەیر؟!»

بیرم کردەوە، لە کەسایەتی ئافرەتدا چ شتێکی سەیر هەیە؟ شتێکیوا کە گەنجێکی وەک فەرهاد شەیدای خۆی بکا؟ » ئەوسا گوتم: «لە کەسایەتی ئەفسانەدا چ شتێکی سەیر بوو، کە تۆی شەیدای خۆی کردبوو؟ لە کەسایەتی ئەفسانەدا...»

قسەی پێ بڕیم. گوتی: «من نامەوێ نەخشی کاڵێ لە رووی ئەفسانەوە بکێشمەوە. نامەوێ کاڵێ هەمان ئەفسانە بێ. یان لە ئەفسانە بچێ. نامەوێ چیرۆکی فەرهاد و کاڵێ، چیرۆکی خۆم و ئەفسانە بێ...»

لە بەر خۆیەوە گوتی. لە دڵی خۆیدا. گوتی: «فەرهاد دەبێ خۆی بێ. پیاوێک کە ساڵانێکە تووشی فەرامۆشی بووەو لە ژوورێکی تاریک و دووکەڵاوی کە بۆکۆن و بۆنی زبڵی سووتاوی لێدێ، دەژی. کاڵێش دەبێ خۆی بێ. کچێک کە ساڵانێک لەمەبەر...»

گوتم: «لە کۆڵانێکی تەنگەبەر و داخراودا، لە گەڵ برایەکی کۆترباز و قومارچی و، دوو برای بچووکی کوێری ژیاوە. شەیدای کوڕێکی نەقاش بووە و، رۆژێک لە رۆژان رۆشتووەتە ژوورەکەی. لە سەر لێواری چرپاکەی دانیشتووەو...»

خۆشە دوو دڵدار لە ژوورێکدا، لە سەر لێواری چرپایەک، شان بە شانی یەکتر دانیشن و...

من پێکەنیم. ئەو وەک هەموو جارێکیتر ریزێک دانی زەرد و پیسی دی. گوتی: «هێشتا پێموایە دەبێ لە کەسایەتی کاڵێدا شتێکی سەیر بووبێ. من تا تێنەگەم ناتوانم درێژە بە نووسینی چیرۆکەکە بدەم.»

گوتم: «تا درێژەی پێنەدەی لەو شتە سەیرە ناگەی.»

بە تەوسەوە گوتم؟ ئەو نەیزانی. هەستا و دیسان بۆ پشت مێزەکەی چووەوە. دیسان دوا لاپەڕەی نووسینەکەی خوێندەوە.

بزەی دێتێ کاڵێ. ئان و سات هەست بە ئاسوودەیی دەکات. غەریب نامێنێت. پێدەکەنێت و، دەڕوات لە سەر لێواری قەرەوێڵەکە...

# دوانزه

گوتبـووی: «دەمــەویٚ هــەموو تابلۆکـانی فـەرهاد ببیـنم.» نیـوە شەویٚک گوتبووی و، من هەموو تابلۆکانم بۆ هێنابوو. هـەموو تابلۆکـان جگە لەوانە کە پێشتر لـە ماڵـی فـەرهاد دیبـووی. لـە ماڵـەکەی سالاٚنێک لەمەبەری. کۆمەڵێ پورترێت کـە دیواریکارگـەیان داپۆشـیبوو. کۆمەڵـێ روخـساری تێکـشکاوو تـوورە و هەڵـچوو کــە کاڵـێیان ترسـاندبوو. گوتبووی: «ئـەم تابلۆیانـەم نـاویٚ. فـەرهادیان تێـدا نـابینم.» مـن ئـەو تابلۆیانەم بۆ هێنابوو کە فەرهاد دوا ناسینی کاڵێ کێشابوونی. ئـەویش یەکە یەکە تۆز و خۆڵی کۆنی لێ سڕیبوون و، بە دیواری ژوورەکەیەوە -ژوورەکەی خۆی- هەڵیواسیبوون. تابلۆکان کۆن بوون. رەنگـەکان لـە سـەر قوماشـە سـپیەکان درزیـان بردبـوو، لـە چەنـد لاوە وەریبـوون. قوماشەکانیش لە چەنـد لاوە دڕابـوون. بـە هـەودا دەزووی باریـک، بـە تەقەڵی ورد دروابوونەوە. گوتبووی:

«ئەم تابلۆیانە تا ئێستا لە کویٚ بوون؟ » ئەوسا لێیان ورد بووبـووەوە. لــە دانــە دانــەیان. ســـەرەتا لــە نزیکــەوە لــە درز و برینــەکانیان ورد بووبـووەوە، لــە هەڵــوەرینی رەنگــە وشــکەکان. پاشــان لێیــان دوور کـەوتبووەوە. چووبـووە پـشت مێزەکـەی و، لـەوێوە تێیـان فکریبـوو. هەموو رۆژێک تێیان دەفکری و، ئەگەر کەسێک، بارام، مونیرە یان هـەر کەسـێکیتر دەهاتــە لای، دەیــدی لــە دیــواری ســپی ژوورەکــەی ورد بووەتەوە و، بیر لە شتێک دەکاتەوە.

گوتم: «بیر لە چی دەکەیتەوە؟ »

گوتی: «لە کاڵیٚ.»

گوتی: «کاڵێ دەبیٚ لـە پـشت ئـەو پەنجـەرە شـینە زۆر چـاوەڕێی هاتنەوەی فەرهاد بووبیٚ.»

ئەوسا قامکی بۆ یەکێک لە تابلۆکان درێژ کـرد. ئـەوە یەکـەم تـابلۆ بوو کە فەرهاد لە ماڵی کاڵێی کێشابووەوە. نووسـی:

لە پشت پەنجەرەی ژوورەکەیەتی کاڵیٚ. لە خەڵوەت و سێبەردا، ساتە برووسکەییەکانی رۆژانی رابوردووی بیر دەکاتەوە. رابوردووی

دووری نا. رابوردووی دووری فەرامۆش کردووە کاڵێ. لەو کاتەوە فەرهادی بینیوە... چاوەڕێی هاتنەوەی فەرهادە کاڵێ. چاوەڕوان لە ترپەی دڵی چاوەڕوان دەگات. بە تینوویەتی گوڵی نێو گوڵدانەکان دەزانێت. ئاویان دەدات. دوا پەرداخی بۆ گوڵە هەناری سەر تاقی پەنجەرەکە بە دەستەوەیە. یەک، دوو، سێجار دەنگی کوترانی دەرکە دەبیستێت. تەقەی ئاشنای دەرکەی ماڵی پیرێژنە. ماڵی فەرهاد. پەردەی پەنجەرەکەی لا دەدات کاڵێ. دەستێک لە سەر لێواری وشکی گوڵدانەکە و، دەستەکەیتری پەرداخێک ئاو رۆدەکاتە بن گوڵەکە. لە کۆڵان، لە پشت دەرکەی چێوی فەرهاد دەبینێت. دەستی بە دەم روانینەوە دەلەرزێت کاڵێ. گوڵدانەکە سوور دەخوات و، لقووقۆپی ناسکی گوڵە هەنارەکەش. هەنارێکی بچووک، گەورەتر لە بەلاڵووکێک بە شیشەی ساردیپەنجەرەکەوە دەنووسێت. فەرهاد دەیبینێت و، کاڵێ لە خۆشیدا دەخنێتەوە. پەرداخەکە دادەنێت و تایەکی پەنجەرەکە دەکاتەوە. فەرهاد رۆشتووەتە ژوور. بەڵام دەرکەی چێوی هێشتا بە رووی تاریکی دالانەکە لە سەر پشتە. سەر بۆ پەنجەرەی ژوورەکەی فەرهاد هەڵدەبڕێت کاڵێ. لە شیشەی پەنجەرەکە و، لە زەمینەی سپیواشی پەردەی هێشتا دادراوەیدا، جووتێک کۆتر لە سەر بانی کۆترخان لە دەوری یەکتر دەگەڕێن. ئەوسا پەردەکە لادەدرێت. فەرهاد لەو دیو پەنجەرەوە دەردەکەوێت. ئێستا ئیتر کۆترەکان لە سەر سنگی فەرهاد هەڵدەسووڕێن. ئیشارەتی بۆ دەکات فەرهاد. کاڵێ دەیبینێت و بە خۆشیەوە تای کراوەی پەنجەرەکەی پێوە دەدات.
لە ژوورەکەش دەڕواتە دەر...

رەحیمی برایلە ماڵ نیە. پێناچێت وا زوو بێتەوە. کوڕە کوێرەکانیش لە حەسار لە پاڵ یەکتر دانیشتوون و...

«تا دێمەوە لە دەرکەی حەسار نەچنە دەر.»

کاڵێ دەیلێت. بەو حاڵەش متمانەیان پێناکات و لە دەرووەوە دەرکەیان لێ هەڵدەپێکێت. کۆڵان چۆڵە. دەرکەی چێوی هێشتا ئاوەڵایە. کاڵێ دەڕواتە ژوور و، دەرکە لە چۆڵی کۆڵان دادەخات...

چۆڵی کۆڵان بیانوویەکە بۆ ئەوەی خۆشەویستی ئەو دوو گەنجە هەروا بە شاردراوەیی بمێنێتەوە. گوتم: « بە تەمای تاکەی عەشقی فەرهاد و کاڵێ لە خەڵکی کۆڵان بشاریتەوە؟ خەڵکی کۆڵان دەبێ تاکەی کاتی ژوانی ئەو دوو دڵدارە لە ماڵەکانیان بخزێن و، دەرکە و پەنجەرە لە سەر خۆیان دابخەن؟

بە پێکەنینەوە گوتم. بە توانجەوە. ئەو هیچی نەگوت. جگەرەیەکی داگیرساند و بیری کردەوە، رێی تێناچێ خەڵکی کۆڵان لە حاست هاتوو چووی کاڵێ بۆ ماڵی فەرهاد کوێر بن. نووسی:

خۆشەویستی پەنهان ناکرێت. لە کۆڵانێکی تەنگەبەر و داخراودا، نیگا و چرپەی عاشقانە و دزە ژوانی پەنامەکی لە چاوو گوێی کەس ون نابێت. دەزانێت کاڵێ. بێدەربەستە. بۆ بێ دەربەست؟ خۆشحاڵە. با کۆڵان عەشقی لە قاو بدات. چرپە و زەردەخەنەی خەڵک دۆستانەیە. با کچە تەونکەرەکان بەرزتر بچرن. نیگای پیرێژنی خاوەن ماڵی فەرهاد میهرەبانە. بەڵام فەرهاد... کز و ماتە فەرهاد.

کز و مات؟

گوتی: « بۆ دەبێ فەرهاد لە کاتی وادا کزو مات بێ؟ »

لە بەر خۆیەوە گوتی. قەڵەمەکەی دانا و سەری لە دەستنووسەکەی هەڵبڕی. ماوەیەک لە من و، پاشان لە دیواری ژوورەکە ورد بووەوە. ئەوسا هەستا. وەک زۆر جاریتر سەرو خوارێکی ژوورەکەی کرد و، بەرەو یەکێک لە پەنجەرەکان چوو. لەوێشەوە بۆ هەیوان...

بایەکی توند هەڵیکردبوو. دوێشەویش ئەم باو گەردەلوولە بوو. تا بەیانی لووراندبووی و، پاڵی بە دەرکە و پەنجەرەی ماڵەکەوە نابوو. ئێستاش پاڵی بە خۆیەوە دەنا. ئەو باڵندە رەش و گەورە کە لەم کاتانەدا بە ژوور ماڵ و حەسارەکەوە هەڵدەسووڕا، دیار نەبوو. لە کوێ بوو؟ نەیپرسی. با لقووپۆپی نیوە رووتی درەختەکانی حەساری دەهێنا و دەبرد. گەڵای وشک و وەریوو، تۆز و خۆڵی حەساری بۆ سووچێک رادەماڵی. نیگای ئەویشی راماڵی. نیگای منیش. من یەکەم جار بوو لەو سووچە، خانوویەکی کۆن و بچووکم دەدی. خانوو؟ ژوورێک کە تەنها پەنجەرەیەکی بچووکی روو لەم حەسار و ماڵە بوو. ویستم بپرسم کێ لەو ژوورە کۆن و بچووکەدا دەژی؟ نەمپرسی. بیری فەرهاد کەوتمەوە

که له ژوورێکی تاریک و بچووک، ژوورێک که بۆکۆن و بۆنی زبڵی سووتاوی لێدەهات و، به دووکەڵ قانگ درابوو، له بەر رۆشنایی کزی پەنجەره دووده و دووکەڵ گرتووەکەیدا دادەنیشت. له زەینی نووسەرێکدا. نووسەرێک که به پەله بوو بەر له مردنی -مردنی کێ؟- چیرۆکەکەی بنووسێ. چیرۆکێک که ساڵانێک بوو له بیر چووبووەوە.

ئەو زۆر له هەیوان بەند نەبوو. با ئازاری دەدا و سەرمای بوو. ناچار رۆشته ژوور. دیار بوو لەم ماوەدا بیری له پرسیارەکەی خۆی کردبووەوە. له وەڵامی پرسیارەکەی.

« بۆ دەبێ فەرهاد له کاتی وادا کزو مات بێ؟ »

گوتم: « هەزار و یەک هۆ بۆ کزی و ماتی کەسێکی وەک فەرهاد هەیە.»

لای لێکردمەوە. من به دوایدا هاتبوومە ژوور. سەیری کردم. له چاومدا و له نیگای ماندوومدا بۆ یەکێک لەو هەزار و یەک هویه گەڕا.

گوتم: « فەرهاد خوێندکارێکی هەڵاتووە و، ڕێی تێدەچێ ئێستا یان ساتێکیتر پۆلیس به شوێنی بزانی و...»

ئەو سەری لەقاند. وەها که شتێکی بیر کەوتبێتەوە. دیار بوو له بیری چووبووەوە فەرهاد خوێندکارێکی هەڵاتووە و، لەگەڵ هاوڕێکانی... بەڵام فەرهاد له بیری نەچووبووەوە. فەرهاد هێشتا هیچی فەرامۆش نەکردبوو. هەڵاتنەکەی له زانکۆ، گەڕانەوە و، هەڵبژاردنی ژیانی نهێنی، بەڵێنێک که به هاوڕێکانی دابوو، ئەو کوڕە گەنجانە که شەریک و هاوبەشی خەون و ئاواتەکانی بوون.

هاوڕێکانی چەند کوڕی گەنجی هاوتەمەنی خۆی بوون. سەرەتا حەفتەی جارێک له تاریکی شەودا، یەکە یەکە لەو سەریکۆڵانەوە دەردەکەوتن و، گورج و به پەله به قەراغ دیواره کاگڵەکاندا تێدەپەڕین و خۆیان به ماڵی فەرهادا دەکرد. کاڵێ چەند جار دیبوونی. له پشت پەنجەرەی ژوورەکەیەوە، کاتێک له دەرکه چێویەکه رۆشتبوونه ژوور. یان کاتێک دوا سەرەتاتکەکردن بۆ ناو کۆڵان، هاتبوونه دەر. کاڵێ لێیان ترسابوو. لێیان دەترسا. هاوڕێکانی فەرهاد له کەس نەدەچوون. لەو کەسانه که کاڵێ دەیناسین. جارێک به فەرهادی گوتبوو:

« هاوڕێکانت له دز دەچن. وەک دز خۆیان...» به گاڵتەو پێکەنینەوە

گوتبووی. فەرهاد نەیهێشتبوو قسەکەی تەواو بکا. گوتبووی: «ئەوان پاکترین و بە شەرەفترین کوڕانی ئەم شارەن.» بە تووڕەییەوە گوتبووی. کاڵێ ئیتر هیچی نەگوتبوو. بەڵام پیرێژنی خاوەن ماڵ دەیگوت: «کورم ئاگات لە خۆت بێ. تۆ کرێکارێکی هەژاری. دەبێ سەرت بە کاریخۆتەوە قاڵ بێ. دەبێ تەنها لە بیری ژیان و داهاتووی خۆتدا بی.» پیرێژن بۆ ئەوەی دەگوت؟ فەرهاد بیری دەکردەوە. خۆزگە کرێکارێکی هەژار بوایە. وەک هەموو کرێکارێکی هەژاریتر. کەسێک کە پیرێژنی خاوەن ماڵی و کاڵێ پێیان وابوو. خۆزگە دەکرا تەنها لە بیری ژیانیخۆیدا بێ. ژیانی خۆی و کاڵێ. داهاتووی خۆی و کاڵێ. دەبوو بە کاڵێ بڵێ خوێندکارە. خوێندکارێکی هەڵاتوو. دەبوو پێی بڵێ بە نهێنی دەژی.

ئەو دیسان لە پشت مێزەکەی بوو. سەریبە کاغەزەکاندا شۆڕ کردبووەوە. نووسی:

> کزو ماتە فەرهاد. کەیل و دڵتەنگ. لە پشت سێپایە و تابلۆکەی دانیشتووە. ڕەنگی گرتووەتەوە. ڕەش و شین و... دەمە فڵچەیەکی لێ هەڵدەگرێت و بە تابلۆکەیدا دەسوێت. هێڵێکیتر و مێڵەیەکیتر. ئەوسا دەکشێتەوە و لە تابلۆکەی رادەمێنێت. پیاوێک لە پشت هێڵەکاندا... یەخسیرە پیاوەکە. دیلە. لە زەمینەی ڕەش و شینی تابلۆکەدا، لە هەناری ئەمدیو مێڵەکان دەڕوانێت. هەنارێکی سووری گەورە. نە بە لقێکەوە بەر بووەتەوە نە لە سەر دەفرێک داندراوە. لەمدیو مێڵەکاندایە یان لە خەیاڵی پیاوەکەدا؟ لە تەڕایی چاوە بێتینەکانیدایە.

تەنگەتاوە پیاوەکە. دەستی بە مێڵەکانەوە نووساوە. پەنجەی باریک و ئێسکنی مێڵەکان دەگوشن.

هێشتا کشاوەتەوە فەرهاد. هێشتا لە تابلۆکەی راماوە. لە پیاوی دیلی پشت مێڵەکان. لە خۆی دەچێت پیاوەکە، ئەگەر دیل بێت. ئەگەر لە پشت مێڵەکانەوە لە کاڵێ بڕوانێت. خشپەی پێی کاڵێ دەبیستێت فەرهاد. دادەچڵەکێت. کاڵێ نابێ ئەو تابلۆیە ببینێت. جارێکە نابێ ببینێت. هەڵدەستێت. پشت لە تابلۆ و پشت لە پیاوی پشت مێڵەکان...

« فەرهاد تاکەی ئەو تابلۆیە لە کاڵێ دەشارێتەوە؟ تاکەی خۆی پێ نەناسێنێ؟...»

ئەو گوتی یا من؟

« تا کۆتایی ئەو ژوانە.»

فەرهاد لە ژوورەکەیتریش خەمگینە. لە لای کاڵێش. دەڵێی قورسی پرسیارێک کەوتووەتە سەر گیانی. یان وەڵامێک. تێناگات کاڵێ. سەرەتا پێی وایە لە ئەو نیگەرانە. لە رەحیمی برای. لە برادەرەکانی رەحیم کە هات و چوویان دەکەن. فەرهاد پێشتر پێی گوتووە: « رەحیم نابێ رێگە بە خۆی بدا لە ماڵێکدا تۆی لێ دەژی قومار بکا.» گوتوویە: « تۆ نابێ بێڵی هەموو لات و بەرەڵایەک هات و چووی ماڵتان بکا.» بە توورەییەوە گوتوویە. « حەیفە. حەیفە تۆ خوشکی رەحیمتەکەی قومارچی بیو...» بە خەم و مەراقەوە گوتوویە. کاڵێ گریاوە. « رەحیم پیاوی ماڵەکەیە. خاوەنی ماڵەکەیە. من هیچ دەسەڵاتێکم نیە جگە لەوەی خۆم لە برادەرەکانی نەگەیەنم و، لە ژوورەکەی خۆم لە گەڵ کورە کوێرەکاندا سەر بە سەری یەکەوە بنێین.» فەرهاد بڕوای پێکردووە. بڕوای پێدەکات. بیر دەکاتەوە کاڵێ. دوێشەو لە گەڵ رەحیمی برای شەڕی بووە. لێی ویستووە واز لە قومار و، واز لە برادەرە هەرزەو بەرەڵاکانی بێنێت. رەنگە فەرهاد قرموو قاڵ و هەراو هورییایانی بیستبێت. رەنگە لەوە نیگەران بێت. دەڵێت: « دوێشەو هەموو قسەیەکم لە گەڵ رەحیم بڕاندەوە. گوتم ئیتر حەقت نیە لەم ماڵەدا قومار بکەی. گوتم تا من لەم ماڵەدا بم...»

بە جەسارەتەوە دەیڵێت. بە خۆشی و جەسارەتەوە. بەو هیوایە گرێی ناوچاوانی فەرهاد بکرێتەوە. ئەو خەم و نیگەرانیەی لێ بتارێت. لێی ناتارێت. کەواتە لە شتێکیتر نیگەرانە. بۆ شتێکیتر خەمگینە. بۆچی؟ پاڵی بە دیوارەکەوە داوە کاڵێ. لە بەرامبەری فەرهاد، لە چاوەکانی دەڕوانێت. نیگای دەدۆزێت. نیگایوەک هەمیشە میهرەبان و عاشقانەیە. عاشقانە و ماندوو. ماندووی شاردنەوەی رازێک. ئەمجارە تێدەگات کاڵێ.

« بۆ لە منی دەشاریتەوە؟ »

فەرهاد دادەچڵەکێت.

(( چی؟ ))

(( ئەو رازە کە چاوی میهرەبانتی ماندوو کردووە.))

بزەیەک وەک سێبەری تاوان ئان و سات بە لێوو، بە روومەتیدا دەگوزەرێت.

(( هیچ رازێک لە چاومدا نیە.))

لەرەی دەنگ و شەرمی نیگای بە درۆی دەکەنەوە.

(( بەڵام رازێک لە دڵمدایە. راز نا، نەگوتراوێک.))

ئەو نەگوتراوە چیە؟ لێی ناپرسێت کاڵێ. ناوێرێت. باوەش بە جەستەی خۆیدا دەکات. بە سنگیدا. وەها کە بیهەوێ لە بوونی دڵنیا بێت.

فەرهاد دەڵێت: (( من ئەو کەسە نیم تۆ پێت وایە. من کرێکارێکی هەژار نیم.))

دەبێ پێبکەنێت کاڵێ. وەک هەموو جارێکیتر. دەبێ بتریقێتەوە.

(( من خوێندکارم. خوێندکارێکی...))

باقی قسەکەی نابیستێت. دەتاسێت. چاو بە ژوورەکەدا دەخشێنێت. ژوورەکە هەندێک کەلوپەلی پێ زیاد بووە. کۆمەڵێک کتێب و... رقی لە کتێبەکان دەبێتەوە. یەکەم جارە رقی لە شتێکی فەرهاد دەبێتەوە.

(( کەواتە من و تۆ...))

کەواتە من و تۆ چی؟ ئەو سەری لە کاغەزەکان هەڵبڕی. نیگای بۆ یەکێک لە پەنجەرەکانی ژوورەکە گوێزایەوە. دیسان باران. دەبوو بمانزانیایە ئەو باو گەردەلوولە تاوە بارانێکی خۆشی بە دواوەیە. ئەو قەڵەمەکەی دانا و، وازی لە نووسین هێنا. گوتی: (( نازانم کاڵێ لە چی تاساوە. لەوەی کە فەرهاد خوێندکارە، یان لەوەی کە خوێندکارێکی هەڵاتووە؟ ))

کاڵێ تا ئەو کاتەش لە مەبەستی فەرهاد نەگەیشتبوو. نەیدەزانی خوێندکاری هەڵاتوو واتە خوێندکارێکی تاوانبار. کەسێک کە پۆلیس لێی دەگەڕا بیگرێ. وەک پیاوی تابلۆکە کە گیرا بوو. کاڵێ تا ئەو کاتە تابلۆی پیاوە دیلەکەی نەدیبوو.

تابلۆی پیاوه دیلەکه ئێستا وەک زۆربەی تابلۆکانیتری فـەرهاد، بـه دیواری ژوورەکەی ئەوەوه بوو. ئەو سـەیری کـرد. لـه مێـڵەکانی ورد بووەوه. له پیاوی پشت مێـڵەکان. پیاوەکـه هێـشتا لـه هـەناری ئەمـدیو مێڵەکانی دەڕوانی. هەنارەکه وەک ئەو دەمانـه سـوور نـەبوو. ڕەنگـی گۆڕابوو. سـوور و زەرد و... نـارنجی؟ ئـاگری بـوو. ئـەو هەسـتا. لـه تابلۆکه نزیک بووەوه. ئەو پیاوه دیله چەنده له خۆی دەچوو. له ئەو، له ئێستای، کاتێک له پشت ساڵەهاوه له ئەفسانەی دەڕوانی. گوتی:
«دەبێ بڕۆمه دەر.»

سیانزه

دەبـوو بڕواتـه دەر. بـەم ڕۆژه سـاردە و، ئـەم ڕۆژه ساردانه سەرەتای وەرزی سەرما بوون. وەرزی سەرما لەم وڵاته کوێستانیه که دەست پێدەکا کۆتایی نایەت. جلەکانی له بەر کردو ملپێچێکی خوری که ڕووناکی خوشکی بۆی چنیبوو، له تارانەوه بۆی ناردبوو، له ملیئاڵاند.
گوتم: «دیسان بۆ کوێ؟»
ئاوڕی لێدامەوه. به نیگایدا زانیم دەیەوێ بڵێ: «وازم لێ بێنه. خـۆ تۆ دەزانی...» بـەڵام نـەیگوت. هیچـی نـەگوت. مـن دەمـزانی وەڕس و ماندووه و، مادام وەڕس و ماندوو بوو، دەبوو بڕواته دەر. به شـەقام و کۆڵانەکاندا بگەڕێ. یان بـه پـارک و سـەیرانگەکاندا بـسووڕێتەوه. ئـەو پارک و سەیرانگانه که ژوانگەی چۆڵـی دوانیوەڕوانیـان بـوون. ڕۆژانی

پاییز و زستانی ساڵانێک لەمەبەر دەستیان دەخستە ناو دەستییەکتر، ئەوو ئەفسانە.

لە دەرکە چووبووە دەر کە تەلەفوونەکە زەنگی لێدا. گوتم: «ئێستا دەگەڕێتەوە و، هەڵیدەگرێ.» نەگەڕایەوە. بە پلیکانەکاندا داگەڕا. بە حەسارەکەدا تێپەڕی. گەڵا وەریوەکان تەڕو تلیس بە خشتیراڕەویحەسارەکەوە لکابوون. لە دەروازەی سەر کۆڵانەکەوە رۆشتە دەر و، دایخست. هەمیشە لە دەروازە چێویەکەی سەر کۆڵانەوە دەهات و دەڕۆشت. زۆری نەخایاند کە دیسان کردیەوە. تەلەفوونەکە ئیتر زەنگی لێ نەدەدا. بۆچی گەڕابووەوە؟ مونیرە و مێردەکەی بە دوایدا هاتنە ژوور. مێردەکەی مونیرە لە سەفەر هاتبووەوە. لە کوێت یان دوبەی. رادوێزەبتێکی بچووکی بە دیاریبۆ هێنابوو. لە سەر تاقی ژوورەکە، لە پاڵ رادوێ گەورەکەی باوکی داینا. گوتی: «بە داخەوە لێرە شریتیشی لێنیە.»

مێردەکەی مونیرە پێکەنی. سێ شریتیشی لە گیرفان دەرهێنا.

«ئەم سێ شریتە هی خۆمن. هی ئەو دەمانە... بیرەوەری کۆنت لێ دەژیەننەوە. دڵنیام پێت خۆش دەبێ.»

مێردەکەی مونیرە خۆشحاڵ بوو. بەڵام مونیرە...

مونیرە گوتی: «ئەو ژن و پیاوە لە دەرەوەی وڵاتەوە تەلەفوونیان بۆ کردیەوە.»

ئەنوەر و نەسرین... دۆست و دراوسێی بوون. رۆژیبەر لە گەڕانەوەی گوتبوویان: «ئەوەندەی لە ئێران بمێنیتەوە حەفتەی جارێک ئێمە تەلەفوونت بۆ دەکەین و، حەفتەی جارێکیش...» بەڵام ئەو تەنها جارێک تەلەفوونی بۆ کردبوون.

مونیرە گوتی: «لەمەدوا هەرکەس تەلەفوونت بۆ بکا ژمارەی ئێرەی دەدەمێ. بە من چی تۆ دەتەوێ چیرۆک بنووسی و، حەز ناکەی کەس تەلەفوونت بۆ بکا. حەیام چوو ئەوەندە گوتم ببوورن لە ماڵ نیە. کە هاتەوە پێی دەڵێم...»

مێردەکەی مونیرە یەکێک لە شریتەکانی لێدا. تایەر تۆفیق بوو. «رۆژێ

وا ڕێکەوت کە ڕێگەم کەوتە ماڵی یارەکەم. دیم کـە وەسـتاوە بـە تـەنها نەونەمامی...» گوتی: « پێت خۆشە، وانیە؟ »

مـــونیرە هەســـتا و دەنگـــی زەبتەکـــەی کـــز کـــرد. گـــوتی: « تەلەفوونێکیتریشیان بۆ کردووی.»

مونیرە نیگەران بوو. لەوەتی هاتبوو نیگەران و کەمێک تووڕە بوو.

ئەو گوتی: « کێ؟ لە کوێوە؟ »

« نازانم کێ. بەڵام دەیگوت لە ئوستانداریەوەیە. دەیگـوت سـبەینێ دەبێ سەرێک لە ئیدارەی...»

بە ترسەوە گوتی. گوتی: « بڵێی کاریان چی بێ؟ نەکا دیسان...»

ئەو زەردەخەنەیەکی کـرد. زیـاتر بـۆ ئـەوەی دڵخۆشـی بداتـەوە. گوتی:

« مەترسە. دڵنیام شتێکیوا نیە. ڕەنگە بیانەوێ وەبیرم بیننـەوە مۆڵـەتی سێ مانگەم لە تەواو بوونە و دەبێ...»

مـــونیرە قـــسەکەی پـــێ بـــڕی. گـــوتی: « ئـــەی ژن هێنانەکـــەت؟ ئەیوەسیەتەکەی باوکم؟ »

مونیرە سەیری ڕەسـمەکەی بـاوکی بـە سـەر سـنگی دیوارەکـەوە کرد. ماوەیەک بوو ئـەو نەیـدەدی. مـیرزا سـەعید لـە حەسـار، لـە ژێـر سێبەری درەختەکاندا، لە سەر چرپاکەی دانیشتبوو قلیانی دەکێشا.

« ئیمڕۆ هاتووم پێت بڵێم لەیلا...»

ئەو گوتی: « مونیرە بارام سوورە لە سـەر فرۆشـتنی ئـەم مـاڵ و حەسارە.

ئەم بەیانیە مشتەری بۆ هێنابوو.»

مشتەریەکان فەرمانبەری بانک بوون. بانکی میللـی، یـان میللـەت... نوێنەر و کارشناس و... لە دەرکەی ئاسنی سەر شەقامەوە هاتبوون. بە حەسارەکەدا گەڕا بوون. یـەکیان گوتبـووی: « گـەورەترین بـانکی ئـەم شارەی لێ ساز دەکرێ.» پاشان بـە پلیکانەکانـدا هەڵـگەڕا بـوون. ئـەو بەخێرهاتنی کردبوون. بارام بە چرپـە پێـی گوتبـوو: « ئـەم دوو پیـاوە هـەموو ئیختیارێکیـان دراوەتـێ. دەم و قەڵـەمیان قەپانـە.» ئـەو هیچـی نەگوتبوو. بارام پێکەنیبوو. گوتبووی: « حەز دەکەم چاوێک بە ناو مـاڵ و ژوورەکانیشدا بخشێنن. ئەم ماڵە یەکێک لە ماڵە کـۆن و قەدیمیەکانـە.

ئەگەرچی چەند جار دەسکاری ناو ژوورەکانمان کردووە، بەڵام ئێستاش بەشێکی زۆر لە گەچبڕی و پەنجەرەکانی دەسکردی باشوەستای سەد ساڵ لەمەبەرە.» ئەویتریان گوتبووی: «ئاغای میهرەبان ئێمە دەرکە و پەنجەرەی شکاو ناکڕین. ئێمە زەوی دەکڕین. هەرکاتێ مامڵەکەمان سەری گرت، بۆ بەیانیدا ماڵەکە دەڕووخێنین. بە گەچبڕی و پەنجەرەو...»

بارام بیری کردبووەوە، دەبێ مامڵەکە سەر بگرێ. بانک پارەی باشی دەداو، ئەو پێویستی بە پارەی باش بوو. مشتەریەکان ماڵ و حەسارەکەیان پەسند کردبوو، روشتبوون. بارام تا دەرەوەی حەسار بەڕێی کردبوون. کە گەڕابووەوە گوتبووی: «نەمزانی میوە و شیرینی لێ نیە. پێم خۆش نەبوو بە چایی تاڵ میواندارییمان کردن.» ئەو پیاڵە خاڵیەکانی کۆ کردبووەوە و، بۆ ئاشپەزخانەی بردبووەوە.

«دەزانی یەکی چەند ملوێنمان بەر دەکەوێ؟ »

بارام بەرز گوتبووی. بۆ ئەوەی ئەو بیبیستێ. ئەو پیاڵەکانی شتبوو. بارام ویستبووی بڕواتە ئاشپەزخانە. نیگای لە رەسمەکەی باوکی هەڵەنگووتبوو. لێی چووبووە پێش. گوتبووی: «یەکی هەشتا ملوێن تمەن. رەنگە زیاتریش. بەڵام من بە هەشتا ملوێن دەبمە خاوەنی شەش دانگی کارخانەکەو ئەو هەتیوە تازە پیاکەوتووەی شەریکم دەردەپەڕێنم.» میرزا سەعید قلیانی کێشابوو. نەیبیستبوو. قوڵتە قوڵتی ئاوی قلیانەکە نەیهێشتبوو بیبیستێ، یان تەپ و کوتی مونیرە و رووناک کە لە ژێرخان تەونیان دەکرد؟ رەنگە دوا عەسر بووبێ کە مونیرە و رووناک لە قوتابخانە گەڕابوونەوە و، رۆشتبوونە ژێرخان. رەنگە خەریکی چنینی یەکێک لە قاڵیە گەورەکانی میوانخانە بووبێتن. حەتمەن خەریکی چنینی یەکێک لەو قاڵیە گەورانە بوون، تا ساڵانێک لەوە دوا بڵێن: «ئەو قاڵیانە کە بارام فرۆشتنی دەسترەنجی ئێمە بوون.»

بارام ترسا بوو. نەکا دیسان مونیرە و رووناک... ئەی ئەو؟ پێکەنیبوو. پارەی زۆر بەرد نەرم دەکا. بەو مەرجە... گوتبووی: «دەڵێن ساڵی جارێک بەخت لە دەرکەی ماڵان دەدا. بەڵام ئێمە لە هەموو ژیانماندا ئەمە یەکەم جارە بەخت دەرکەی ماڵمان دەکوتێ. ئەم ماڵ و حەسارە بەم بانکە نەبێ ناکڕدرێ. من کارشناسەکانم رازی کردووە.

رازی کردنی مونیره و ڕووناک له ئه‌ستۆی تۆیه.» مونیره و ڕووناک پێشتر گوتبوویان: « ئه‌م ماڵ و حه‌ساره هێشتا به ناوی باوکمانه‌وه‌یه. میراتی دوو براو دوو خوشکه. تا براکه‌یترمان له غه‌ریبایه‌تی نه‌گه‌ڕێته‌وه...» بارام گوتبووی: « من نامه‌وێ ته‌ما له برا غه‌ریبه‌که‌م بکه‌م. دڵنیام ئه‌و له من زیاتر پێویستی به پاره‌یه.» مونیره و ڕووناک گوتبوویان:

« ئه‌ی ئێمه؟ »

« به‌شی ئێوه‌ش ده‌ده‌م. به پێی شه‌رع و قانوون به‌شی ئێوه‌ش ده‌ده‌م.»

گوتبوویان: « به‌شی ئێمه له ماڵی باوکمان ئه‌وه‌یه مانگی جارێک سه‌ری لێبده‌ین. ناو ماڵ و حه‌ساره‌که‌ی خاوێن بکه‌ینه‌وه. ئاوی حه‌وزه‌که‌ی بگۆڕین.
به گوڵو گوڵدانه‌کاندا ڕابگه‌ین. له هه‌ر ژوورێکی تۆزێک دانیشین و به یادی باوک و دایکمانه‌وه چاوێک هه‌ڵپاڵێوین.» بارام بیری کردبووه‌وه؛ ئێستا که ئه‌م ماڵ و حه‌ساره چه‌ند ساڵه چۆڵ و کاوله، حه‌وزه‌که‌ی وشک و لاڕووخاوه، گول و گوڵدانه‌که‌ی نه‌ماوه، حه‌تمه‌ن مل به فرۆشتنی ده‌ده‌ن. به تایبه‌ت ئه‌گه‌ر بزانن بانک چه‌نده‌یان ده‌داتێ.
گوتبووی: « ساڵانێکه به ئاواته‌وه‌م سێ دانگه‌که‌یتری کارخانه بکڕم و، تابلۆی سه‌ر ده‌رکه‌که‌ی بێنمه خوار. ئه‌وسا تابلۆیه‌کیتری
بۆ ساز ده‌که‌م و له سه‌ری ده‌نووسم کارخانه‌ی ره‌نگسازی میهره‌بان.»
ئه‌و نه‌یبیستبوو. یان بیستبووی و هیچی نه‌گوتبوو. له ئاشپه‌زخانه هاتبووه ده‌ر. بارام هه‌روا خۆشحاڵ له به‌رامبه‌ر ره‌سمه‌که‌ی باوکی راوه‌ستا بوو. له به‌رامبه‌ر باوکی. به گه‌شکه‌و خۆشیه‌وه گوتبووی: « میهره‌بانه‌که‌ی به خه‌تێکیگه‌وره و رێنووسی کوردی ده‌نووسم. وه‌ها که له دووره‌وه سه‌رنجی خه‌ڵک راکێشێ و بیخوێننه‌وه. ئه‌م کاره بۆ تۆ ده‌که‌م. دڵنیام پێت خۆش ده‌بێ. دڵنیام ئه‌گه‌ر بمایتایه شانازیت پێوه ده‌کردم.» به ده‌م گوتنه‌وه ده‌سته‌کانی به‌ملاولادا جووڵاندبوو. ئه‌و پشتی تێهه‌ڵکردبوون و، رۆشتبووه ژووره‌که‌یتر. میرزا سه‌عید تووڕ بووبوو. دوا مژی له قلیانه‌که‌ی دابوو، داینابوو.

«شانازی بە چیتانەوە بکەم؟ یەکێکتان شەوو ڕۆژ ماڵ ناکەوێتەوەو، ئەویتریشتان بە زیندوویی داوای میراتم لێدەکا. بڕۆن هەردووکتان لە بەر چاوم ون بن.»

بارام پاشەو پاش کشابووەوە. چاوی لێبوو دایکی لە ژێرخان هاتبووە دەر. کەوگیری بە دەستەوە بوو؟ مونیرەو ڕووناکیش بە دوایدا هاتبوونە دەر. مونیرە و ڕووناک هەمیشە بە دوای دایکیاندا دەهاتنە دەر. کە دەیاندی باوکیان تووڕەیە، دیسان بە دوای دایکیاندا دەرۆشتنەوە ژوور.

ئەو ڕۆژە میرزا سەعید لە چی تووڕە بوو؟ هیچیان لە بیریان نەمابوو.

مونیرە گوتی: « باوکم لە داخی بارام سەری نایەوە.»

سەرمای دەرەوە لە کەلووکونی پەنجەرەکانەوە هەڵیکوتابووە ژوور. مێردەکەی مونیرە گوتی: « ئەم ماڵە زۆر ساردە. بۆ زۆپاکەت هەڵنەکردووە؟ »

نەوتی نەمابوو. ماوەیەک لەمەبەر مونیرە بەرمیلێک نەوتی بۆ ناردبوو، دوێشەو تەواو بوو.

گوتی: « بە تەمابووم بڕۆمە دەر بەرمیلێک نەوت بکڕم.»

مێردەکەی مونیرە بڕوای پێ نەکرد. بە تیزەوە گوتی: « کەس نا تۆ! دڵنیام ئێستا کە من باسی دەکەم بیرت دەکەوێتەوە.»

ڕاستیدەکرد. ئێستا کە باسیکرابوو، ئەو بیری نەوت و تەنانەت سەرماش کەوتبووەوە.

مونیرە گوتی: « بەم عەسرە نەوتت دەست ناکەوێ. ئیمشەو دەچینە ماڵی ئێمە و سبەینێ دەسپێرم کەسێک نەوتت بۆ بێنێ. هەروەها دەچین بە شوێن وەستایەکی دارتاشیشدا کە بێ و دەستێک بەم دەرکە و پەنجەرانەدا بێنێ. ماوەیەکیتر کە هەوا تەواو ساردی کرد، کەس لەم ماڵەدا هەڵناکا.»

ئەو زەردەخەنەیەکی کرد و، گوتی: « بارام بە هیوایە ماڵەکە چۆڵ کەم و بیفرۆشێ، ئەوسا تۆ دەتەوێ دەرکەو پەنجەرەکانی...»

مێردەکەی مونیرەش زەردەخەنەی کرد. مونیرە هەڵچوو. گوتی: « تا لەم ماڵەدا بووکت بۆ دانەبەزێ، بارام دەبێ خەون بە فرۆشتنیەوە ببینێ.»

گوتی: « ئەمە هەر قسەی من نیە. قسەو بەڵێنی رووناکیشە. خوشکی بمرێ، هەموو رۆژێک لە تارانەوە تەلەفوونم بۆ دەکا و، لێم دەپرسێ زەماوەندەکە بوو بە چی؟ »

ئەو نەیگوت، کام زەماوەند؟ نەیپرسی، زەماوەندی کێ؟ زەبتەکەی کووژاندەوە و، لە گەڵ مونیرە و مێردەکەی لە ماڵرۆشتە دەر.

چواردە

کە میوانەکانی رۆشتن، گوتم: « قەرارە کەسێک بێت بۆ لات؟ »

میوانەکانی ژنێک و دوو پیاو بوون. ژنەکەی پێشتر دیبوو. لە ئیدارەی میراتی فەرهەنگی یان... ژنەکە گوتبووی: « لە پیشانگەی نەقاشی. پێم گوتیت، دۆستێکم دەرهێنەرە و پێی خۆشە یەکێک لە چیرۆکەکانت بکاتە فیلمی سینەمایی.»

دەرهێنەر پیاوێکی رۆمانتیک بوو. عەینەکێکی لە ملیەوەو بۆ سەر سنگی بەردابووەوە. دوا بە دوای هەموو قسەیەک دەیگوت: « مەحشەرە... بێوێنەیە...» خەڵکی تاران بوو. گوتبووی لە ئالمان گرافیکی خوێندووە و، لەوەتی گەڕاوەتەوە چەند فیلمی کورتی ساز کردووە. حەزی کردبوو بە ئالمانی بدوێ و، ناوە ناوەش دوا بوو. من تێنەگەیشتبووم. ئەو ژن و پیاوەش کە لە گەڵیدا بوون تێنەگەیشتبوون. گوتبووی: « پێم خۆشە یەکەم تەجرەبەی سینەماییم لە کوردستان بێ. کارێکی کوردی.» گەلالەی چیرۆکەکەی ئەوی لەو ژن و پیاوە بیستبوو. هاوڕێی بوون یان هاوکاری؟ گوتبووی: « کە باسیان کرد زانیم چیرۆکێکی مەحشەرە... بێوێنەیە. تکام لێکردن بۆم تەرجەمە بکەنەوە.»

چیرۆکەکە چیرۆکی پیاوێکی گوندی بوو. برایمۆک سالانێک بەر لەو رووداوە، حەز لە پەریخان ناوێک دەکا. ئەو ناوەکانی لە جووتە دڵداری بەیتێک وەر گرتبوو. لە بێبەختی برایمۆک، کەس و کاری پەریخان لە گەڵیدا نەیارن. چەند جار مەلاو ریش سپی دەنێرێتە خوازبێنی و، نایدەنێ. گریانی پەریخانیش سوودی نابێ. بە زۆر و بە پەلە بە شووی دەدەن. بە پیاوێکی... برایمۆک لە داخ و مەراقدا سەری خۆی هەڵدەگرێ. سالانێک بێسەرو شوێن گونداو گوند و،

شاره و شار دەکا. پاشان پەککەوتە و لێقەوماو دەگەڕێتەوە. ناچێتەوە بۆ ئاوایی، لە قۆخە چۆڵێکی ئەو ناوە بە تەنها دەژی...

دەرهێنەر گوتبووی: « فیلمەکە لێرەوە دەست پێدەکا. برایمۆک سەری
بە کاری خۆیەوە قاڵە. کە هاڕە و نرکەی تەیارەکان دەبیستێ، سەر هەڵدەبڕێ. ئاسمان تاوو ساوە. لە پڕ نرکەی تەقینەوەیەک دایدەچڵەکێنێ. نیگای، کە هەمان نیگای دووربینە، لە ئاسمانەوە بۆ گوندەکە شۆڕ دەبێتەوە. گوند لە ناو تۆز و خۆڵ و، پاشان دووکەڵێکی خەستدا ون بووە. بە ژوور خێوەتی دووکەڵەکەوە چەند داڵەکەرخۆرە بە باڵە رەشەکانیانەوە دەر دەکەون...» گوتبووی:

« ئەمە دەسپێکێکی مەحشەرە... بێوێنەیە...»

ئەو ساڵانێک لەمەبەر ئەو چیرۆکەی نووسیبوو. ئەو دەمەی کە ئێران و عێراق لە شەڕدا بوون و، تەیارەکان هەموو رۆژێک شار یان گوندێکیان بۆمباران کردبوو.

برایمۆک بە بینینی ئەو دیمەنە دڵی دادەکەوێ. نەکا پەریخان... تف لە دەست و قەوەت لە پێ، یەکەم کەس دەبێ دەگاتە گوندەکە. گوند ئاداری بەسەر پاداریەوە نەماوە. زۆربەی دانیشتووانی کوژراون، یان بێهۆش و بریندار کەوتوون. ئەوانەش کە ماون بە قڵخە قڵخ بە شاخەکاندا هەڵگەڕاون. تۆز و خۆڵ نیشتووەتەوە. دووکەڵی خەست رەویوەتەوە. بۆگەنێکی کەسکوند بە هەموو ئەو ناوەدا بڵاو بووەتەوە. بۆمبەکان شیمیایی بوون، برایمۆک زانیویە. شێت و سەراسیمە بە سەر کەلاوەکاندا تێدەپەڕێ. بە سەر مەیت و برینداری خزم و ناسیاویدا هەنگاو دەنێ. هێشتا بە ماڵی پەریخان دەزانێ. بە ماڵی مێردەکەشی. پەریخان و یەک دوو کەسیتر لە حەساری ماڵەکە کەوتوون. کوژراون یان بریندار؟ برایمۆک تێنافکرێ. باوەشی پێدا دەکا. پەریخان قورس بووە، قورس و قەڵەو. تین و توانای لاویەتی بۆ گیانی برایمۆک دەگەڕێتەوە. دەیخاتە سەر شانی و هەڵدێ. دەیرفێنێ...

ژنەکە گوتبووی: « کارێک دەکا کە ساڵانێک لەوە بەر، ئەو دەمە کە لاو بوو دەبوو بیکردایە.» ئەوسا سەیری پیاوەکەیتری کردبوو. ئەویش سەری بۆ لەقاندبوو. دەرهێنەر گوتبووی: « مەحشەرە...»

برایمۆک تا قۆخەکەی خۆی پەریخان دانانێ. لەوێ لە سەر بەردە نوێژی پاڵکانی و ئەستێرەکە رایدەکێشێ. دوا سالانێک یەکەمجارە دەیبینێ. بەژن و بالا و روخساری... بلۆق هەموو دەست و پەل و روخساریان داپۆشیوە. چرچ و لۆچی پیریەتیان شاردووەتەوە. پێڵوەکانی لە سەر یەکتر نیشتوون. هەناسەی کزی سوارە. برایمۆک بە بیریدا دێ کە دەبێ جلەکانی لە بەر داکەنێ. ئەو بیرە موچرکەی بە لەشدا دێنێ. ناچارە، دەبێ جلەکانی لە بەر دادڕێ. دەست بۆ سنگ و بەرۆکی کراسەکەی دەبا. دەستەکانی دەلەرزن. ئەژنۆشی دەلەرزێ. شەرم تەنگەی پێ هەڵدەچنێ. چاوی دەقووچێنێ و، کوێرە کوێر رووتی دەکاتەوە.

لە ئەستێرەکەی هەڵدەکێشێ. ئاوی روونی ئەستێر خۆڵو دووکەڵی لەشی دەشواتەوە. بۆ دەرکێشانەوەی لە ئەستێرەکە ناچارە چاوی هەڵێنێ. چاو هەڵدێنێ. لەشی سپی و نەرم و شلی پەریخان لە سەر بەردە نوێژەکە رادەکێشێتەوە. ئەمە هەر ئەو لەشەیە کە سالانێک غیرەتی بیر لێکردنەوەی نەبووە؟ گورج رووی لێ وەردەگێڕێ و دەڕوا، لەقۆخەکەی کراس و پانتۆلێکی خۆی بۆ دێنێ. بە مێزەرەکەی سەر و قژی بۆ وشک دەکاتەوە. بسکی بە مێزەرەکەوە دێ. پەریخان سەری دەڕووتێتەوە. جاروبارە کۆخەیەک سەرو سنگی هەڵدەتەکێنێ و، کێم و خوێن بە لا لێویەوە دەزوولە دەبەستێ...

ئەم دیمەنانە بە شێوەی فلاشبەک دەگێڕدرێنەوە. چیرۆکەکە لەوێوە دەست پێدەکا کە برایمۆک لە لووتکەی شاخێکی بڵیند لە مابەینی دوو دار بەڕوودا جیلانەی هەڵبەستووە. دۆشەکێکی هەرزنیشی راخستووە و، پەریخانی لە سەر راکێشاوە. ئاخر رۆژی رووداوەکەیە. سێ یان چوار رۆژ دوا کارەساتی بۆمبارانەکە و... برایمۆک نەوەک لە ترسی شالاوی ژارە شیمیاییەکە، بەڵکو لە ترسی حەقدار و کەس و کاری پەریخان زۆر لە قۆخەکەی بەند نابێ. دوا شتنی پەریخان بارو بنەیدەپێچێتەوە. تایەک هەرزن و شرو شاتاڵەکەی لە پشتی وڵاخێک دەبەستێ. لە ناو باردا لێفە شڕێک رادەخاو، پەریخانی لە سەر رادەکێشێ. ئەوسا بە بڵیندترین شاخی ئەو ناوەدا هەڵدەگەڕێ.

له چیرۆکەکەدا پەریخان بۆ ساتێکیش هۆش خـۆی نەهاتووەتـەوە. برایمۆک شەوو ڕۆژ جیلانەی ڕاژەندووە و، بـە سـۆز و خەمـەوە کۆنـە گۆرانیەکی دڵداری چڕیوە. جاروبارە مێزەرەکەی تەڕ کردووە و، کێم و خوێنی برینەکانی لەشی پەریخانی خاوێن کردووەتەوە.

دەرهێنـەر گوتبـووی: «لـە فیلمەکـەدا برایمـۆکیش تـووش دەبـێ. هەناسە و، زووخاوی برینـەکانی پـەریخان تووشـی دەکـا. وردە وردە هەموو لەشی وەخارشت دەکەوێ. وەها کە چنگنە لێـی دابـێ. بلـۆق بـە پێستە بە هەتاو برژاوەکەیدا هەڵدەپەڕێ و، هەناسـەی...» گوتبـووی: « فیلمەکە بە مردنی هاوکاتی ئەو دوو پیرە دڵدارە کۆتایی دێ. کۆتاییەکی تاڵـە، بـەڵام مەحـشەرە...» ئەوسـا لـە ژن و پیـاوە هاوڕێکـەی ورد بووبووەوە. ئەوانیش سەری ڕەزامەندی و مەحشەربوونیان
بۆ لەقاندبوو. لە ئەو ورد بووبووەوە. ئەو هیچی نەگوتبوو. ئـەو پێـشتر قـسەکانی کردبـوو. دەربـارەی چیرۆکەکـە و، دەربـارەی دەرهێنـانی سینەمایی و...، گوتبووی دەبـێ سـیناریۆکە ببینـێ. ژن و دوو پیاوەکـە هەستا بوون بڕۆن. دەرهێنەر گوتبووی:«دەمەوێ کەمێک بە ناو شاردا بگەڕێم.» لەویشی گێڕابووەوە.
ئەو داوای لێبوردنی کردبوو. گوتبـووی قـەرارە کەسـێک بێـت بـۆ لای. ئەوسا میوانەکان ماڵاواییان کردبوو. ئەو تـا دەرەوە بـەرێی کردبـوون. کـە هاتـەوە هێـشتا خـەمی یـادەوەری ئـەو چیرۆکـە تاڵـە، لـە نیگـا و روخساریدا بوو. سـەیری مـنی کـرد. منـیش خـەمبار بـووم. گـوتی: « پێموانەبوو ئاوا بە وردی چیرۆکەکەی برایمۆک و پـەریخان بگێڕێتـەوە. تێناگەم ئەو ئێپیزۆدە زیادیە چ پەیوەندیەکی بـەم چیرۆکـەوە هەیـە کـە خەریکە دەینووسی؟ »

من بیرم کردەوە، ئایا چیرۆکی برایمۆک و پـەریخان پەیوەنـدی بـە چیرۆکی ئەوەوە، کە من خـەریکی نووسـینی بـووم، نیـە؟ پرسـیارەکەم دووبارە کردەوە، گوتم: « بە ڕاست قەرارە کەسێک بێت بۆ لات؟ لـەیلا؟ »

ئەو داچڵەکی. گوتی: « بۆ ئیمڕۆ چەند شەنبەیە؟ »

گوتم: « چوار شەنبە.»

لەیلا چەند ڕۆژ لەمەبەر تەلەفوونی بۆ کردبوو. گوتبووی: « ئەگەر له کارت ناکەم، حەز دەکەم دوانیـوەڕۆی ڕۆژی جومعـە بـێم بـۆ لات.»

ئەو گوتبووی: « بەڵام دوانیوەڕۆی ڕۆژانی جومعـە مـن دەڕۆمـە دەر. دەچم بۆ پارکی...» ئەوسـا گوتبـووی: « خۆشـحاڵ دەبم ئەگـەر تـۆش بێیت.» لەیلا گوتبووی: « دێم.»

ئـەو پـشوویەکی هاتـەوە بـەر. زەردەخەنەیـەکی کـرد و گـوتی: « قەرارە من بڕۆم بۆ لای کەسێک.»

پێم ناخۆش بوو. زۆرم پێ ناخۆش بوو. گوتم: « ئەم هات و چـووە زیادیانە لە کارت دەکەن. تۆ دەبـێ بـزانی ماوەیـەکی زۆرت بـۆ تـەواو کردنی...»

چاوەڕوان بووم ئەو قسە بیترسـێنێ، بـەڵام نەترسـا. بـە خەمـەوە سەری لەقانـد و، گـوتی: « دەزانم. دەمـەوێ بـڕۆم بـۆ لای فـەرهاد و، ئەگەر بکرێ دیسان لە گەڵخۆم بیبەمە دەر.»

ئەوسا جگەرەیەکی لە پاکەتی سـەر مێزەکـە دەرهێنـا و، دانیـشت. گوتی:

« پێم ناڵێی فەرهاد چۆنە؟ چەند ڕۆژە سەرم لێ نەداوە.»

گوتم: « چاک نیە. هەرگیز وەک ئـەم چەنـد ڕۆژە شـپرزە نـەبووە. جاران یان رادەکشا، یان لەبەر ڕۆشنایی کـزی پەنجـەرەی ژوورەکـەی دادەنیشت و، سەریبە ملیەوە شۆڕ دەبووەوە. بەڵام ئێستا...»

فەرهاد وەک حەیوانێک هەستی بە بورکانیان بوومەلـەرزە کردبـێ، نائارام و بێقەرار، بە ژوورەکەیدا، بە ناو دووکەڵی جگەرەی من و ئەودا، دەهات و دەچوو، خۆی بە دیـوارە ڕەش و تاریکەکانـدا دەکوتـا. لـە پـڕ شانی ئێسکنی بەر سـەعاتە کـۆن و لـەکار کەوتووەکـەی سـەر سـنگی دیوارەکە کەوت. سەعات زرینگەیەکی لێ بەرز بووەوە و، کەوتە خـوار. ئەو چوو هەڵـیگرتەوە. شیـشە ڕەش و تاریکەکـەی نەشـکابوو، دیـسان هەڵیواسیەوە. فەرهاد گوێی پێنەدا. ئاگای لێنەبوو؟ وەک خەوگەڕی لـەڕ و لاواز و بێتەکان خـۆی بـەملاو لادا دەپەلۆسـی و، پچـڕ پچـڕ ورێنـەی دەکرد. شتێکی دەگوت کە ئەو تێی نەدەگەیشت. من باوەشم پێدا کرد و، بردمـە لای پەنجـەرە بچووکەکـەو دامنیـشاند. خۆشـم دانیـشتم. لـە باوەشـمدا بـوو، هەسـتم بـە لـەرزینی لەشـی کـرد. لێـوە بێرەنـگ و قڵشاوەکانیـشی دەلـەرزین. پێـڵوی چـاوە تۆقاوەکانیـشی. بـە سـنگی

خۆمەوە نووساند. وەک منداڵ، دەستم بە سەرو شانیدا هێنا. گوتم: «خۆزگە دەمزانی چیەتی... خۆزگە دەمزانی کوێی دێشێ.»
ئەو هێشتا لای سەعاتە دیواریەکە راوەستابوو. ئەویش هەموو گیانی دەلەرزی. گوتی: «بلێی ئەم باو گەردەلوولە...»
قسەکەی پێ تەواو نەکرا. گوتی: «نەکا گەڕاندنی بەو کۆڵانە باریک و تەنگەبەرانەدا... نەکا نووسینی چیرۆکەکەی...»
ئەمجارەشقسەکەی تەواو نەکرد. رۆشتە بەر پەنجەرەکە.
«دەترسم ئەم چیرۆکە، چیرۆکی ئەو نەبێ. دەترسم چیرۆکیخۆم بێ... چیرۆکی تۆ... یان هەرکەسێکیتر...»
ئەم باو گەردەلووە بۆ دوایی نەدەهات؟ لەو دیو پەنجەرەی ژوورەکەی فەرهاد، لەو فەزا تاڵ و خۆڵەمێشیەدا، گەڵای درەختەکانی ئەو حەسارە
کە پێشتر گوتبووی بەلامەوە غەریب نیە، بە دەم باو گەردەلوولەکەوە بوون. وەک پۆلە باڵندەیەکی کوێر و سەر لێشێواو، هەر یەکە بە لایەکدا دەفڕین و، لە شوێنێک -لە کوێ؟- دەگیرسانەوە.
ئەم باڵندە کوێر و سەر لێشێواوانە، ئەم رەسمە کۆن و هەڵپڕووکاوانە، ئەم یادە کاڵ و بێرەنگانە، ئەم رۆژە دوور و فەرامۆش کراوانە، ئەم ساتانەی دەم باو گەردەلوول چۆن کۆ دەبنەوە؟ ئەم رووداوە قەوماوو نەقەوماوانە چۆن یەک دەگرنەوە؟ ئەم جەستە پارچەپارچەبووانە چۆن دەبنەوە بە یەک جەستە؟ ئەم زەمەنە پرژو بڵاوانە چۆن دێنەوە سەر هێڵێکی راست؟ ئەم هەموو چیرۆکە فەرامۆشبووانە چۆن وەبیر دێنەوە و، چۆن لە چوارچێوەی چیرۆکێکدا دەنووسرێنەوە؟
گوتی: «چۆن دەکرێ متمانە بەم نووسینە بکەم؟ »
پێشتر نووسیبووی، فەرهاد جەستەیەکی بێگیانە... تەرمێکی بە رواڵەت زیندوو... بەڵام ئەم بێقەراریە کەی لە جەستەیەکی بێگیان دەوەشێتەوە؟ ئەو گوتی یان من؟
گوتی: «بریا بۆ ساتێکیش بووە دەمتوانی سەر لە دنیای ئەو دیو چاوە تۆقاوەکانی فەرهاد خوار بکەمەوە.»

چاوەکانی فەرهاد پڕ بوون لە ترس و، نیگای وەک هەمیشە بە هیچشتێکی ئەم ژوورەوە، بە هیچ شتێکی ئەم دنیایەوە بەند نەدەبوو. بە زۆر جلەکانم بۆ لە بەر کرد و، گوتم: «ئەگەر بە تەمای بیبەیتە دەر، ئامادەیە.»

ئەو لە سەر تا پێی ورد بووەوە. جلەکانی فەرهاد وەک جاری پێشوو پیس و ڕەنگاوی نەبوون. گوتی: «کێ جلو بەرگی بۆ دەشوا. کاڵێ؟ »

من پێکەنیم. گوتم: «کاڵێ کچێکی سەیرە. هەموو جارێک کە جلووبەرگی بۆ دەشواو، ماڵەکەی بۆ خاوێن دەکاتەوە، بە پیرێژنی خاوەن ماڵ دەڵێ:

لای فەرهاد باسی مەکە. تکای لێدەکا: بڵێ بۆ خۆم بۆم شتووی.»

گوتی: «بۆ لە فەرهادی دەشارێتەوە؟ »

بەرزتر پێکەنیم. گوتم: «سەیرەکە لەوەدایە کە لێی ناشارێتەوە.»

گوتم: «گەمەیەکیبە ڕواڵەت منداڵانەیە. کاتێک فەرهاد دەڕواتە دەر، کاڵێ هەموو کارەکانی بۆ دەکاو، کە فەرهاد دەگەڕێتەوە، بە شەرمێکی درۆزنانەوە سوپاس لە پیرێژن دەکا. ئەوسا تاوێکیتر، یان ڕۆژێکیتر کە فەرهاد و کاڵێ یەک دەگرنەوە بەو گەمەیە پێدەکەنن.»

ئەویش پێکەنی و، گوتی: «کاڵێ کچێکی زیرەکە. ڕەنگە بەو شێوە بیەوێ...»

قسەکەم پێبڕی و گوتم: «هیچ زیرەکیەک لە ئارادا نیە. ئەوە گەمەیە و هیچیتر. گەمەیەکی سێ قۆڵی.»

«گەمەیەکی سێ قۆڵی؟ کەواتە پیرێژنیش...»

گوتم: «ئەرێ. پیرێژنیش دەزانێ گەمەیە و، لەزەتی لێ دەبا. دەڵێ: چیم کردووە کوڕم؟ دوو کوت جلم بۆ شتووی و، گەسکێکم بە ژوورەکەتدا هێناوە. کامە دایک ئەوە بۆ کوڕی خۆی ناکا؟ فەرهادیش دەڵێ: سوپاس دایەگیان. پیرێژن لە خۆشی ئەو دایەگیانە گەشکەی لێدێ. فەرهادیش بێدرێغی دووبارەی دەکاتەوە.»

گوتی: «پیرێژن منداڵی نیە؟ »

پیرێژن دوو کچی بە شووی بوو، بەڵام کوڕی نەبوو. نەیبووە؟ ڕەنگە بوو بێتی. ڕەنگە سێ چوار کوڕی بووبێ و، لە منداڵیدا بە

سووریژە مردبێتن. ڕەنگە یەکیان لە سووریژەش خەلستبێ، گەورەش بووبێ، بەڵام دواتر لە گۆمێکدا خنکابێ. یان لە گەڵ باوکیلە شاخێک هەڵدێرابن. یان... هەرچی بوو ئێستا بە تەنها دەژیا. چەند ساڵێک بوو بە تەنها دەژیا و کچەکانی بە خەم و مەینەتی ژیانی خۆیاندا کەوتبوون و، پێیان نەدەکرا بە قەدەر پێویست لای لێبکەنەوە. بەڵام کاڵێ... پیرێژن گوتبووی: ئەگەر کوڕێکی ببوایە کاڵێی لێ مارە دەکرد. بە خەمەوە گوتبووی. وەها کە بووکێکی چاکی لە کیس چووبێ. گوتبووی:

« ئافرەت دەبێ دڵپاک و میهرەبان بێ. کاڵێ جگە لەوەی دڵپاک و میهرەبانە، جوانیشە. ئەگەر ساحیبی ببوایە، باوکێک، براچاکێک... کاڵێ حەیفە خوشکی ڕەحیم تەکەی قومارچیە.» پیرێژن ئەوەی بە فەرهاد گوتبوو. گوتبووی: « ماڵی هەژاریم بە قوڕ گرت...»

فەرهاد گوتبووی: « ماڵی زاڵم. ماڵی حکوومەتی زاڵم بە قوڕ بگرە.»

گوتبووی؟ حەتمەن گوتبووی. لە هەموو شوێنێک و لای هەموو کەس دەیگوت. سەرەتا کاڵێ ئەو قسانەی نەدەبیست. گوێی پێنەدەدا. بەڵام کە زانی فەرهاد، ئەو کرێکارە هەژارە خوێندکار بووە داچڵەکی. تاسا. ماوەیەک لێی ڕاماو، پاشان بەدڵپڕیەوە گوتی: « تۆ خوێندکاری؟ کەواتە من و تۆ...»

فەرهاد نەیهێشت قسەکەی تەواو بکا. لێی چووە پێش، دەستی خستە سەر

دەمی و، گوتی: « گرنگ نیە من کێم و چکارەم. گرنگ ئەوەیە ئێمە یەکترمان خۆش دەوێ. تا هەتا هەتایە...»

نوسیبووی:

تا هەتا هەتایە؟ پرسیارێکی سەختە. سەختتر لەو بڕیارەی ژیانی پیاوی پێوە بەندە. یەکەم جارە لە خۆی دەپرسێت. یەکەم جارە بیر لە ئەنجامی ئەو خۆشەویستی و تووشبوونەی دەکاتەوە. ئەو شەوە و، شەوانی لەوە دواش خەوی لێ ناکەوێت فەرهاد. بە ژوورەکەیدا دێت و دەچێت. گینگڵ دەدات. لە خۆی دەئاڵێت. وەک مار، نەوەک ماری بریندار، وەک پیاوی عاشق. چۆن لە کاڵێ بگەیەنێت ئەم بەڵێنە بە مانای وەدی هاتنی خەونەکانیان نیە؟ خەونەکانی کاڵێ

و... کێ دەزانێت کاڵێ خەون بە چیەوە دەبینێت؟ کێ دەزانێت لە دەروونی ژندا چی رادەبرێت؟ نایدرکێنێت. نەیدرکاندووە کاڵێ. رەنگە چاوەڕێی بیستنی ئەو قسە لە زمانی فەرهاد بوو بێت.

تا هەتا هەتایە. وەلامێکی شیرین. شیرینتر لەوەی ژن بە تەمای بیستنی بووبێت. بیستوویەتی کاڵێ و، ئاخی شیرینی ئارخەیانی وەک کۆترێکی هەمیشە دیل، لە قەفەسی سنگیەوە دەرباز بووە. پێناکەنێت. ناتریقێتەوە. نە ئەو رۆژە و، نە رۆژانی لەوە دواش. خۆی بە چارەنووسی باوەشی فەرهاد دەسپێرێت.

**لە ژوورەکە رۆشتبووینە دەر. لە ژوورەکەی فەرهاد. فەرهاد وەک جارانی پێشوو لە بەرمانەوە دەڕۆیی. هێشتا نائارام بوو. لە کۆلانێکەوە بۆ کۆلانێکیتر و...**

لە کۆلانە تەنگەبەرەکانەوە بەرەو ماڵ دەبێتەوە فەرهاد. هەردوو دەستی ئاخنیوەتە گیرفانەکانی. شەقاوی قورس و قایم هەڵدەهێنێتەوە. شەقاوی دڵنیایی؟ لای خۆی براندوویەتیەوە، بەندبازی پێناکرێت. دەوامەی ئەم وەزعە دەشێ ترسناک بێت. ترسناکە بۆ کاڵێ. ژن ئەگەر دڵ بە خەونەکانی ببەستێت، ئەگەر چارەنووسی بە پیاوەوە گرێ بدات، بە چارەنووسی پیاوەوە، بە چارەنووسی وشەیەکەوە. وشەکان مانای جیاوازیان هەیە لە لای ژن و، لە لای پیاو. بەڵێنەکانیش. دەبێ مانای خۆی لەو بەڵێنە بە کاڵێ بڵێت فەرهاد. دەیڵێت. دەمێکەیە خۆی بۆ ئامادە کردووە. زۆر جار لە بەر خۆیەوە گوتوویە: « کاڵێ، نازدار، راستە دەزانی خوێندکارم، بەڵام نازانی خوێندکارێکی هەڵاتووم و پۆلیس و ساواک لێم دەگەڕێن.» گوتوویە: « مەپرسە تاوانم چیە. تەنها تاوانم ئەوەیە کە ناتوانم خەونەکانت، خەونەکانمان بهێنمە دی. بۆیە دەبێ من و تۆ...» لە بیری چووە دەبێ ئەو و کاڵێ چی بکەن، یان بۆی نەگوتراوە؟ بەڵام ئیمڕۆ دەیڵێت. دەبێ بیڵێت. بڵێت: « کاڵێ، نازدار، دەزانم رۆژانێکی سەخت و رابوردوویەکی تاڵت بووە. دەزانم ئێستاش لە نسێی ئەم خۆشەویستیەدا پشوو دەدەی. نامەوێ، هەرگیز نامەوێ ئەو رابوردووە بگەڕێتەوە و، ئەم خۆشەویستیە بدۆڕێنیت. دەکرێ ئەم دڵداریە بکەیتە هەوێنی ژیانی داهاتووت. ژیان و

داهـاتووی بـەبێ مـن. ژیـان و داهـاتووی...» شـاعیرانەیە ئـەوەی دەیـڵێت. دەزانێـت لـە لای کاڵـێ زمـانی ئـاوا پـاراوو شـاعیرانە بـۆ ناگەڕێت. دەگاتە چوارڕێیانەکە. نازانێت گەیشتووە. بۆنی نـانی تـازە ناکات. نانەواخانەی سەر سووچی کۆڵانەکـەش نابینێت. یـەک، دوو هەنگاو تێدەپەڕێت. نانەواکە هەرای لێدەکات.

« ئیمڕۆ نانت ناوێ کاکە فەرهاد؟ »

ئاوڕی لێ دەداتەوە فەرهاد.

رستەی ئاخری نووسـینەکەی رەش کـردەوە. ویـستی بنووسـێ « نایبیستێت کە ئاوڕی لێ بداتەوە.»

گوتم: « ئاگای لە خۆی نیە. دڵی لە لای کۆترەکانی سەر بانی ماڵـی کاڵێیە.»

ئەو لە بـەر نانەواخانەکـەوە چـاوی بـۆ ماڵـی کاڵـێ گێـڕا. نەیـدی. سەربانەکەشی نەدی. بـەڵام کۆترەکـانی دیکـە بـە ژوور بانەکـەوە، بـە ژوور بانـەکانی کۆڵانـەوە دەفـڕین و دەسـووڕانەوە. کەواتـە رەحیمـی برای کاڵێ لە ماڵەوە بوو. لە سەر بان و، خەریکی کۆتربازی بوو.

فەرهاد نانەکەی وەرگرت و، رێ کەوتەوە. ئەویش شـوێنی کـەوت. ئێـستا ئـەویش مـاڵ بـە ماڵـی کۆڵانەکـەی دەناسـی. یەکـەم مـاڵ ماڵـی دەروێش فەتاح بوو. سێ دەستە ماڵی تووناوتوون لە سـەر حەسـارێکی درێژ و باریک. خەڵکی گـەڕەک پێیـان دەگـوت "دێوانـە". کـە فـەرهادی دەدی دەیگـوت: « پـیری تەریقـەت دەسـت بـە عومرتـەوە بگـرێ. رەسـمێکی حاجی کاک ئەحـمەدی شێخم بـۆ بکێشەوە، بـا بـە دیـواری ژوورەکەمدا، لە مابەینی دەفە و شـمشێرەکان هەڵیواسـم.» هاوڕێکـانی فەرهاد پێیان وابوو ساواکیە. دەیـانگوت: « هـەموو ئـەو ماڵانـە کـە لـە سەرەتای کۆڵانە داخراوەکاندان، ماڵە ساواکین.» چەند مـاڵ بـەولاوەتر ماڵی رەعنا حەوت دەرپێ بوو. سەرەتا فەرهاد پێی وابـوو خـات رەعنـا دەبێ حەوت دەرپێی لە پێدا بێ. یان رۆژێک لە رۆژان حەوت دەرپێی لە پێدا بووبێ. بەڵام دواتر بۆی دەرکەوت خات رەعنا حەوت کچی هەیـە و دەچێتە هەر کوێ دەسـت بـە کڕووزانـەوە دەکـا و دەڵـێ: « مەسـرەف گرانە، دەرەقەت نایەم. خەڵک دەرپێیەک دەکڕن، من دەبێ حەوت دەرپێ بکڕم.» فەرهاد نەیدەزانی بۆ ناڵـێ حـەوت کـراس، یـان حـەوت جـووت

کەوش. بەولاوەتر ماڵی ماشەڵا پۆستچی بوو. ئەو پیرە پیاوە رەقەڵە کە هەموو رۆژێک لە خواجەنشینی بەر دەرکەی ماڵەکەی دادەنیشت. تەنەکە پووتێک ئاگری دەکردەوە و، باوەشی پێدا دەکرد. هاوڕێکانی فەرهاد تێکڕا لە ساواکیبوونی ئەو کۆنە پۆستچیە دڵنیا بوون و لێی تۆقا بوون. بەرامبەر بە ماڵی ماشەڵا، ماڵی خات پەریزاد بوو. ژنێکی رووخۆش و میهرەبان. فەرهاد یەکەم جار کاڵێی لە ماڵی ئەوا دیبوو. دیسان بەولاوەتر، لە پشت دووهەم پێچی کۆڵانەوە ماڵی حاجی شەلە بوو. پیاوێکی گەڕاوە کە سەروو سمێڵی رەنگ دەکرد. برۆکانیشی رەنگ دەکرد. شەوان بە پەیژەدا هەڵدەگەڕا و، خۆی لە ژن و مێردان دادەگرت. دەیانگووت خۆی لە مامۆستای مزگەوتەکەش داگرتووە. کوڕێکی گولەکەی کووڕی بوو پێیان دەگوت حاجی کارلۆس. دز بوو. رۆڵەی لە باوەشی دایکی دەفڕاند و جوڕەی بە حەواوە ناڵ دەکرد. بەڵام وەزەندی بۆ خەڵکی کۆڵان نەبوو. وەستا تورکەی دەلاکیش دراوسێی ماڵی کاڵێ بوو. ژنەکەی شانازی بەوەوە دەکرد کە هەموو کوڕان و پیاوان و، زۆربەی کچان و ژنانی گەڕەک، وەستا خەتێنەی کردبوون. کەسانێکیتریش بوون. بنەماڵەیتریش... کە ئێستا ئەو دەیناسین. ئەو رۆژێک بە منی گوتبوو: « ئەم هەموو ساڵە، بۆچی دەربارەی خەڵکی ئەم کۆڵانە هیچت نەنووسیوە؟ » من گوتبووم: « رەنگە دوا نووسینی چیرۆکی تۆ، چیرۆکی خەڵکی ئەم کۆڵانە بنووسم.» نووسی:

دەنگی کچە تەونکەرەکان لە ژێرخانی ماڵەکانەوە دێت. سۆزی بەرتەونانەیان لە کۆڵان پەنگی خواردووەتەوە. دەیبیستێت فەرهاد. دەنگی کچەکان دەبیستێت و، بە ناو شەپۆلی سۆزی گوتنیاندا تێدەپەڕێت. لە ماڵ نزیک دەبێتەوە فەرهاد. لە دەرکەی چێوی ماڵی پیرێژن و، پەنجەرەی بچووکی ماڵی کاڵێ. برا کوێرەکانی کاڵێ لە بەر دەرکەن. خشپەی پێی دەناسنەوە. دەست لە کاگڵی دیوارەکان دەسوون و، بەرەو پیری دێن. بزەی دێتێ فەرهاد. خۆشەویستی کوڕە کوێرەکان خۆشی دەکات. شوێن خشپەی پێی کەوتوون کوڕە کوێرەکان. بە پێیەوە شەتڵ دەبن. فەرهاد دەست بە سەریاندا دەهێنێت. دەنەوێتەوە و، سەروو نوقڵێکیان دەداتێ. رەحیم لە سەر

بانەوە چاوی لێیە. دەنگ هەڵدەبڕێت: «چێشتەت کردوون کاک فەرهاد.»

رەحیم دەسرەیەکی گەورەی یەزدی بە دەستەوەیە. رایدەوەشێنێت و کۆترەکانی فڕ دەدات. کۆترەکان ماندوو بێمەبەست بە حەواوە دەسووڕێنەوە. بە سەر بانی ماڵی کاڵێ و، بە سەر بانەکانی کۆڵانەوە. لە ترسی هەڕەشەی دەسرەکەی رەحیم ناوێرن بنیشن. خۆشەویستترینیان شاباڵ رەشێکە و، یەک لە دوا یەک سەرمەقولات دەدات. خاوەنەکەی شاد دەکات.

مەرحەبایی رەحیم دەکات فەرهاد. نیگای لە کۆترەکانەوە بۆ ئەو و، لە ویشەوە بۆ پەنجەرەی بچووکی ماڵەکەیان شۆڕ دەبێتەوە. شیشەی پەنجەرەکان رەسمیدیواری کاگڵ و تایەکی دەرکەی چێوی ماڵی پیرێژنیان لە خۆیاندا کێشاوەتەوە. گوڵە هەنارەکە لە ناو تای دەرکەکەدایە. بەرزتر مەرحەبایی رەحیم دەکات. دەستە سپی و ناسکەکە لە پشت پەنجەرەکەو، لە پشت گوڵدان و گوڵە هەنارەکەوە پەردە لادەدات.

رەحیم دەڵێت: «دەڵێن بە تەمای تابلۆیەک لەو کورە کوێرانە بکێشیتەوە.»

هێشتا لە کۆڵانن کورە کوێرەکان. وەک هەمیشە دەست لە ناو دەستی یەکتر. زمانیان دەرکێشاوە و نوقڵەکانیان دەلێسنەوە.

کێ دەڵێت؟ ناپرسێت فەرهاد. کێ گوتوویە؟ ئەو رۆژە کە نەخشی کاڵێی لە قەراغ حەوزەکە کێشاوەتەوە، گوتوویە: «بە تەمام تابلۆیەکیش لەو دوو کورە کلۆڵە بکێشمەوە...» سەیری پەنجەرەکە دەکاتەوە. کاڵێ خۆی پیشان نادات. لێی تۆراوە؟ خەم دایدەگرێت. لە بیری دەچێتەوە بۆچی هاتووەتەوە و، بە تەمایە چی پێ بڵێت. یەک، دوو، سێجار دەرکەی چێوی ماڵی پیرێژن، ماڵیخۆی، دەکوتێت.

رەحیم دەڵێت: «لە کوێی کاک فەرهاد؟ خۆ دەرکەکە دانەخراوە...»

من پێکەنیم. گوتم: «خووی پێگرتووە.»

فـەرهاد تـەریق بـووەوە. بـە نائومێدیـەوە ڕۆشـتە ژوور. ئـەویش شوێنی کەوت و منیش بە دوایاندا. پیرێژن لە حەساری ئـەو دیـو دالانـە تاریکەکە بوو. نەیگوت:

(( خۆ دەرکەکە دانەخرابوو، کوڕم.)) دەمێکە بـوو نەیـدەگوت. گـوتی: (( مەڕۆرە سەر. کارم پێتە کوڕم.))

فەرهاد بێواز بەرەو ڕووی چوو. بۆ حەسارە بچووکەکە و، پیرێـژن پاکەتێکی گەورەی بۆ هێناو، دایە دەستی.

پێش پێی تۆ برادەرە عەینەکیەکەت بۆی هێنای.))

بە نیگەرانیەوە گوتی. فەرهاد تێگەیی. دەیزانی کتێبە. لێی وەرگرت و، گوتی: (( نەدەبوو...))

پیرێژن گوتی: (( دوێشەو لە کوێ بووی؟ بریا لە ماڵ بوویتایە.))

چی ڕووی داوە؟ ئەو نیگای لە پیرێژنەوە بۆ فـەرهاد گوێزایـەوە و، لە منی پرسی: (( چی ڕوویداوە؟ ))

مـن هـیچم نـەگوت. پیرێـژن گـوتی: (( دیـسان شـەڕیان بـووەوە. شەڕێکی قورس. هەموو خەڵکی کۆلانیان سەر ڕژایەوە.))

پیرێژن نەیگوت کێو کێ شەڕیان بووەتەوە و، خەڵکی کۆلانیان سەر ڕژاوە.

فەرهاد تێگەیشتبوو. سـەری لەقانـد و ئـاخێکی سـاردی هەڵکێـشا. ئـەو پرسیارەکەی دووبارە کردەوە: (( چی ڕوویداوە؟ ))

گوتم: (( وەرە سەر با بۆت بگێڕمەوە.))

فەرهاد و پیرێژن قسەیان دەکرد کە ئێمە بە پلیکانەکاندا هەڵـگەڕاین و، خۆمان بە ژووری سـەر حەسـارەکەدا کـرد. ئێـستا ئیتـر ژوورێکـی پۆشتە و پەرداخ بوو. ئەو لە سەر چرپاکەی فەرهاد دانیشت و چاوی لـە دەمم بڕی. گوتم:

(( شەڕو قڕەی کاڵێ و ڕەحیمی برای قسە و هەواڵێکی تـازە نیـە. بـەڵام لـەوەتی فـەرهاد هاتووەتـە ئـەم کۆلانـە، کێـشەی ئـەوانیش پـەرەی سـەندووە. هــەر شــەوە لــە ســەر شــتێک شــەڕیان دەبــێ و پێکــدا هەڵدەپڕژێن. سەرەتا لەسەر ئـەوەی کاڵـێ نەیدەهێـشت لـە ماڵـەکەیاندا قومار بکەن. دواتر گوتبووی، نابـێ بـرادەرە لات و لووتـەکانی ڕەحـیم

بەو ماڵەدا بچن. دوێشەویش پیلەی پێگرتبوو، گوتبووی:
« دەبێ کارێک بدۆزیتەوە و، دەست لە...»
شەڕەکەیان قووڵ بووبووەوە. کاڵێ گوتبووی: « دەڕۆم شکایەتت لێدەکەم و بە گرتت دەدەم.» گوتبووی: « ئەگەر دادم نەپرسن، بەجێتان دێڵم و، سەری خۆم هەڵدەگرم.» بە گریانەوە گوتبووی. ڕەحیم مەست بوو. لێی دابوو. کاڵێ لە ژوورەکە دەرپەڕیبوو. بە پەیژەدا هەڵگەڕابوو. گوتبووی، دەچێ سەری کۆترەکانی هەڵدەکەنێ. ڕەحیم لە پەیژەکە خستبوویە خوار. چەقۆی لێ کێشابوو. ویستبووی بە ورگیدا بکا. دراوسێکان فریا کەوتبوون و، چەقۆکەیان لە دەست دەرهێنا بوو. کاڵێ خۆی ڕنیبوو. گریابوو. کوڕە کوێرەکانیش گریابوون. پیرێژنی خاوەنی ماڵی فەرهاد، کاڵێی بردبووەوە ماڵی خۆی. تا بەیانی لە لای خۆی خەواندبووی...
ئەو گوێی گرتبوو. فرمێسک لە چاویدا پەنگی خواردبووەوە. فەرهاد هێشتا لە حەسار لە لای پیرێژن بوو. ڕەنگە فرمێسک لە چاوی ئەویشدا پەنگی خواردبێتەوە. ئەو هەستا و لە پەنجەرەکەوە سەیری کرد. سەیری پیرێژن و فەرهاد. ئەوسا ئاوڕی لە من دایەوە. گوتی: « باشە بۆ کاڵێ لە فەرهاد تۆراوە؟ بۆ خۆی نیشان فەرهاد نادا؟ »
گوتم: « لە فەرهاد نەتۆراوە. دوێشەو بە شەقی ڕەحیم ژێر چاوی ڕەش بووەتەوە و، ماسیوە. حەز ناکا فەرهاد بەو شێوە بیبینێ.»
ئەوسا هەستام. دەبوو بە شوێن کارێکدا لە ماڵ بڕۆمە دەر. لە ماڵی فەرهاد و، ئەو بەجێبێڵم. گوتم: « من دەڕۆمە دەر. تا دەگەڕێمەوە تۆ بە وردی ڕووداوی ئەو شەوە و، ئەو شەڕ و قڕە بنووسە.»
ئەو هێشتا لە پشت مێزەکەی بوو. لە پشت مێزی ژوورەکەی خۆی و، هێشتا قەڵەمەکەی بە دەستەوە بوو. لە دوا ڕستەی نووسینەکەی ورد بووەوە. نووسیبووی:
ڕەحیم دەڵێت: « لە کوێی کاک فەرهاد؟ خۆ دەرکە دانەخراوە.»

## پانزە

دیسان گڕ و دیسان باو، خەڵوەتی ڕچیوی کۆڵان. دیسان سەمای گڕو با و، قیژەی تیژ و ترسناکی... قیژەی تیژ و ترسناکی کێبوو خەوی شەوانی لێ حەرام کردبوو؟

ئەو بەیانی بەر لە خۆرکەوتن لە خەو ڕاپەڕیبوو. سەرەگێژە و... ماوەیەک بوو جاروبار تووشی سەرەگێژە دەبوو. بەڵام ئەم بەیانیە... سەرەگێژەی خواردنەوەی دوێشەو بوو ڕەنگە. دوێشەو جەلالی هاوڕێی لێرە بوو. بە بۆنەی شەوی یەلداوە، لە ئێوارەوە هاتبوو. بتریەکیشی لە گەڵ خۆی هێنابوو. گوتبووی: «لە درێژترین شەوی ساڵدا هاتووم خەمی ژیانت لەگەڵ بە با دەم.» وەک زۆربەی شەوانی جومعە کە دەهات و خەمی ژیانی لە گەڵ بە با دەدا.

لەو سەری حەسارەوە بە گۆرانی خوێندن هاتبوو. لە ژوورەوە زەبتەکەی دیبوو. پێکەنیبوو، گوتبووی: «وادیارە لەم دوو، سێ حەفتەدا کە من نەهاتووم، هەوێم بە سەر هاتووە. پیرۆزت بێ، خەریکە دەبیبە ماڵ. لەوە ناچێ بە تەمای گەڕانەوە بی.» ئەو گوتبووی: «مێردەکەی

مونیره به دیاری بۆی هێناوم. سێ شریتیشی لە گەڵە. تایەر تۆفیق، عەلی مەردان و، بەنان. کامیانت پێ خۆشە؟ »
« ئیلاهەی ناز.»
دەنگی گەرمی بەنان بە ژوورەکەدا بڵاو بووبووەوە. پیاڵەکان پڕ و خاڵی بووبوونەوە. جەلالی لە گەڵ شریتەکە خوێندبووی: « ای الهە ناز... با دل من بساز... کین غم جانگداز... برود زبرم.» ئەو گوتبووی: « دەمێکەیە گوێم لە دەنگی بەنان نەبووە. لەو دەمەوە کە...»
لە بیری نەمابوو لە کەیەوە. جەلالی لە بیری بوو. ئەو رۆژانە کە بەنان ئیلاهەی نازی دەخوێند و، ئەو بە یادی ئەفسانەوە خۆی رادەژەند.
لە ژوورەکەی ئەو بوون یان لە ماڵی جەلالی؟ دەرکەیان لە سەر خۆیان دادەخست. « با کەمێکیش لە ئەی رەقیب بێینە دەر.» ئەو گوتبووی یان جەلالی؟ جەلالی رۆژانی خۆپیشاندان و رێپێوانەکانیشی لە بیر بوو. ئەو رۆژانە
کە خەڵک بە هەر بیانوویەکەوە دەرژانە ناو شەقامەکان و... هەمیشە بیانوویەک بوو. کوشتارێک لە شارێک دەکرا و، خەڵک نارەزایەتیان دەردەبڕی. بەیانێک
لە سەرکردایەتی شۆڕشەوە دەدراو، خەڵک بە پیریەوە دەچوون. کەس یان کەسانێک شەهید دەبوون و، خەڵک تەرمی شەهیدەکانیان دەخستە سەر شانیان و، بەرەو گۆڕستانیان دەبردن. ئەو لە گەڵ خەڵک بوو. لە ناو خۆپیشاندانەکاندا و، وەک هەمیشە چاوی بە شوێن ئەفسانەوە بوو. جەلالیش...
جەلالی گوتبووی: « سێرۆژانەی شەهیدەکان و حەفتە و چلە و...»
جەلالیحسابی هەموو ئەو رۆژانەی کردبوو کە خەڵک لە ماڵەکانیان دەرژانە دەر. بۆ ناو شەقامەکان و... گوتبووی: « هەموو رۆژێک ژوانت دەبێ. ژوانی شۆڕشگێڕانە.» ئەو شەرمەزار بووبووەوە. شەرمەزار دەبوو. لەو خەڵکە کە گەمەیان بە ژیانیان دەکرد و... لە خۆی. تەنانەت لەنیگای ئەفسانەش. ئەو نەیدەزانی نیگای ئەفسانە سەرکۆنەکەرە یان عاشقانە.

جەلالی ئەفسانەشی لە بیر بوو. کچێک کـە رووپۆشـێکی شـینی لـە بـەردا بـوو، جامانـەی کردبـوو بـە لەچکـە و، لـە هـەموو رێپێـوان و خۆپیشاندانێکدا دەستی هەڵدەبڕی. وەک هـەموو گەنجـەکان سـروودی دەخوێنـد و، کـە رێپێـوانیش دوایـی دەهـات، بـە تـەنها لـە کۆلانـە تەنگەبەرەکانـەوە بـەرە و مـاڵ دەچـووەوە. هـەنگاوی سـووکی هەڵـدەهێنایەوە. جاروبـار بـە بیانوویەکـەوە ئـاوڕی دەدایـەوە و، دووراودوور ئەوی بـەدوای خۆیـەوە دەبـینی. ئـەوو جـەلالی. جـەلالی گوتبووی: « تۆ دەبێ لەوە شەرمەزار بی کە ئەو کچە کلۆڵەت لە گومـان و چاوەڕوانیدا هێشتووەتەوە. دەبێ لەوە شەرمەزار بی کە ناچی...»

ئەو گوتبووی: « رۆژی سەرکەوتنی شۆڕش. ئەو رۆژە دەچم و لە هەر کوێ بێ...»

جەلالی ئەو رۆژەشی لە بیر بوو. ئەو رۆژە کە هەموو خەڵکی شـار رژابوونە دەرو، لە شەقام و مەیدانەکان کۆڕی سەما و هەڵپەڕکێیان ساز کردبـوو. سەرچۆپیکێـشەکان لـە بـری دەسـرۆکە دەمانچـەیان پێبـوو. ناوەناوە بە ئاسـماندا دەیانتەقاند. ئەفسانە و دەستەیەک ژن و کچیتر لە دەوری مەیدانی ئازادی بوون. ئەو دوور لە ئەوان لە سووچی کۆلانێـک راوەستابوو. رۆژێکـی خـۆش بـوو. خۆشـترین رۆژی ژیـانی. جـەلالی گوتبووی: « تۆ سوێندت خواردووە ئیمڕۆ قسەی لە گەڵ بکـەیت.» ئـەو گوتبـووی: «لـە نـاو ئـەو هـەموو خەڵـک و قەرەباڵـغیەدا؟!» جـەلالی هیچیتری نەگوتبوو. چووبووە قەرەباڵغیەکەوە. چووبووە لای دەستەی ژن و کچەکان. چووبووە لای ئەفسانە و، گوتبووی: « خانم ئەو برادەرە کاری پێتە.» بە قامک ئیشارەتی بۆ ئەو کردبوو. ئەو بـەو رۆژە سـاردە هەموو گیانی سـەر ئـارەق نیـشتبوو. ئـەژنۆی لـەرزیبوو. ویـستبووی هەڵێ، بـەلام هەڵـنەهاتبوو، سـەری داخـستبوو. ئەفـسانەش بـە تـرس و شەرم و سەرسووڕمانەوە سەیری ژن و کچەکانی کردبـوو. وەهـا کـە داوای یارمەتیان لێ بکا. گوتبووی: « کاری بە منە؟!» جـەلالی بـە گـران تفی قووت دابووەوە و، گوتبووی: « بەڵێ.»

« بەلام من...»

ئەفسانە نەیزانی دەبێ بڵێ چی. ناچار سەر ڕێ کـەوت. بـە شـەرم و... ئەو دەیدی کە گۆناکانی سوور هەڵگەڕاون. بە ترسـەوە لـەملاولای دەڕوانێ و هەنگاوی سووک... گوتی: « بەڵێ فەرموو.»

ئەو شەپلە لێی دابوو، دەلەرزی. گوتی: « سەلام.»

ئەفـسانە دەبـوو پێبکـەنێ، بـەلام پێنەکـەنی. جـەلالی لـە دوورەوە حەتمەن پێدەکەنی. ئەو گوتی: « من سوێندم خواردووە...»

هەرا هەرای جەماوەر و، دەسرێژی گوللـەی شـادیانە نەیدەهێـشت قسەی یەکتر ببیستن. ئەفسانە گوتی: « دەبێ لە شـوێنێکی چۆڵـتر قـسە بکەین.»

ئەفسانە گوتبووی؟ ئەوسا ڕۆشتبوو. ئەویش شوێنی کەوتبوو.

جەلالی تەواو سەرخۆش بوو. دوا چەند جار ئەمبەراوبەر کردن بـە شریتەکەی بەنان، دەریهێنـابوو. عـەلی مـەردانی لێـدابوو. « پـێم دەڵـێ خالۆ... گوایە من پیرم...»

ئەو تا چێشتەنگاو دوو حەبێژانەسەری خوارد. پاشان بـارام هـات. بارام دەسگایەک کامپیۆتێری بۆ هێنابوو. کـامپیۆتێری کوڕەکـەی بـوو. گوتی: « جگە لە یاری هیچیتری پێناکـا. ئێـستاش کـاتی تاقیکردنـەوەی قوتابخانەیە. واچاکە ماوەیەک لێرە بێ. لە لای تۆ.»

بـارام بـرای چـاک بـوو. زەردەخەنـە و جوولـەی میهرەبانانـەی دەستەکانی دەیانسـەلماند برای چاکە.

« پێموابێ بە کەڵکی تۆ بێ.»

ئەوسا بردیە ژوور و، لە سەر مێزەکەی داینا.

« تەریق دەبمەوە برا نووسەرەکەم کامپیۆتێرێک لە سەر مێزەکـەی نەبێ.»

ئەو گوتی: « من ئەگەر پێویستم بە کامپیۆتێر بێ دەیکڕم.»

بە تووڕەییەوە گوتی. بـارام سـەرخۆی نـەهێنا. گـوتی: « دەزانم. نەتکڕیوە چونکا بە تەمای مانەوە نەبووی.»

بـارام کامپیۆتێرەکـەی لـە بـەرق داو، هەڵـیکرد. چـەپکێک گوڵـی سووردەرکەوت. گوتی: « باسی فرۆشتنی ماڵەکەت بۆ مونیرە کرد؟ »

ئەو باسی کردبوو. بەلام گوتی: « نا، لە بیریشم چووبووەوە.»

بارام پێکەنی. ڕەنگە زانیبێتی درۆ دەکا. دەیزانی ئازاری دەدا. گوتی:
« دەبێ لە دەرفەتێکدا بتبەمە لای دوکتۆرێکی چاک. ئاوا بڕۆیتە پێش تووشی فەرامۆشی دەبی.»
ئەو داچڵەکی. نەیزانی دەبێ چی بڵێ. بارام گوتی: « من دەڕۆم بۆ تاران. سەر لە ماڵی ڕووناکیش دەدەم. تەنانەت ئەگەر مێردە بوغزاویەکەشی لە ماڵ بێ. دەزانم هەواڵی فرۆشتنی ماڵەکە خۆشحاڵیان دەکا. تۆش بە مونیرە بڵێ. بە فرۆشتنی ئەم ماڵو حەسارە هەموومان بە نان و نەوایەک دەگەین. ئەوسا سوێنەی پڕ...»
بارام هەروا کە بە پەلە هاتبوو، بە پەلەش ڕۆیی. ئەو هێشتا سەری دێشا. سەری دێشا؟ ویستی حەبێکیتر بخوا کە زیڕەی تەلەفوونەکەی بیست. بەرزی کردەوە. مونیرە بوو. گوتی: « دەبوو دوێشەو بهاتیتایە. شەوی یەلدا بوو، خۆش بوو پێکەوە بین.»
مونیرە بە گلەیی بوو. گوتی: « خواردنی شەوی یەلدام ساز کردبوو. شووتی و، کۆلێ شەوچەلەم کڕیبوو. نەشمیل بە تەما بوو لە لەیلا بگێڕێتەوە. قەرار بوو ئەگەر تۆ بێی لە بنەماڵەکشی بگێڕینەوە. دایەگەورە و مامە و مامۆژنی...»
ئەو داوای لێبووردنی لێکرد. گوتی: « میوانم بوو.»
نەیگوت جەلالی. مونیرە گوتی: « خۆ ئێستا میوانت نیە. نیوەڕۆ وەرە بۆ ئێرە.»
« بۆچی؟ »
ڕۆژی جومعەیە و حەز دەکەین لانیکەم ئەم نیوەڕۆیە پێکەوە بین.»
جومعە؟ چەند ڕۆژ بوو چاوەڕوانی جومعە بوو، کەچی ئیمڕۆ لە بیری چووبووەوە. ترسا. هێشتا توانجەکەی بارام لە گوێیدا بوو. « ئاوا بڕۆیتە پێش تووشی فەرامۆشی دەبی.» قسەکەی منیشی بیر کەوتەوە. گوتبووم: « کاتێکی زۆرت بۆ تەواو کردنی چیرۆکەکە نەماوە.» بیری هەموو ئەو شەوو ڕۆژانە کەوتەوە کە ترسا بوو وەک فەرهاد...
ئەوە چ قەدەرێکە لێرە هەموو کەس تووشی فەرامۆشی دەبێ، یان بووە. هەموو کەس؟ شەوی ڕابوردوو جەلالی گوتبووی: « منیش تووشی فەرامۆشی بووم.» دەمەو نیوەشەو جەلالی تەواو سەرخۆش

بوو. هەستا بوو بڕوا، ئەو بەری پێگرتبوو. گوتبووی: «چاک نیە بەم حاڵەتەوە بڕۆیتە دەر. دەترسم...» جەلالی هەڵیدابوویە: «من پیاوێکی ژن و منداڵداری عالوو سالم...» وشەکان بەلالێویەوە بەربووبوونەوە. ئەو پێکەنیبوو.

گوتبووی: «تەلەفوون بۆ خێزانت دەکەم. دەڵێم من بە زۆر گلم داوەتەوە.» خێزانی جەلالی ژنێکی خانم و میهرەبانە. لەو ژنانە کە هەرکەس دەیبینێ، دەڵێ: «چەندە لە دایکم دەچێ.»

ئەو تاوی دابووە تەلەفوونەکە. جەلالی نەیهێشتبوو. گوتبووی: «لەم سێ، چوار ساڵەدا کە بوومەتە پیاوی ماڵ، شەو نەبووە لای ژن و منداڵەکەم رۆژم نەکردبێتەوە.» ئەوسا هەستا بوو. لە تری دابوو. ئەو گوتبووی: «ئەی لەوە پێش؟»

«لەوە پێشم لە بیر نەماوە. فەرامۆشم کردووە.»

جەلالی دەمێک ساڵ بوو ژنی هێنابوو. بەلام دەیگوت: «لەوەتی ناتوانم خەیاڵ بکەم و خەون ببینم، هەست دەکەم ژن و سێمنداڵم هەیە» ئەو تێنەگەیشتبوو. من گوتبووم: «تەنها ئەو ژن و پیاوانە کە سالانێک بەبێ عەشق پێکەوە ژیاون تێدەگەن.» منیش سەرخۆش بووم؟

ئەو دەمەونیوەڕۆ چوو بۆ ماڵی مونیرە. پێشتر پێی گوتبوو: «دوانیوەڕۆ دەڕۆم بۆ پارک. قەرارە لەیلاش...» کە هەستا بڕوا، دیسان دووبارەی کردەوە:

«دڵنیای کە دەکرێ لە گەڵ کچێکی گەنج لە پارک پێکەوە بین؟»

مونیرە گوتی: «تا پار و پێرار جاروبار پۆلیس بەری بەو کچ و کوڕانە دەگرت کە کەس و کاری یەکتر نەبوون و پێکەوە دەگەڕان.»

ئەوسا پێکەنی و گوتی: «مەترسە ئێوە گومانی هیچتان لێ ناکرێ.»

ئەو تێگەیشت. پیاوێکی گەڕاوەی وەک ئەو... کێ گومان لە پیاوێکی گەڕاوە دەکا؟ تا گەیشتە پارکەکە چەند جار ئەو پرسیارە تاڵەی دووبارە کردەوە.

«کێگومان لە پیاوێکی...»

پارکەکە بە بەرزاییەکەوە بوو. سالانێک لەمەبەر کاتێک لە گەڵ ئەفسانە هاتبووە ئێرە، درەختەکانی ئەوەندە بەرز و هەڵکشاوو، پاییز

ئەوەندە مات و خەمۆک نەبوو. پاییز؟ ئیمڕۆ یەکەم ڕۆژی زستان بوو. دوێنێ پاییز و ئیمڕۆ زستان، بەڵام هیچ شتێک نەگۆڕابوو. بە یەکێک لە شەقامە بەرتەسکەکاندا بەرەو بڵێندایی پارکەکە هەڵگەڕا. ماندوو بووبوو. لە سەر کورسیەکی سیمانی دانیشت و جگەرەیەکی داگیرساند. شار لەو خواریەوە سەرنجی نەقۆستەوە. شەقامە بەرتەسکەکە و، درەختەکانی ئەمبەراوبەری، تیژ بەرەو ئەو هەڵدەکشان و، ریزی بنە گوڵە وشکەکان و، سەوزە و چیمەنی پێخوست و، گەڵای وشک و وەریوی ناو جۆگەلە سیمانیەکان... میراتی پاییز لە هەموو لایەکەوە لە ئەو ورد بووبووەوە.

لە ئەو و، لەو ژن و پیاوانە کە تاک و تەرا، دووراو دوور لە سەر کورسیە رەق و ساردە سیمانیەکان دانیشتبوون. یان بە ناو درەختە رووتەکاندا پیاسەیان دەکرد.

ئەو مژێکی قووڵی لە جگەرەکەی داو، نیگای چاوەڕوانی بە سەرەو لێژی شەقامەکەدا شۆڕ کردەوە. چاوەڕوان؟ لەیلای لە خوار شەقامەکە دی. گورج و خێرا دەهات. دەتگوت کەسێکی بە شوێنەوەیە. وەک ئەفسانە کە گورج و خێرا دەهات و ئەو دەیزانی ناسری بە شوێنەوە بووە. ناسری کە سوار پژۆیەکی سەوزی مودێل باڵا دەبوو، جاروبارەیش لە کۆشکی لاوان تاری دەژەند.

ئەفسانە دەیگوت: «واز ناهێنێ. هەموو ڕۆژێک شوێنم دەکەوێ. هەموو شەوێک کەسێک دەنێرێتە خوازبێنیم. دەترسم ئاخرەکەی...» ئەو توورە دەبوو. هەڵدەچوو. دەیگوت: «دەڵێم ڕۆژێک لە ناوەراستی شەقامدا بەری پێبگرن، لە ئوتومبێلەکەی بیهێننە خوار و، کام لات دێشێ... بیکوتن.» ئەفسانە دەترسا. دەترسا و پێدەکەنی. دەیگوت: «بە شەڕ و لێدان ناکرێ. خەڵک پێدەزانن و حەیامان دەچێ.» ئەو دەیگوت: «چەند هاوڕێی چەکدارم هەیە. دەڵێم شەوێک بڕۆنە گیانی و... بیتۆقێنن. ئەو بێچووە سەرمایەدارە و، هاوڕێکانم...» ئەفسانە دەیگوت...

لە بیری نەماوە ئەفسانە چی گوتبوو. ڕەنگە گوتبێتی: «خۆشەویستی چ پەیوەندیەکی بە کوڕە هەژار و کوڕە سەرمایەدارەوە

هەیە؟! خۆ تۆش کوڕە هەژار نیت. دەڵێن باوکت...» یـان ڕەنگـە هیچـی نەگوتبێ.

لــەیلا لێــی نزیــک بــووەوە. هێــشتا نەیگەیــشتبوویە، بــەدەم زەردەخەنەیەکەوە دەستی لە ژێر چارشێوە ڕەشەکەی دەرهێنا و، لێـی ڕاتەکاند. ئەفسانە چارشێوی ڕەشی بە سەردا نەدەدا. مانتۆی شینی لـە بەر دەکرد و، جامانەی دەکردە لەچکە. لـەیلا گەیـشتە لای. کوڵـمەکانی سـوور هەڵـگەڕابوون و چـاوە گەشـەکانی دەدرەوشـانەوە. گـوتی: « ببوورە. دەزانم موزاحیمم. دەزانم حەزت کردووە بە تەنها بی. بە تەنها لە گەڵ بیرەوەریەکانی رابوردووت...»

لە گەڵ بیرەوەریـەکانی ڕابـوردوو؟ ئـەو بـیری کـردەوە، ئەفسانە ساڵانێک بوو لە ژێر خاکدا بوو. نـەوەک لـەم شـارە. لـە شـارێکیتر. لـە تاران. بۆیە زەردەخەنەیەکی تاڵی کرد. لەیلا چاوی بەملاولادا گێـڕا. لـە بـەرزترین شـوێنی شـار بـوو. پێـشتر هـاتبووە ئێـرە؟ لـەو خواریـەوە ماڵەکان، شەقامەکان و، تەنانـەت ئـەو ئوتومبێلانـە کـە بـە شـەقامەکاندا تێدەپەڕین دیار بوون. دەتگوت سوار تەیارە بووە و بـە ئاسـمانەوەیە. ترسـا. زەردەخەنەکـەی سـەر لێـوی کـاڵ بـووەوە. دەتگـوت خەریکـە بەردەبێتەوە و، دەکەوێتە خوار. لە ژێر پێیـدا هەسـتی بـە هـیچ نـەکرد. دانیشت. لە سەر کورسیە سـیمانیەکە و، بـەرە دەسـتی لـە قەراغـەکانی توند کرد. سەرما و قـایمی سـیمانەکە دڵـنیایی بـۆ گەڕانـدەوە. ئـاهێکی خۆشی هاتێ. گوتی:

« ئێرە شوێنێکی زۆر خۆشە، بەڵام...»

ئەوسا هەناسەیەکی قووڵی کێشاو، ماندوو بوونی پێ ئاشکرا کـرد. هەموو وزەی خۆی کۆ کردبـووەوە کـە بـە سـەر ترسـەکەیدا زاڵ بـێ. گوتی: « لە بیری چیدا بووی؟ »

ئەو هیچی نەگوت. یان شتێکی گوت کە پەیوەندی بـە پرسـیارەکەی لەیلاوە نەبوو. لە پەنایدا دانیشتبوو. باسـکی خـستبووە سـەر پاڵپـشتی سـیمانی کورسـیەکە. لــە ڕوومەتــە ســەرما گەســتەکەی لــەیلا ورد بووبــووەوە. زەردەخەنــە هێــشتا ڕوومەتــە ســوور و ســپیەکەی نەخــشاندبوو. بــەڵام تــرس و... تــرس؟ شــەرم و دڵــەڕاوکەی پــێ نەدەشاردرایەوە. ئـەو چـاوی لـێ نەدەترووکانـد. نیگـای قـورس بـوو.

ڕوخساری لەیلا بە نیگای قورسی پیاوێکی گەڕاوە ڕانەهاتبوو. ئەو تێگەیی. سەری وەرسووڕاند و، لە بەرامبەری ڕوانی. لە باریکە شەقامەکەوە... کەسی پێدا نەدەهات. جگەرەیەکیتری داگیرساند. لەیلاش داوای جگەرەی لێکرد. بە شەرمەوە. ئەو یەکەم جار بوو دەیدی لەیلا جگەرە دەکێشی. گوتی...

لەیلا نەیهێشت قسە بکا. گوتی: « تاک و تەرا. ئەویش بە دزیەوە.»

ئەوسا هەستا. هەستان. دوو بە دوو شان بە شانی یەکتر بە شەقامی سەر تەختاوکەکەدا، بە قەراغ بنە گوڵە وشکەکان و، درەختە ڕووتەکاندا، ئارام و
بە کاوە خۆ ڕێکەوتن. چی بڵێن؟ هیچیان قسەیان بۆ گوتن پێنەبوو. یان...

« تارایەکی زەرد... چەپکێ گوڵی سیس... گۆنای تەڕ کردم، فرمێسکی پاییز.»

گوتی: « فولکلۆرە؟ »

لەیلا لای لێکردەوە. زەردەخەنە هەمیشەییەکە و... ئەو تێگەیی. بۆ دەبێ کچێکی گەنجی وەک لەیلا باسی تارای زەرد و گوڵی سیس بکا؟ گوتی:

« تۆ دەتوانی لەمانە شادتر شێعر بڵێی. تۆ هێشتا لە سەرەتای ژیان و لاوەتیدای. ئەم قسانە قسەی کەسی چیرۆکەکانی منن. ئەو کەسانە کە ژیان و لاوەتیان...»

لەیلا ڕاوەستا. چەند هەنگاو بەولاوەتر، ئەویش ڕاوەستا و ئاوڕی دایەوە.

« قسەیەکی خراپم کرد؟ »

لەیلا نەیبیست. ئەو هەردوو دەستی ئاخنیبووە گیرفانی پاڵتۆکەی و، ملپێچێکی خوری شینی بەملاو لای شانیدا بەردابووەوە. لە چاوی لەیلاوە پیاوێکی ئارام و بە ویقار، بەڵام نیگەران و خەمۆک بوو. لێی ڕاما. بیری کردەوە، « میهرەبان بۆ لای کەسایەتی چیرۆکەکانی گەڕاوەتەوە.» نیگای بێئیختیار لە ئەوەوە بۆ زەمینەکەی پشتی، بۆ دەشتێکی یەکپارچە زەرد لە خوار پارکەکەوە و، شاخێکی خۆڵەمێشی دوور و، ئاسمانێکی گرژ و مۆن فڕی. ڕوانگەیەکیسارد و تاڵ بوو. تاڵتر

لەو بەیتە شێعرە کە چەند ساڵ لەمەبەر بە بۆنەیەکەوە گوتبووی. بە چ بۆنەیەکەوە؟ گوتی: « دەتەوێ بڵێی کچێکیلاوی وەک من ناتوانێ کەسی چیرۆکەکانی تۆ بێ؟ »

بۆ دەیپرسی؟ ئەو چەند هەنگاوەکە گەڕایەوە. بەرەو رووی لەیلاو، ئێستا ئیتر بە تەواوی لێی نزیک بووبووەوە. لە بەرامبەری راوەستابوو. لە چاوەکانیورد بووبووەوە. چاوەکان پڕ پرسیار و نیگەران، بیلبیلەکان لە سپیەنەیەکی تۆخ سپیدا و، نیگای ئەو بە سەر گۆناکانیدا خزی. گۆنای سوور و سپی وەک پەڕەی گوڵەباخ ناسک بوون. لێوەکانیشیدەلەرزین. رەنگە لەشیشی لەرزیبێ. لەشێک کە ئامادە بوو خۆی بە باوەشی ئەو بسپێرێ و، ئەو هێشتا دەستەکانی لە گیرفانی پاڵتۆکەی ئاخنیبوو.

لەیلا پرسیارەکەی دووبارە کردەوە. ئەمجارە بە شەرم و پەروایەکی زیاترەوە گوتی: « من ناتوانم کەسی چیرۆکەکانت بم؟ ئەو چیرۆکە تازانە کە لەمەدوا دەیاننووسی؟ »

ئەو گوتی: « نا...»

تاڵ و جیدی گوتی. بە خەم و حەسرەتەوە. گوتی: « من دەرفەتێکیزۆرم بۆ نووسینی چیرۆکی تازە نەماوە. تەنها دەتوانم بە چیرۆکە کۆنەکانمدا بێمەوە. یان چیرۆکە کۆنە نەنووسراوەکانم بنووسم.»

ئەو هەروا لە روومەتی لەیلا ورد بووبووەوە. بیلبیلەکان لە سپیەنەیەکی تەڕ و، تۆخ سپیدا... لە پشت ئەو روومەتەوە نیگای بۆ شار گوێزایەوە. بۆ قەرەباڵغی و هەرا و هوریای نەدیوی ماڵ و کۆڵان و شەقامەکانی شار. لەیلا هێشتا لە بەرامبەریدا بوو. نزیک، ئەوەندە نزیک کەپیرە پیاوێکیتەنها کە لە باریکە شەقامەکەوە تێدەپەڕی، بۆ ئەوەی لە یەکتر جیایان بکاتەوە، کۆکی.

ئەوان سەر رێ کەوتبوونەوە. دیسان شان بە شانی یەکتر، بە قەراغ درەختەکان و بنە گوڵە وشکەڵەکاندا گەڕابوون و، ئێستا لە سەر کورسیە سیمانیەکە دانیشتبوونەوە. هەوا سارد بوو. بە تایبەت لەو بەرزاییە و، ئەو لەو سەرمایەدا چیرۆکی فەرهاد و کاڵێی بۆ لەیلا دەگێڕایەوە. یەکەمجار بوو دەربارەی چیرۆکەکە و، دەربارەی فەرهاد و کاڵێ بۆ کەسێک دەدوا. گوتی:

« قەدەرێکی سەیرە. قەدەرێکی نەگۆڕ. ئەوان دەبێ لە یەکتر جیا ببنەوە. لە یەکتر هەڵبڕێن و، هەریەکە شوێن چارەنووسی خۆیان کەون. مـن بـە چارەنووسی فەرهاد دەزانم. فەرهاد خوێندکارێکی هەڵاتووە و پۆلیس و ساواک لێی دەگەڕێن. دڵنیام ئیمڕۆ یان سبەینێ دەیگرن و...»

لەیلا گوتی: « ئەی کاڵێ. کاڵێ چی بەسەر دێ؟ »

« هێشتا نازانم. مـن چیرۆکـی کاڵـێ ڕۆژ بـە ڕۆژ دەنووسـم. واتـە تەنها ئاگاداری ئیمڕۆیم و، لـە سـبەینێی بێخەبـەرم. وەک خـۆی کـە لـە ئیمڕۆیدا دەژی و، ئاگای لە سبەینێی نیە.»

هەمیشە وابووە. ژنان لە ئیمڕۆ و ئێستایاندا ژیـاون و، ئاگایـان لـە سبەینێ و داهاتوویان نەبووە.

« بـە پێچەوانـەی پیاوانـەوە. پیـاوان لانیکـەم دەزانـن کـە سـبەینێ دەگیرێن، دەکوژرێن، یان تووشی فەرامۆشی دەبن.»

لەیلا گوتی؟

سەرما زۆری هێنابوو. ئەوان هەستان و بـە سـەرەو لێژی باریکـە شەقامەکەدا داگەڕان.

شانزە

لەوەتی هاتبووەوە پەستا پەستا دەیگوت: «دوو سێ مانگ زۆر کەمە. دەترسم فریا نەکەوم.»

فریای چی؟ نەمدەپرسی، دەمزانی. دوو حەفتە لە یەکەم هاتنی فەرمانبەرەکانی بانک تێپەڕیبوو، ئەو هێشتا مەسەلەکەی بە جیدی وەرنەگرتبوو. مەسەلەی فرۆشتنی ماڵ و حەسارەکە و... تەنانەت لە بیریشی چووبووەوە. تەنها جاروبار کە قسەی لێکرابوو، بارام باسی کردبوو یان مونیرە و مێردەکەی... بیری کەوتبووەوە. ترسا بوو. بەڵام دیسان لە بیری چووبووەوە. دەتگوت بە ئەنقەست لە بیر خۆی دەباتەوە. بە پێچەوانەی ئەوەوە، بارام

لە هەموو ئەم ماوەدا دەستی لە ماڵ و منداڵ و کار و کارخانەی هەڵگرتبوو.

بە فرۆشتنی ماڵ و حەسارەکەوە نووسابوو.

دەبوو بیزانیایە... ئەو ئەگەر تا ئەو رادەیە بە نیسبەت رووداوەکانی دەورووبەریەوە بێمەبالات نەبوایە، دەبوو بیزانیایە. بارام جارێکیتریش فەرمانبەرەکانی بانکی لە گەڵ خۆی هێنابووەوە. ئەمجارە خۆمانە و سەمیمیتر بوون. بارام باسی کۆنی ماڵەکەو دەرکەو پەنجەرە و گەچبڕیەکانی بۆ نەکردبوون و، ئەوانیش قسەیان لە رووخاندنی نەکردبوو. ماڵ و حەسارەکەیان میترپێو کردبوو، میوە و شیرینیان خواردبوو، رۆشتبوون. بۆ سبەینێدا بارامیش چووبوو بۆ تاران. لە تاران دوا چەند ساڵ دووری و دەنگ دابڕان، چووبوو بۆ ماڵی رووناک. دوای ئەوە کە گەڕابووەوە چووبوو بۆلای مونیرەش. بۆ سەر گۆڕی باوک و دایکیشی. گوایە سپاردبووی کێلێکی تازەش بۆ گۆڕی باوکی ساز بکەن. بارام ئەم هەموو کارەی لەم ماوەدا کردبوو. بەڵام ئەو...

ئەو هەموو ئەم ماوە لە بیری فەرهاد و کاڵێدا بوو. لە بیری ئەفسانە و...

ئیمڕۆ رووناکی خوشکی لە تاران هاتبووەوە. دوا چەند ساڵ بە بۆنەی... ئەو نەیدەزانی بە بۆنەی چیەوە. ئەوەندەی دەزانی کە ئێستا هەموویان لە ماڵی مونیرە بوون و سبەی شەو لەماڵی ئەو... ماڵی ئەو؟ لە ماڵی میرزا سەعیدیباوکیان کۆ دەبوونەوە. هەر چوار خوشک و برا

له دەوری سفرەیەک، سفرەی ماڵی میرزا سەعید. بە یادی رابوردوو، بە یادی ئەو ساڵانە کە هێشتا میرزا سەعید مابوو، رەعنا خانمی ژنیشی مابوو، کۆ دەبوونەوە. ئەم ئێوارە لە گۆڕستان لە سەر گۆڕی دایک و باوکیان یەکیان گرتبووەوە. فاتیحایەکی بە کۆمەڵیان دادابوو. ئەوسا ئەملاولای یەکتریان ماچ کردبوو. یەکتریان لە باوەش گرتبوو. بە سەر یەکتردا گریابوون. بە سەر ئەویشدا گریابوون. کە ژیر بووبوونەوە، مونیرە گوتبووی: «هەمووومان دەچین بۆ ماڵی ئێمە.» ئەوو رووناک چووبوون. بەڵام بارام و ژن و منداڵەکەی... بارام و ژن و منداڵەکەی دوا نان خواردن هاتبوون. گوتبوویان: «هەرچیمان کرد لە ماڵەوە خۆمان پێ نەگیرا. ئێوە لێرە لە دەوری یەکتر کۆ بووبێتنەوە و ئێمەش بە تەنها...»

بارام گوتی: «دوا مەرگی باوکم ئیمشەو یەکەم شەوە هەست بە ئاسوودەیی دەکەم.»

ئاسوودەیی؟ گوتی: «دڵنیام باوک و دایکیشم ئیمشەویان لە هەموو شەوێک خۆشترە. رۆحیان ئاسوودەترە.»

رووناک گوتی: «رۆحیباوک و دایکم...»

مونیرە قسەکەی لێوەرگرت: «رۆحی باوک و دایکم کاتێک ئاسوودە دەبێ کە...»

بارام هەڵیدایە، گوتی: «سبحەی شەو»

گوتی: «سبحەی شەو کە لە ماڵی خۆمان کۆ بووینەوە، هەموو قسەیەک و بە تایبەت ئەو قسەش دەبڕێنینەوە.»

کامە قسە؟ هەر سێکیان لە ئەویان روانی. بە زەردەخەنەوە... میهرەبان بوون. هەموویان میهرەبان بوون. ژن و منداڵەکانی بارام. مێرد و کچەکەی مونیرە و... رووناک بە تەنها، بە بێ مێرد و منداڵەکانی هاتبووەوە. مێردەکەی گوتبووی، لە بەر دەرس و قوتابخانەی منداڵەکان ناتوانێ بێ. داوای لێبووردنی کردبوو. لە هەموویان و، بە تایبەت لە بارام. گوتبووی کە دەرفەتێکی
بۆ بڕەخسێ، دێ و درێژە بە یاری نیوەتەواوی شاترینجەکەی لە گەڵ بارام دەدا. ماوەیەک لەوە بەر، شەوێک کە بارام لە تاران چووبوو بۆ ماڵیان دەستیان بەو یاریە کردبوو. دەمەو نیوەشەو، کاتێک لە دەمە قڕە

و بۆڵــه و بناشــتی چه‌نــد ساڵــه‌یان بووبوونــه‌وه و، لــه گــه‌ڵ یــه‌کتر رێکه‌وتبوون. شاترینجه‌که‌یان هێنابووه پێش و داشه‌کانیان چنیبوو. ئه‌و شه‌وه بارام له تارانه‌وه ته‌له‌فوونی بۆ ئه‌و کردبوو. گوتبووی: «له ماڵی رووناکم. مێردو منداڵه‌کانیشی لێت ده‌پرسن.» ئه‌و به سه‌رسوورمانه‌وه گوتبووی: «ماڵی رووناک؟! خۆ تۆ و مێردی رووناک...» نه‌یگوتبوو خۆ تۆ و مێردی رووناک شیرو تیرتان له یه‌ک ده‌سوو...

رۆژی دوایی بارام له تاران گه‌ڕابووه‌وه. لـه رێـوه هـاتبوو بـۆلای ئه‌وو، گوتبووی: «سه‌گباب مێردی رووناک، که بیـستی بانـک بۆکـڕینی ئه‌م ماڵ و حه‌ساره چه‌نده‌مان ده‌داتێ، بوو به پیـاوێکیتر. پیاوێـک جگـه لـه‌و پیـاوه کـه لـه‌م هـه‌موو ساڵـه‌دا ناسـیومانه.» بـه‌ڵام ئـه‌و مێـردی رووناکینه‌ده‌ناسی. هه‌رگیز نه‌یدیبوو. تا ئـه‌و رۆژه کـه گـه‌ڕابووه‌وه و، چه‌ند شه‌وێک له تاران له ماڵیان مابووه‌وه. مێردی رووناک پیاوێکی بـه رواڵه‌ت ئه‌هوه‌ند و له سه‌رخۆ بوو. فه‌رمانبـه‌رێک کـه سـه‌ری بـه کـارو ژیانی خۆیه‌وه قاڵ بوو. رووناک ده‌یگوت:
«پیاوێکی خراپ نیه.» به‌ڵام بارام ده‌یگوت:«له بنه‌وه بڕه‌یه. ئاگری ژێر کایه.» بارام گوتبووی: «تۆ چیت کردووه؟ مونیره‌ت دواندووه؟ باسـی فرۆشتنی ماڵوحه‌ساره‌که‌ت بۆ کردووه؟ » ئه‌و دیسان گوتبـووی: «نـا، لــه بـیرم چووبـووه‌وه.» ئــه‌و ئــه‌مجاره درۆی نــه‌کردبوو. بـاراميش خۆشحاڵ له سـه‌رکه‌وتنه‌که‌ی تـارانی، نـه‌یگوتبوو ده‌بـێ خـۆت پیـشان دوکتۆر بده‌ی. نه‌یگوتبوو ئاوا بڕۆیته پـێش تووشـی فه‌رامۆشـی ده‌بی. گوتبووی: «گوێ مه‌ده‌رێ. واچاکه خۆم بچمه ماڵی و ئاشتی بکه‌مـه‌وه. چاک نیه خوشک و برا له گه‌ڵ یه‌کتر...» ئه‌وسا وه‌ک هـه‌موو جـارێکیتر چووبـوو، لـه به‌رامبـه‌ر ره‌ســمه‌که‌ی مـیرزا ســه‌عید بـه ســه‌ر ســنگی دیواره‌که‌وه راوه‌ستابوو. میرزا سه‌عید هیچی نه‌گوتبوو. ماوه‌یه‌ک بـوو میرزا ســه‌عید هیچینــه‌ده‌گوت. لــه‌وه‌تی ره‌عناخـانمی ژنی مردبـوو، بـه که‌می ده‌دوا. که ده‌هاته‌وه بۆ ماڵ، که ده‌رکه‌ی حه‌ساری ده‌کرده‌وه، بێ ئــه‌وه‌ی وه‌ک جــاران بڕواتــه نــاو باخچه‌کــه و، ریــزی گوڵــه ره‌نگــاو ره‌نگه‌کان، بێ ئه‌وه‌ی چاو به گوڵدانه‌کانی ده‌وری حه‌وزه‌که‌دا بخشێنێ، یه‌کــه‌وڕێ ده‌چــووه ســه‌ر چرپاکــه‌ی لــه ژێــر ســێبه‌ری دره‌ختــه‌کان و، چاوه‌ڕوان ده‌بوو رووناکی کچـی قلیانه‌کـه‌ی بـۆ ئامـاده بکـا. لـه‌وه‌تی

ڕەعناخانم مردبوو، ڕووناک خزمەتی باوکی دەکرد. ئەی دوای ئەوە کە ڕووناک شووی کرد؟ ساڵێک دوا ڕۆشتنی ئەو ڕووناک شووی کردبوو.
مونیرە دەیگوت: « خوشکی بمرێ، بە زۆر بە شوومان دا. بە تەما بوو تا باوکم ماوە...» مونیرە خۆی پێ نەدەگیرا. فرمێسک بە چاویدا دەهاتە خوار. دەیگوت: « ئەو ڕۆژە کە بە بووکی بردیان شینی حەوت برای گێڕا. منیش
لە ئەو خراپتر... ناحەقمان نەبوو. باوکم بۆ دووهەم جار لێی دەقەوما. بۆ دووهەم جار نازی دەشێوا.» ئەو دەیگوت: « ئەی بارام و خێزانی؟ ئەوان خزمەتیان نەدەکرد؟ » مونیرە دەیگوت: « خزمەت؟! کوێراییم دایەت. هیچ کە خزمەتیان نەدەکرد،ئازاریشیان دەدا. دەیانویست بە زیندوویی هەست و نیستی لە چنگ دەربێنن. دووکانەکانیان پێ فرۆشتبوو، دەیانویست ماڵو حەسارەکەشی پێ بفرۆشن. کە باوکم ملی نەدا، ئەوانیش پشتیان تێکرد. گوێیان نەدەدایە. نەیاندەدواند. عەسراو عەسر بۆ خۆم بە دووگیانی دەچووم قلیانەکەم بۆ ساز دەکرد و، پیاڵەیەک چایم دەدایە.» مونیرە دەیگوت: « هەرچی بیری کردەوەی بارام و ژنەکەی لە گەڵ باوکم دەکەومەوە کسپە لە جەرگمەوە دێ. حاشا
نە دەچمە ماڵیان و، نە بێنە ماڵم. هەرگیز لێیان خۆش نابم و لە گەڵیان ئاشت نابمەوە.»
بەڵام ئێستا لێیان خۆش بووبوو، لە گەڵیان ئاشت بووبووەوە. ئێستا هەموویان لە ماڵی مونیرە بوون و، باسی کۆبوونەوەی سبەی شەویان دەکرد.
بارام دەیگوت: « میوانی من دەبن. بەیانی زوو گۆشت و برینج و کەلووپەلی پێویست دەکڕم و، دوانیوەڕۆش خێزانم دەچێ خواردنێکی خۆشمان بۆ ساز دەکا.»
مونیرە گوتی: « نا، براژن بە تەنها پێڕاناگا. من و ڕووناک دەچین و...»
ئەو ملی نەدا. گوتی: « میوانی منن. کەواتە...»
هەموویان پێکەنین: « بەڵێی ئەوەندە ئازا بی و، خواردنی ئەو عالەمەت پێ ساز بکردرێ؟!»

ئەو گوتی: « لە رستووران بۆتان دێنم. پێم خۆشە نمەکی منیش بکەن.»

ئەوان رازی نەدەبوون. دەیانگوت: « عەیبە... داوەشانە...» مێردی مونیرە گوتی: « عەیب ئەوەیە قۆلی لێ هەڵناماڵن و ژنێکی بۆ ناهێنن، عەیب ئەوەیە چۆن هاتووەتەوە هەرواش...» مونیرە نەیهێشت بڵێ هەرواش بگەڕێتەوە. ناچار گوتی: « هەرواش بمێنێتەوە.»

ئەو گوتی: «من بە تەما نیم ژن بێنم.»

بە جیدی گوتی. لانیکەم ئێستا و، ئێستا لە هەمیشە زیاتر بێزی لە خۆی و، لەوان دەبووەوە. نەوەک لە بەر ئەوەی ماڵ و حەسارەکەیان دەفرۆشت و میراتی باوکیان بەش دەکرد. ئەو ماڵ و حەسارە لە هەر حاڵدا دەبوو بفرۆشرایە و، میراتەکەش... مونیرە گوتی: « بە بارامم گوتووە، بەرلەوە ماڵ و حەسارەکە بفرۆشین دەبێ بووکی بۆ تۆ تێدا دابەزێنین.»

رووناکیش بە نیشانەی پەسندی قسەکەی سەری بۆ لەقاند. بەڵام بارام گوتی: « قەرار نەبوو ئیمشەو باسی ئەو قسانە بکەین. قەرار بوو سبحەیشەو...»

ئەو تازە دەیزانی براو خوشکەکانی هەموو قسەیەکیان بڕاندووەتەوە. قسەی فرۆشتنی ماڵ و حەسارەکە و...

شەو درەنگ بوو. بارام و ژن و منداڵەکەی هەستان و رۆشتن. ئەویش هەستا بڕوا. مونیرە تکای لێکرد بمێنێتەوە. گوتی: « من و رووناک کارمان پێتە.»

کاریان چیە؟ ئەو بیری کردەوە، رەنگە ئەوەش بەشێک لە رێکەوتننامەکەیان بێ. « ئێمە ناچار بووین مل بە فرۆشتنی ئەو ماڵ و حەسارە بدەین.» ئەگەر وا بڵێن ئەو چی دەکا؟ پێدەکەنێ. پێکەنینێکی تاڵ و، دەڵێ: « من نەگەڕاومەتەوە زێویەوانی ئەو کۆشکە کاولە بکەم.» ئەی ئەگەر داوای ژن هێنانی لێ بکەن؟ بۆ؟ لە بەر ئەوەی وەسیەتی دایک و باوکیانە. ئەوسا دەگری. گریانێکی بە کوڵ و، دەڵێ: « من نەگەڕاومەتەوە وەسیەتی مردووەکان پیادە بکەم.» مونیرە دەیگوت: « ئێمە هیچ کارێکمان بۆ دایک و باوکمان نەکردووە. لانیکەم با لە چاوەڕوانیدا نەیانهێڵینەوە. با داخوازیەکانیان بە رێوە ببەین.»

کامە داخوازی؟ ئەو مـردنی دایکـی لـە بـیر بـوو. دوا سـەرکەوتنی شۆڕش، یەکەم رۆژی شەڕی ناوخۆ دایکی مردبوو. ئـەو رۆژە ئـەو لـە ماڵ نـەبوو. لـە گـەڵ چەنـد کـەس لـە هاوڕێکـانی خـەریکی راگـوێزانی بریندارەکان بوون. لە کۆڵان و شـەقامەکانەوە، لـە پـشت سـەنگەرە بـە تاگڵ هەڵـچنراوەکانەوە، بـۆ نەخۆشـخانە. نەخۆشـخانە قەرەباڵـغ بـوو. قەرەباڵـغتر لـە هەمیـشە. بریـندارەکان زۆر بـوون و کـەس و کـاری بریندارەکانیش... لەوێ بارامی دیبوو. سەیری هاتبوویە. بارام دەبوو لە ماڵەوە بوایە. لە ژێرخان و، خۆی لە شەڕ و تەقوو تۆق شاردبایە. ئەو لێی چووبووە پێش. تەنها بـارام نـەبوو. هـەموو کـەس و کـاری لـەوێ بوون. ئەو تۆقا بوو. « نەکا کەسـمان بریندار بووبـێ؟ » بـەرەو پیریـان چووبوو. لـەو کاتـەدا دوکتۆرێـک لـە ژوورێـک هـاتبووە دەر. کـەس و کارەکەی هۆمەنیان بۆ بردبوو.

« چی بووە دوکتۆر؟ » دوکتۆر خەمبار سەری بادابوو. « بە داخەوە...» قیـژەی مـونیرە و روونـاک لـە هـەراو هوریـای نەخۆشـخانەکەدا ون بووبوو. ئەو هەروا حەپەسا بوو. « کێمان مردووە؟ »

دایکی بە دەم یەکەم گوللەکانی شەڕی ناوخۆوە دڵی راوەسـتابوو. کەس، تەنانەت رووناکیش کە لەو کاتەدا لە لای بوو،تاقە وشەیەکیان لـێ نەبیـستبوو. مـەرگی کـوت و پـڕ. مـونیرە گوتبـووی: « بـەڵام بـاوکم حەفتەیەک بە گیاندانەوە بوو. تا ئەوساتە گیـانی دەرچـوو قـسەی دەکرد. زیاتر لە هەمووان بانگی تۆی دەکرد.»

ئەو گوتی: « ماندووم. سەرم ئێشێ. دەبێ بڕۆم.» مونیرە گوتی: « پێویـستە هەنـدێک قـسەی خوشـک و برایانـە بکـەین.» ئەوسـا بردیـە ژوورێکی چۆڵ و، رووناکیش بە دوایاندا چوو. ئەو بە راست ماندو بوو، سەری ئێشا. گوتی:

« ئەگەر دەکرێ بـا قـسەکان دانـێین بـۆ سـبەینێ. یـان سـبەی شـەو.» خوشکەکانی گوتیان: « ناکرێ. دەمانەوێ بزانین تۆ دەتەوێ چی بکەی؟ »

« دەمەوێ چیرۆکەکەم تەواو بکەم. چیرۆکی فەرهاد و...» نەیگوت. خوشکەکانی گوتیان: « دەمانەوێ بزانین بە تەمای بڕۆیتەوە، یـان لێـرە دەمێنیتەوە؟ »

پێشتریش ئەوەیان لێ پرسیبوو. لە ئوستانداری و لە... نەیزانیبوو. نەیدەزانی. گوتبووی: «جارێکە بۆ سێ مانگیتریش مۆڵەتەکەم تازە دەکەمەوە.» جەلالی هاوڕێی گوتبووی: «لێرە بمێنەوە. ئێستا وەزعەکە گۆڕاوە. وەک جاران نەماوە. دەتوانی لە زانکۆ، یان تەنانەت لە ئیدارەکەی ئێمە دابمەزرێیت و...» خوشکەکانی گوتیان: «بمێنیتەوە یان بڕۆیتەوە، هەر دەبێ ژن بێنی. ئەم شارە کەمی کچی جوان و خوێندەوار تێدا نیە.»

رووناک گوتی: «کچێک کە تێت بگا و، وەک خۆت...»

مونیرە گوتی: «کچێکی وام لە شکە. زۆریش تۆی خۆش دەوێ.»

ئەو تاقەتی بە سەر چوو. گوتی: «دایدەنێین بۆ شەوێکیتر و، دەرفەتێکیتر.» ئەوسا هەستا. خوشکەکانیشی هەستان. گوتیان، کارو باری فرۆشتنی ماڵ و حەسارەکە دوو سێ مانگ دەخایەنێ. گوتیان: «دەبێ لەم دوو سێ مانگەدا...»

ئەو دیسان گوتیەوە: «دوو سێ مانگ زۆر کەمە. دەترسم فریا نەکەوم.»

فریای چی؟ ناچار لێم پرسی. گوتم: «دەترسی فریای چی نەکەوی؟ ژنهێنان؟»

ئەو نەیبیست. یانی بیستی و، وەڵامی نەدامەوە. تەنانەت سەریشی هەڵنەبڕی. لە پشت مێزەکەی دانیشتبوو. لەوەتی لە ماڵی مونیرە هاتبووەوە لە پشت مێزەکەی دانیشتبوو، بە سەر دەستنووسەکانیدا نەویبووەوە. بە سەر چیرۆکەکەی فەرهاددا.

گوتم: «مەترسە فریا دەکەوی. چیرۆکی فەرهاد لە ئاخر و ئۆخریدایە.»

ئەو بزەیەکی تاڵی کرد. من نەمدی، بە جووڵەی شانیدا زانیم.

گوتی: «کەس لە بیری فەرهاددا نیە.»

## حەفدە

هەموویان کۆ بووبوونەوە. لە ماڵی باوکیان. لە ماڵی میرزا سەعید... ساڵانێک بوو ماڵی میرزا سەعیدی میهرەبان قەرەباڵغیەکی ئاوای بە خۆیەوە نەدیبوو. کوڕ و کچەکانی میرزا سەعید لە عەسرەوە هاتبوون. تەبا و سەر لەیەک. بە ماڵ و منداڵەوە. ژنەکان دەستیان بە ماڵەکەدا هێنابوو. هۆڵ و ئاشپەزخانەکەیان خاوێن کردبووەوە. پیاوەکان سەریان بە سەری یەکترەوە نابوو، قسەیان کردبوو. منداڵەکانیش، بە تایبەت منداڵە بچووکەکانی بارام لە حەسار، لە سەرمای دەرەوە، لە ناو درەختەکاندا یاریان کردبوو. دایکیان چەند جار

لە هەیوانەوە دەنگی دابوون. ویستبووی بێنە ژوور. گوتبووی سەرمایان دەبێ. خۆیان پیس دەکەن. بارام گوتبووی: « وازیان لێ بێنە ئێستا تاریک دەبێ و خۆیان دێنە ژوور.» گوتبووی: « لێیان گەڕێ با بۆ

ئاخر جار بە دڵی خۆیان
لە حەسار و ماڵەکەدا یاری بکەن.»

بۆ ئاخر جار؟! مونیرە و رووناک بیستبوویان. داچڵەکیبوون، بەڵام هیچیان نەگوتبوو. ئەویش بیستبووی و هیچی نەگوتبوو. چی بڵێ؟ ئەویش دەیزانی ئەو مندالانە بۆ ئاخر جارە لە حەسار و ماڵەکەدا یاری دەکەن. دەیزانی ماوەیەکیتر حەسار و ماڵێک نامێنێ یاری لێبکەن. ماوەیەکیتر حەسار و ماڵەکە دەڕووخا. دەیانڕووخاند. حەتمەن لە پێشدا درەختەکانی حەسارەکیان دەبڕیەوە و، چۆلەکەکان سەریان لێ دەشێوا. پشیلەی ماڵە دراوسێکانیش... دوو پشیلەی لەڕ و لاواز کە لە ترسی ئازاری منداڵەکان، دەهاتن و لە قوژنەیەکی حەوزە وشک و لارووخاوەکە هەڵدەکورمان، حەوزەکەیان لێ پڕ دەبووەوە. حەساریان تەخت دەکرد. ئەوسا دەکەوتنە گیان ماڵەکە. دەرکەو پەنجەرە کۆن و قەدیمیەکان، گەچبڕی دیوار و سەرتاقەکان، کۆڵەکە گەورەکانی هەیوانیان دەرووخاند. ماڵەکەشیان تەخت دەکرد. ئەوسا بینایەکی گەورە، نە وەک ئێستا روو لە قیبلە و خۆرەتاو، بەڵکو روو لە شەقام، لە جێی ئەم حەسار و ماڵە خشت خشت بالای هەڵدەکشا. بینای گەورەترین بانکی شار. بانکی میللی یان میللەت؟

تاریک بووبوو. منداڵەکان هاتبوونە ژوور و، هەموویان، گەورە و بچووک
لە دەوری سفرەیەک کۆ بووبوونەوە. لە دەوری سفرەی کۆنی ماڵی میرزا سەعید. لە رستوورانەوە خواردنیان بۆ هاتبوو، خواردبوویان. ئەوسا دەستیان کردبوو بە قسەکردن. سەرەتا لە بیرەوەریەکانیان دوا بوون. لە بیرەوەریەکانی کۆنیان
لەم ماڵ و حەسارەدا و... ئێستاش باسی فرۆشتنی ماڵ و حەسارەکە و، باسی بەشکردنی میرات و، ژن هێنانی ئەویان دەکرد. بارام دەیگوت: «خێزانم پوورزایەکی بێوەژنی هەیە. خانمێکی خوێندەوار و فەرمانبەرە. سی ساڵ دەبێ و نابێ. نەزۆکە بۆیە...»

مونیرە داچڵەکی. «نەزۆکە؟!»

بارام گوتی: «ئەو چاکتر کە نەزۆکە.»

گوتی: « پێم ناڵێی خێری منداڵ چیە؟ جگە لەوە شەوو ڕۆژ دەست دەگرنەوە و داوای پارە...»
بارام بە پێکەنینەوە گوتی. بەڵام مونیرە تووڕە بوو. گوتی: « هەر باسیشی مەکە.»
خێزانی بارام قەڵس بوو. لچی هەڵقرچاند و ڕوو لە بارام گوتی: « عەممە مونیرە ڕاست دەکا. هەر باسیشی مەکە. پەروانە خوازبێنیکەری زۆرە. شوو
بە لە خۆی بە تەمەنتر ناکا...»
بارام بێدەنگ بوو. ئەو پێکەنی. بە دزیەوە، بە خۆی و بە ئەوان پێکەنی. مونیرە گوتی: « خۆم کچێکم بۆ دۆزیوەتەوە وەک پەڕی تاوس. کچێکی گەنج و جوان کە بە دڵنیاییەوە لەشکرێک کوڕی ساغ و تەندروستی لێی دەبێ.»
لەشکرێک؟! ئەو سەیری منداڵەکانی کرد. منداڵەکانی بارام و، نەشمیلی کچی مونیرە. ئاخێکی هەڵکێشا. ئاخێکی سارد. میوانەکان بۆ ساتێک بێدەنگ بوون. لەو بێدەنگیەدا ئەو کرمە کرمی مشکەکەی بیست. ئەو مشکە بچووکە ماڵەکیە کە بە قەراغ دیوارەکاندا هەڵدەهات و دەیگەیاندە پشت مێزەکەی. ئەو مشکەکەی دی، بەڵام نەیتوانی شوێنی بکەوێ. دوا ڕۆشتنی میوانەکانیش نەیدەتوانی. ڕووناکی خوشکی نەرۆشتبوو. گوتبووی: « من ئیمشەو لێرە دەمێنمەوە. لە ماڵی...» نەیگوتبوو لە ماڵی باوکم. گوتبووی: « لە لای خاڵە.» ڕووناک لە زمانی منداڵەکانی خۆیەوە و، لە زمانی نەشمیلی خوشکەزایەوە پێی دەگوت خاڵە. نەشمیلیش حەزی کردبوو بمێنێتەوە. کوڕە گەورەکەی بارامیش. بە باوکی گوتبوو: « حەز دەکەم ئیمشەو لێرە بمێنمەوە. لە لای پوورم و مامەم.» گوتبووی پوورم و مامەم، نەیگوتبوو عەممە و عەمووم. دایکی چاوی لێ هەڵتەکاندبوو کە ناکرێ. باوکی گوتبووی ئەوان حەز ناکەن کوڕم. ئەوان حەز دەکەن دوو بە دوو بن. کۆڵێ قسەی تایبەتیان بۆ یەکتر پێیە. قسەی خوشک و برایانە.»
بارام گوتبووی: « کەس نازانێ ئەم دوانە شەوو ڕۆژ چی بە گوێی یەکتردا دەچرپێنن.» سالانێک لەمەبەر گوتبووی. بۆ ئەوەی باوکی بە گژیاندا بچێ. میرزا سەعید هیچی نەدەگوت. بە نیەتی بارامی دەزانی.

بـەڵام ڕەعنـا خـانم دەیگـوت: «ئـەوان خوشـک و بـران. بـۆ لێیـان ناگەڕێی...» بارام دەیگوت: «بۆ مـن و مـونیرە خوشـک و بـرا نـین؟»
ڕەعنا خانم دەیگوت: «ئەوان خوشک و برای بچووکن.
بە دوای یەکتردا هاتوون. تـەنها دوو ساڵـیان بەینـە.» خوشـک و بـرای بچووک
لە گەڵ یەک سەمیمی و کراوەتـر بـوون. بـە هـەموو سـڕێکی یـەکتریان دەزانی و، هەموو دەردە دڵێکیان بۆ یەکتر دەکرد، ئەو دەمە کـە هێـشتا مێرمنـداڵ بـوون و، تەنانـەت کاتێـک گـەورەش بووبـوون. کاتێـک ئـەو چووبووە زانکۆ، هەموو پێنج شەنبە و جومعەیـەک دەهاتـەوە مـاڵ و... ڕەعنا خانم دەیگوت: «تۆ و مونیرەش لەوانەوە فێر ببن. وەک ئەوان لە گەڵ یەک میهرەبان بن.» مونیرە لە گەڵ هەموویان میهرەبان بوو. وەک دایکی. بەڵام بارام... بارام زیاتر لاسایی باوکیدەکردەوە. کـەم دوێـن و زۆرجار تووڕە و تووتڕکە سەر بوو.
ڕووناک ژوورەکەی خاوێن کردبووەوە. جێگەو بـانی ڕاخـستبوو. ئەوسا دانیـشت. گـوتی: «دەی خاڵـە قـسەم بـۆ بکـە. قـسەی سـاڵانی غوربەت و...»
ئەو سەرەتای گەڕانەوەی حەفتەیەک لە تاران مـابووەوە. لـە ماڵـی ڕووناک. شـەوانە تـا درەنگانێـک قـسەی بـۆ کردبـوو. قـسەی سـاڵانی غوربەت و... لەو ئازارانە دوابوو کە لـە غوربـەت کێـشابوونی. ئـازاری دووری و دابڕان. ئازاری وەدی نەهاتنی خەون و خەیاڵـەکانی. ئـازاری نووسین. نووسینی خەم و مەراقی خۆی و خەڵکیتر. خەم و مەراقی ئـەو ژن و پیاوانـە کـە خـەون و خەیاڵـەکانیان دۆڕانـدبوو. گەمـەکانیان دۆڕاندبوو. گەمەی ژیان و خۆشەویستی و... ڕووناک گوێی گرتبوو. بە دەمیـەوە فرمێـسکی ڕشـتبوو. گوتبـووی: «خوشـکت بمـرێ، کەواتـە ژیانێکی ئاسوودە نەژیاوی...»
«ئـەوەی شـتێک یـان کەسـێکی لـە ڕابوردوویـدا ون کردبـێ ناتوانێ ئاسوودە بژی.»
کێ گوتبووی؟ ئەو؟ ئەو چی، یان کێی لە ڕابوردوویدا ون کردبـوو؟ نەیدەزانی. دەیزانی بەڵام دڵنیا نەبوو.

ڕووناک گوتی: « بۆ ژنت نەهێناوە؟ بڵێی لەم هەمووساڵەدا تووشی کەسێک نەبوویێتی جێگەی خاڵی ئەفسانەت بۆ پڕ کاتەوە؟ »

ڕووناک تەنها کەسێکی بنەماڵە بوو بە خۆشەویستی ئەو و ئەفسانەی دەزانی. ئەفسانەشی دەناسی. سەرەتا بە هۆی شێعرەکانیەوە. شێعرەکانی ئەو. ئەو ساڵانە ئەو شێعری دەگوت. شێعری شۆڕشگێڕانە و، بۆ هاوڕێکانی دەخوێندەوە. شێعرە عاشقانەکانی بۆ کەس نەخوێندبووەوە. جگە لە جەلالی و جاروبارێش ڕووناک. ڕووناک گوتبووی: « دەبێ ئەم کچی ئاوەم پێ بناسێنی.» کچی ئاو؟ ناوی شێعرێکی بوو. ئەو گوتبووی: « ڕۆژی سەرکەوتنی شۆڕش...» و، ساڵێک زیاتر لەو ڕۆژە تێپەڕیبوو، بەڵام هێشتا ڕووناک ئەفسانەی نەدیبوو. یەکەم جار لە پرسەی دایکیدا دیبووی. کچێکی نەناسراو کە بە تەنها هاتبوو

لە سووچی یەکێک لە ژوورەکان دانیشتبوو. چاوی لە ڕەسمەکەی ئەو بڕیبوو. کاتێک هەستا بوو بڕوا، لەبەر دەرکە ڕووی کردبووە ڕووناک و گوتبووی:

« خەمی ئاخرتان بێ. خۆتان خۆش بن. براکانت...» ماوەیەک دواتر ڕووناک گوتبووی: « دڵنیام ئەو کچە ئەفسانە بووە.»

ئەو کچە ئەفسانە بوو. ڕووناک دیسان دیبوویەوە. لە گەڵیدا بووبووە دۆست و دەستەخوشک و، جارێکیش چووبووە ماڵیان. ماڵێکی بچووک لە کۆتایی کۆڵانێکی...

ئەو گوتی: « تۆ هێشتا ئەو چیرۆکەت لە بیرە؟ »

ڕووناک لە بیری بوو. بەشێکی زۆر لە چیرۆکەکەو بە تایبەت دواهەم بەشی چیرۆکەکەی لە بیر بوو. دواهەم بەش؟ ڕووداوێک کە ساڵانێک لەمەبەر لە ڕۆژێکی ساردی پاییزدا ڕوویدابوو. ڕووداوێکی سادە. کچێک کە دڵدارەکەی بەجێی دەهێشت و لێی دادەبڕا. ڕووناک ساڵانێک ئەو ڕووداوەی لە شوێنێکی دووری دەروونیدا شاردبووەوە. بۆ کەسی نەگێڕابووەوە. بۆ ئەویشی نەدەگێڕایەوە.

ساڵێک و چەند مانگ دوا سەرکەوتنی شۆڕش، حکوومەتی تازە بە ئێجگاری شاری گرتبووەوە. دوا شەڕێکی قورسی ماڵ بە ماڵ. دوا کوژرانی سەدان و هەزاران گەنج کە تا دوێنێ لە سەنگەرێکدا بۆ

سەرکەوتنی شۆڕشێک تێکۆشابوون. چەکدارەکانی ناوشار هەڵاتبوون و چەکدارەکانی حکوومەت جێگەی ئەوانیان گرتبووەوە. ئەو رۆژانە کوڕە گەنجەکانی شار دەستە دەستە گیرا بوون و، ئەو بە تکای میرزا سەعیدی باوکی ماوەیەک لە ماڵ نەچووبووە دەر. دوا ئەو ماوە رۆژێک کە بۆ بینینی ئەفسانە لە ماڵ رۆشتبووە دەر، گیرابوو. ئەو زۆر لە زیندان نەمابووەوە. مانگ و نیوێک و... زانیبوویان چەکدار نەبووە بەریان دابوو.

ئەو گیرانە و گیرانی لەوە دوای هاوڕێکانی و کوژرانی هەندێک کەس، ترساندبوویان. ئەو ترسا بوو. بیری لە رۆشتن کردبووەوە. رووناک زانیبووی. گوتبووی: «ئەی ئەفسانە؟ ئەو کچە کلۆڵە...» رۆژێک کە ئەو بە ئێجگاری ئامادەی رۆشتن بوو، ئەفسانە خۆی بە ماڵیاندا کردبوو. ئەو رۆژە تەنها رووناک لە ماڵەوە بوو. خۆشحاڵ بوو ئەفسانەی دەدی. ئەفسانە نەرۆشتە ژوور.

لە حەسار، لە قەراغ حەوزەکە نامەیەکی لە کیفەکەی دەرهێنا و رووناک نامەکەی خوێندەوە. نامەی ئەو بوو بۆ ئەفسانە. نامەی دوا ماڵاوایی... ئەفسانە لە پڕمەی گریانیدا. فرمێسک بە گۆنایدا هاتنە خوار. رووناک باوەشی پێدا کرد و دڵخۆشی دایەوە. زۆری نەخایاند ئەویش هاتەوە. ساکێکی بەتاڵی گەورەی

بە دەستەوە بوو. کە ئەفسانەی دی داچڵەکی. بە خۆیدا شکایەوە و، لە شەرما سەری داخست. رووناک ئەو ساتەی لە بیر بوو. ئەو ساتە ناخۆشە. قسەکانی ئەویشی لە بیر بوو. ئەو گوتبووی: «دەبێ بڕۆم. هیچ چارێکیترم نیە.» ئەوسا چووبوو لە سەر چرپاکەی باوکی، لە بن درەختەکانی حەسار دانیشتبوو. درەختەکان گەڵای وشکیان رژابوو. بە سەر ئەودا و، رووناک ئەو دیمەنەشی

لەبیر بوو. ویستبووی بە بیانوویەکەوە بەجێیان بێڵێ. ئەفسانە دەستی گرتبوو. دەستی لەرزۆک و تکاکاری ئەفسانە نەیهێشتبوو بڕوا. رەنگە بە هیوای یارمەتیەک، قسەیەکی خێر... ئەو گوتی: «لێرە بمێنمەوە دەگیرێم. هەر رۆژەو دەستەیەک دەگیرێن. هەر شەوە برادەرێکم...»

ئەو قسەکەی پێ تەواو نەکرا. رووناک هەڵیدایە: «تۆش گیرایت و دوا ماوەیەک بەر بووی. تۆ چەکدار نەبووی، لە خۆوە دەترسی.»

ئەو گوتی: « لێرە بمێنمەوە تیا دەچم. ژیان و داهاتووم...»
ئەفسانە گوتی: « ئەی ژیان و داهاتووی من؟ »
بە دەم هەنیسکەوە گوتی. گوتی: « تۆ بڕۆی بە زۆر دەمدەن بە ناسری.»
ئەو چی گوت؟ گوتی: « هیوادارم بەختەوەر بی.»
بە شەرمەوە گوتی. بە ترسەوە. ئەوسا هەستا. دەوری حەوزەکەی دایەوە و بە پلیکانەکاندا هەڵگەڕا. ئەفسانە هێشتا دەگریا. هەموو هیواو ئاواتەکانی چۆڕاییان داهاتبوو. بە قەراغ حەوزەکەدا و، بە سەر گەڵای وشک و وەریوی درەختەکانی حەساردا، لە دەروازەکە رۆشتە دەر. بە کۆڵانەکەدا...
رووناک لە بیری بوو. ئەفسانە لە کۆڵان دوور و، دوورتر بووبووەوە. شانەکانی بە دەم هەنیسکەوە لەریبوونەوە...
ئەو گوتی: « تۆ چی لە ئەفسانە دەزانی رووناک؟ دوا رۆشتنی من. دوا شووکردنی بە ناسری...»
رووناک گوتی: « کە شووی کرد لێرە رۆیی. یەک دوو جار هەواڵیم لە دەستە خوشکەکانی پرسی. گوتیان چووە بۆ تاران. گوتیان بەختەوەر بووە.
« نازانی چۆن و بۆچی مرد؟ »
یەکەم جار بوو ئەوەی دەپرسی. رووناک نەیدەزانی. ئەگەرچی رووناکیش ماوەیەک دوا شووکردنی چووبوو بۆ تاران، بەڵام ئەفسانەی نەدیبوو. هەواڵیشی نەبیستبوو. تا ئەوەی رۆژێک لە ستوونی پرسەی رۆژنامەیەکدا خوێندبوویەوە
« انا لله و انا الیه راجعون » هەر ئەو رۆژە تەلەفوونی بۆ ئەو کردبوو.
رووناک گوتی: « چەند ساڵ لەمەبەر بوو؟ »
ئەو لە بیری نەبوو. گوتی: « زۆر زوو مرد. ئەفسانەزۆر زوو مرد.»
بەیانی کە رووناکی خوشکی تا بەر دەروازەکەی سەر کۆڵان بەڕێ کرد، منی لە گەڵ نەبووم. بەڵام لە گەڕانەوەیدا... بە پەلە گەڕایەوە. بە حەسار و
بە قەراغ حەوزە وشک و لا رووخاوەکەدا و، بە پەلە بە پلیکانەکاندا

هەڵگەڕا. پێدەچوو دیسان کرمە کرمی مشکەکەی بیستبێ. بیستبووی. شوێنی کەوت. چووە پشت مێزەکەی. کەشەوی مێزەکەی کردەوە و، چەپکێ کاغەزی دەرهێنا. دوێشەو بەر لەوە دەستنووسەکانی کۆ بکاتەوە و هەڵیانگرێ، دەستی منداڵە بچووکەکەی بارامی گەیشتبوویە. منداڵەکە پەڕەکانی تێکەڵ کردبوو. دیسان
ڕێک و پێکی کردنەوە. تا دواهەم لاپەڕە و، دواهەم لاپەڕەی خوێندەوە.

وەڕس و بێتاقەتن کوڕە کوێرەکان. دەستی یەکتر دەگرن و، لە سووچێکی حەساری بچووکی ماڵەکەیان، شان بە شانی یەکتر دادەنیشن. هەر یەکەو چەند دەنک دانیان لە مستدایە. دەست هەڵدەبڕن کوڕە کوێرەکان. لەپە دەستیان دەکەنەوە و، چاوەڕوان دەبن. بە بێچاوو بە بێ ڕوانین چاوەڕوان دەبن کۆترێک لە کۆترەکانی سەربان لە سەر دەستیان بنیشێت و...

گوتم: «ئەمە ئەو تابلۆیەیە کە فەرهاد لە کوڕە کوێرەکانی کێشابووەوە.»

ئەو هیچی نەگوت. سەری بەرز کردەوە و، لە دیواری ژوورەکەی ڕوانی.

لە تابلۆی کوڕە کوێرەکان. هێشتا دەستیان هەڵبڕیبو. نووسی:

بەولاوەتر کاڵێ لە ناو دەرکە، یان لە سووچێکیتری حەسارەکە دادەنیشێت. لە براکانی رادەمێنێت. ئەو چاوەڕوانیە کەی کۆتایی دێت؟ چاوەڕوانی کوڕە کوێرەکان و چاوەڕوانی کاڵێ. کاڵێ...

کاڵێ چی؟ ئەو بیری کردەوە. جگەرەیەکی داگیرساند و، بە دەم بیرکردنەوەوە نووکی قەڵەمەکەی بە سپیەتی کاغەزەکەدا کوتا. چەند جار ئەوەی دووبارە کردەوە. خاڵ و نوختەکانیش هیچیان وەبیر نەهێنایەوە. گوتی:

«خۆزگە فەرهاد تابلۆیتریشی ببوایە.»

گوتی: «کاڵێ چاوەڕوانی چی بوو؟ »

## هەژدە

کاڵێ ئاواتی خواستبوو، ڕۆژێک فەرهاد لە گەڵ خۆی لە ماڵ بیباتە دەر.
بۆ کوێ؟ وەک هەموو دۆست و دەسگیرانێک دەستی بگرێ و، بە کۆلانەکەیخۆیاندا، بە کۆلانەکانی گەڕەکدا بیگێڕێ. ئەوسا بیبا بۆ بازاڕ. کاڵێ ئاواتەخواز بوو، بۆ تەنها جارێکیش بووە لە گەڵ فەرهاد بڕۆن بۆ بازاڕ. دووکانەو دووکان بگەڕێن. عەترفرۆشی... جلوو بەرگفرۆشی... ئاڵتوونفرۆشی... نەیدەویست هیچی پێ بکڕێ. پێی خۆش بوو فەرهاد وەک هەموو پیاوێکیتر بڵێ: «چیت دەوێ بۆت بکڕم، جوانێ؟» کاڵێ دەیگوت: «هیچ.» فەرهاد دەیگوت:
«ملوانکەیەک، جووتێک گوارە، لانیکەم ئەنگوستیلەیەک...» دەیگوت:
«ئەم ملوانکە زۆر جوانە. لە گەردنت دەکاڵێتەوە.» فرۆشیارەکە گورج دەیخستە بەر دەستی. فەرهاد هەڵیدەگرت و بۆی لە ملدەکرد. فرۆشیارەکە ئاوێنەیەکی
لە بەرامبەر رادەگرت. زەردی ملوانکەکە لە سەر سپیەتی گەردنی دەدرەوشایەوە. چاوە گەشەکانیشی دەبریسکانەوە. نیگای لە ملوانکەوە بۆ فەرهاد دەگوێزایەوە. فەرهاد لە پشتیەوە وەستابوو.

بستێک باڵا بڵێندتر. بزەی لە سەر لێو بوو. چاوی لە گەردنی کاڵێ نەدەترووکاند. دەیگوت: « زۆر لێت جوانە.» بریسکەی چاوە شەیداکانیشی دەیسەلماند. دەیگوت: « با لە گەردنتا بێ.» ئەوسا رووی لە فرۆشیارەکە دەکرد و، دەیگوت: « دەکاتە چەند؟ » کاڵێ ملوانکەکەی دادەنایەوە. نەوەک نابەدڵخۆشی. دەیگوت: « نامەوێ.» نەیدەویست. هیچی نەدەویست، جگە لەوەی فەرهاد لە گەڵ خۆی ببیاتە دەر. بۆ پارکێک، سەیرانگەیەک... بە ناو داروو درەختەکاندا، بە ناو ریزی گوڵە رەنگاورەنگەکاندا، بە قەراغ حەوز و فوارەکاندا بگەڕێن. وەک هەموو جووتە دڵدارێک کە دەست دەخەنە ناو دەستی یەک و دەگەڕێن. کە ماندووش بوون

لە سێبەری درەختێکدا، لە سەر چیمەنێکی سەوز، دادەنیشن و بە گوێی یەکدا دەچرپێنن. لە چی دەدوێن؟

کاڵێ گوتبووی: « لە خۆیان، لە خۆشەویستیان، لە ژیان و داهاتوویان.» کاڵێ لە پەنای فەرهاددا، لە سەر چرپای ژوورەکەی دانیشتبوو. فەرهاد دەستی لە گەردنی ئاڵاندبوو. گوتبووی: « ئێمە نیازمان بە پارک و سەیرانگە و ناو خەڵک نیە. ئێمە ئەم تۆزە خەڵوەتەمان بەسە.» کاڵێ لە باوەشیدا، بۆ ناو کۆشی شۆڕ بووبووەوە. گوتبووی: « ئەم تۆزە خەڵوەتە و...» گوتبووی: « راستم پێبڵێ فەرهاد، هێشتا پێت وایە پۆلیس...» فەرهاد دەمی خستبووە ناو دەمی و... بێدەنگ بووبوون.

پیرێژنی خاوەن ماڵ دەکۆکی. لە حەسار، یان لە بەر پەنجەرەی ژوورەکەی چاوەڕوان بوو فەرهاد و کاڵێ بێنە خوار. پیرێژن دەیزانی ئەوان لە سەرەوەن.

لە ژوورەکەی فەرهاد و، ئێستا یان ساتێکیتر دێنە خوار. بە پلیکانەکاندا بۆ دالانە تاریکەکە و، ئەوسا فەرهاد دەرکەی چێوی دەکاتەوە. سەرەتاتکەیەک دەکا و، کە کەس بە دەرەوە نەبوو کاڵێ گورجێک لە دەرکەوە دەڕواتە دەر. فەرهاد لەو ساتە تیژ تێپەڕەدا کە کاڵێ لە بن باڵیەوە دەر دەچوو، ماچێکی
لە گۆناو، لە گەردنی دەدزی و، کاڵێ پێدەکەنی.

پیرێژن بەوەی نـەدەزانی. ئەوەنـدەی دەزانی دەرکـە دەکرێتـەوە. کالێی لێ ئاوا دەبێ و دیسان پێوە دەدرێتەوە. ئەوسا فەرهاد... پیرێـژن چـاوەڕوان بـوو فـەرهاد دوا بـەڕێکردنی کالـێ بێـت بـۆ لای و، وەک کوڕێکی شەرمن سەری داخاو بڵێ: « من و کالێ بڕیارمان داوە پێکـەوە زەماوەند بکەین.» بڵێ: « دایە دەبێ بچی کالێم بۆ بخوازی.»

پیرێژن دەمێکـە بـوو چـاوەڕوانی بیـستنی ئـەو هەواڵـە بـوو. لـەو ڕۆژەوە کە ڕەحیمی برای کالێ وازی لە قومار هێنا بوو، لە سەر کارێک دامەزرابوو. فەرهاد دایمەزراندبوو. چەند ڕۆژ دوای شـەڕە قورسـەکەی نێوان ڕەحیم و کالێ. دوا ئەو شەوە کە خەڵکی گەڕەکیان سەر ڕژابـوو. پیرێژن کاتێک چۆنیەتی شەڕەکەی

بۆ فەرهاد گێڕابووەوە، گوتبووی: « کالـێ دەڵـێ ئەگـەر ڕەحـیم واز لـە قومار و بەرەڵایی نەهێنێ و لـە سـەر کـارێکی ئابڕوومەنـد دانەمـەزرێ، بەڵایەک بە سەر خۆی دێنێ.» کالێ گوتبووی. بە گریانەوە گوتبـووی: « ئێمە تاکەی دەتوانین ئاوا بژین؟ من تاکەی دەبێ میوانداری لـە بـرادەرە هەرزە و قومارچیەکانی بکەم؟ » گوتبووی: « بێعەقڵ بووم کە تا ئێـستا کردوومـە. لەمـەدوا...» ڕەحـیم گوتبـووی: « کـار کـوا؟ کـارێکم بـۆ بدۆزنەوە...» حەفتەیەک لەوەدوا فەرهاد

بە پیرێژنی خـاوەن ماڵـدا لێـی راسـپاردبوو، لـە دووکـانی برادەرێکـی کارێکی باشی بۆ دۆزیوەتەوە. پیرێژن خۆشحاڵ بووبوو. ئێشی پشت و پێی لە بیر چووبووەوە. گوتبووی: « خێر لە جوانیەکـەت ببـینی کـوڕم. بەم هەوڵـەت نـەوەک هـەر ڕەحـیم، کالێـشت دامەزرانـدووە.» فـەرهاد تێنەگەیشتبوو. پیرێژن گوتبووی: « خەڵک تا ئێستا لـە ترسـی بـەڕەڵایی ڕەحیم نەیانوێراوەتە کالێ. ئەگەر ڕەحـیم دابمـەزرێ، ئەوەنـدەت زانی ڕۆژێک هاتم و گوتم کوڕم کالێ شووی کرد.»

شووی کرد؟ پیرێژن بە تایبەت ئەوەی گوتبوو. فـەرهاد ترسـابوو. ڕەنگ

بە روخساریەوە نەمابوو.

دوێنێ و دوێشەو، ئەو تا درەنگان لـە پـشت مێزەکـەی دانیـشتبوو، بـەڵام هیچـی نەنووسـیبوو. نەینووسـیبوو؟ نووسـیبووی و ڕەشـی

کردبووەوە. نووسیبووی و گرمۆڵەی کردبوو، فڕێیدا بوو. نووسیبووی و...

گوتبووم: «وادیارە...» زانیبـووم نایبیـستێ. نـەمگوتبوو وا دیـارە چی. قسەکەم تـەواو نـەکردبوو. سـەیرم کردبـوو. وەک کەسـێک بـوو، بێگاریەکی سەختی پێ کرابێ. وەک کەسێک بـوو زۆری بـۆ هاتبـێ. بـە توورەییـەوە قەڵـەمەکەی فڕێـدابووە سـەر مێزەکـە. قەڵـەم گلـۆر بووبووەوە. لەو سەری مێزەکەوە کەوتبووە خوار. ئەو جگەرەیەکی لـە پاکەتەکەی دەرهێنابوو دایگیرساندبوو. گوتبووی:
« بێسوودە...» لە بەر خۆیە گوتبووی. گوتبوویـەوە: « فریـا ناکـەوم.»
ئەوسـا شـەکەت لـە پـشت مێزەکـەی هەسـتا بـوو. سـەرو خـوارێکی ژوورەکەی کردبوو،
لە حاست تاقی کتێبەکان راوەستابوو.

« ئەو هەموو کتێبە چۆن نووسراون؟ » لە خۆی پرسیبوو. کتێبەکان کـەمیان چـیرۆک بـوون. چیرۆکـەکانی خوێنـدبووەوە. ئـەو کاتانـە کـە نەیتوانیبوو بنووسێ، خوێندبوویەوە. دەیان چیرۆکـی کـورت و درێـژی خوێندبووەوە. چیرۆکی کوردی، فارسی، ئێرانی و هەندەرانی... سـەیر بوو ئەویش چیرۆکەکانی بە پێی زمانەکەیان دابـەش کردبـوو. حەتمـەن چیرۆکنووسـەکانیش... زۆر جـار گوتبـووی: « مـن چیرۆکنووسـێکی رۆژهـەڵاتیم.» لـە دەرەوەی وڵات گوتبـووی. لێـرەش دەیگـوت: « مـن چیرۆکنووسێکی کـوردم.» سـەیرە چیرۆکنووسـەکان بـە پێـی زمـان و نەتـەوەیان دابـەش بکـرێن. چیرۆکنووسـی رۆژاوایـی و رۆژهـەڵاتی... چیرۆکنووسـی فـارس و کـورد... چیرۆکنووسـی زمـان و نەتـەوەی باڵادەست و، زمان و نەتـەوەی... بریـا هـەموو مرۆڤـەکان بـە زمانێـک دەدوان. هەروا کە بە زمانێک پێدەکـەنین و بـە زمانێـک دەگریـان. بریـا هەموو چیرۆکنووسەکان بە زمانێک دەیاننووسی. هەروا کە بە زمانێـک ئازاریان دەکێشا. ئازاری نەنووسین. ئازاری نووسین و رەشـکردنەوە. نووسین و گرمۆڵەکردن و فڕێدان...

بەیانی زوو لە خەو هەستا. مشتێک ئاوی بە ڕوومەتیدا کرد و، لە ئاشپەزخانە بە سەر پێوە پاروویەک نانی خوارد. ئەوسا گەڕایەوە بـۆ ژوورەکـەی. بـۆ پـشت مێزەکـە و، یەکـەم جگـەرەی ئـەو رۆژەی

داگیرساند. گوتم... نا، من هیچم نەگوت. ئەو گـوتی: «دەبـێ بـڕۆم بـۆ لای فەرهاد.»

من لە ژوورەکەی فەرهاد بووم. دانیشتبووم و چـام دەخـواردەوە. پیاڵەیەکم
بۆ ئەویش تێکرد. گوتم: «چای دوا ناشتا.»

گوتم: «تۆ جگەرە زۆر دەکێشی، بەڵام چا کەم دەخۆیتەوە.»

بە پێکەنینـەوە گـوتم. ئـەویش زەردەخەنەیـەکی کـرد و، گـوتی: «غوربەت میزاجی شێواندووم.»

نـــەمگوت غوربـــەت ژیانیـــشی شـــێواندووی. ئـــاگری مەنگەڵـــیەکە دامرکابوو. خۆڵەکەم رۆ کرد و هەندێک خەڵـووزی تـازەم گەشـاندەوە. پاشان مەقاشم
لە پـشکۆکان رۆ کـرد و پـشکۆیەکی گەشـاوەی لـەبارم هەڵـگرت. ئـەو سەیری هاتێ. گوتی: «بەم بەیانیە...» ئەوسا نیگای لە منەوە بۆ فەرهاد گوێزایەوە. فەرهاد هێشتا هەڵنەسـتابوو. لـە بـەر پەنجـەرەی بچـووکی ژوورەکە، لە بەر رۆشنایی کزی بەیانیدا راکشا بوو. گوتی: «ماوەیەکە فەرهاد بەیانیان درەنگ هەڵدەستێ.»

لە گەڵ منی بوو. گوتم: «پیاو کە ناچار بێ لە ماڵ نەچێتە دەر. کە دەستی نەچێتە هیچ کارێک...»

نووسی:

لە ماڵ ناڕواتە دەر فەرهاد. حەفتەیەکە لە ماڵ نەرۆشتووەتە دەر. هاوڕێکـانی گوتوویانـە پێـدەچێت لـە ژێـر چـاودێری پۆلیـسدا بـن. هەموویان؟ گوتوویانە تا ماوەیەک دەبێ هەموو پەیوەندیەک لە گـەڵ خۆیـان و لـە گـەڵ خەڵـک بقـرتێنن. فـەرهاد گوتوویـە: «مـن دەبـێ چیبکەم؟ » دەبێ لـەو ماڵـە بـڕوات. یـان ئەگـەر رۆشـتنی پێناکرێـت، دەبێ چی کتێب و کاغەزی مەترسیداری لە لایە بیفەوتێنێت. دەبێ لە ماڵ نەڕواتە دەر. دەبێ وا بکات خەڵکی گەڕەک پێیان وابێت لە مـاڵ نیە. تەنانەت خاوەن ماڵەکەشی...

چ پێویستە؟ لە پیرێژنی خاوەن ماڵی دڵنیایە فەرهاد. وەک چـۆن لە باوەشی دایکی دڵنیایە. هەر ئەو شەوە چی کتێب و کاغـەزە کـۆی دەکاتەوە و لە حەسار هەڵـیاندەڕێژێت. پیرێژن دەیبینێت. لـە پـشت

پەنجەرەی ژوورەکەی سووسەی شتێک دەکات. هەواڵێکی ناخۆش. بەرایی کارەساتێک. پیرێژن لە ژوورەکەی دێتە دەر. شەمچەی بە دەستەوەیە فەرهاد. بەرایی سووتمانێک. پیرێژن دادەچڵەکێت. کەواتە... ناڵێت کەواتە چی. لە دڵی خۆشیدا نایڵێت. بە خەمەوە لە کۆگای کتێبە هەڵڕژاوەکان دەڕوانێت. دەڵێت: «ئەگەر بوونیان پێویستە دەتوانم بیانشارمەوە. یان بۆ هەر شوێنێک حەز بکەی بیانگوێزمەوە.»

نزم دەیڵێت. لە گوێچکەی دوژمن و دڵی تاریکی دەترسێت. سەیری دێتێ فەرهاد. پیرێژن بە هەوو شتیک دەزانێت. لە کەنگێوە؟ میهرەبان وەڵامی میهرەبانیەکەی دەداتەوە.

«نا دایەگیان.»

شەمچە بە کتێب و کاغەزەکانەوە دەنێت. گڕ لە دڵخۆشیەکانی بەر دەدات. پیرێژن هێشتا بە دیاریەوە راوەستاوە. هەڵدەلەرزێت پیرێژن. سەرمایەتی. ئاگرەکە گەرمی ناکاتەوە. بڵێسەکان لە سەر چرچ و لۆچی روخساری سەما دەکەن. وەک سەمای قێزەونی پیرێژنێک لە ناو پێچ و خولی گەزارەی ئاگردا.

فەرهاد دەڵێت: «دەبێ چەند رۆژ لە ماڵ نەڕۆمە دەر.»

پیرێژن تێدەگات. لەو ترسەش دەگات کە لە گیانی گوتنی نیشتووە. چاو لە گڕەکە هەڵدەبڕێت و لە چاوی فەرهاد دەڕوانێت. بڵێسەکان لە چاوی فەرهاددا دادەمرکێنەوە. پیرێژن دەڵێت: «چاکتر. با چەند رۆژیش لە لای ئەم دایکە پیرەیخۆت...»

«بەڵام نابێ کەس بزانێ لە ماڵەوەم. ئەگەر کەسێکیش سۆراخم بگرێ...»

«دەبێ بڵێم لە ماڵ نیە. دەبێ بڵێم رۆشتووە بۆ... ئەی چی بە کاڵێ بڵێم؟»

چی بە کاڵێ دەڵێت فەرهاد؟ چۆنی تێدەگەیەنێت کە رەنگە رۆژانی خۆشی پێکەوەبوونیان کۆتایی هاتبێ؟ ئەم پرسیارەیە ئازاری دەدات. ئەم پرسیارەیە کە سبحەینێ و سبحەینێیەکیتریش بێوەڵام دەمێنێتەوە...

مات و خەمبار خۆی بە ژووری فەرهاددا دەکات کالێ. گریاوە، چاوە گەشەکانی تەڕن. دەڵێت: «گوڵە هەنارەکە وشک بووە فەرهاد.»

ماوەیەک لەوەبەر گوتوویە هەنارەکە لە لقی ناسکی بووەتەوە و، کەوتووە. دەگرێ کالێ. لەوە دوا چۆنی تێ بگەیەنێت ئاگای لە هاتنەوەی هەیە؟ دەڵێت: «دەترسم فەرهاد. دەترسم بە نەمانی ئەم رەمز و ئیشارەتە.»

چاو بە ژوورەکەی فەرهاددا دەگێڕێت کالێ. بە هەر دوو ژوورەکەیدا. لە کەنگێوە لە ماڵ نەڕۆشتووەتە دەر؟ لە تابلۆی سەر سێپایەکە رادەمێنێت. هەست بە رووداوێک دەکات. هەست بە کارەساتێک.

«چی روویداوە فەرهاد؟»

«نەخۆشم. ماندووم. دەبێ چەند رۆژ لە ماڵ نەڕۆمە دەر و...»

نەخۆشە. ماندوو دیارە. بەڵام رووداوەکە شتێکیترە. نیگای راستگۆی دەیدرکێنێت.

«چی قەوماوە؟»

ناچار پێ لە راستی دەنێت و چی لە هاوڕێکانی بیستووە بۆ کاڵێی دەگێڕێتەوە فەرهاد. گریانی کالێ دەبێتە شینگێڕی. دڵی مانەوەی نامێنێت. لە ژوورەکە دەڕواتە دەر...

**فەرهاد نەیدەزانی کالێ لە کۆڵان و، تەنانەت لە هەموو گەڕەکەکەدا هەواڵی رۆشتنی ئەوی بڵاو کردبووەوە. بەڵام دەیزانی هەموو رۆژێک، لە گەڵ خۆرکەوتنی بەیانی، کاڵێش لە دەرکەی تەنەکەی حەساری ماڵەکەیان هەڵدەهات و، تا ئێوارە وەک لەیلە دۆنێ بە کۆڵان و کۆڵانەکانی گەڕەکدا دەسووڕایەوە. جاروباریش کە دەرفەتێکی بۆ دەڕەخسا...**

بە گومان و وەسواسەوە دێت بۆ لای فەرهاد، کالێ. دڵ لە دوایە. وەک برێشکەی سەر ساج بێئارامە. دوا هەواڵی کۆڵانی بۆ دەگێڕێتەوە. پەردە و پشت پەردەی ژوورەکەی درزبڕ دەکات. ئەوسا...

«مەڕۆ کالێ. تۆزێک لە لام بمێنەوە.»

نامێنێتەوە. بەند نابێت. دەنگە دەنگێک لە کۆڵان دێت. دەبێ
بڕوات. نەکا پیاوخراپێک، گومان لێکراوێک بە کۆڵاندا گوزەر
بکات و، ئەو نەزانێت.
(( مەڕۆ کاڵێ...))
گوتم: (( ئەی پیرێژن؟ ناکرێ ئەو ڕۆژانە بگێڕیتەوە و، باسی پیرێژنی خاوەن ماڵی نەکەی.))
گوتی: (( کلۆڵ پیرێژن.))
پیرێژن زانیبووی ئەو ئاواتەی نایەتە دی کە کاڵێ بۆ فەرهاد بخوازێ.
بە کەمی لە ژوورەکەی دەهاتە دەر. نەوەکلە بەر ئێشی پشت و پێی، نەیدەویست چاوی بە کاڵێ بکەوێ. نیگای خەمبار و چاوی ترساوو هەراسانی کاڵێ ئازاری دەدا. بۆیە لە ژوورەکەی دەمایەوە و، تێدەکۆشا چیرۆکی
فەرامۆش بووی خۆی وەبیر بێنێتەوە. یان وەبیر نەهێنێتەوە.
فەرهاد لە ناکاو لە خەو ڕاپەڕی. وەک کەسێک قیژەیەکی تیژ و ترسناک
لە خەو ڕاپەڕاندبێ. چاوە تۆقیوەکانی بە ژوورەکەدا گێڕا. لەشە لاواز و ئێسکنەکەی دەلەرزی.
گوتم: (( حەتمەن دیسان خەونی دیوە. ماوەیەکە قیژەیەکی تیژ و ترسناک...))
ئەو داچڵەکیبوو. نیگای لە فەرهادەوە بۆ من و لە منەوە بۆ فەرهاد گوێزایەوە. گوتی: (( قیژەیەکی تیژو ترسناک؟!))
گوتی: (( کەواتە فەرهادیش ئەو قیژە تیژ و ترسناکە دەبیستێ.))
فەرهاد هەستا. بە گران. قاچە باریک و ئێسکنەکانی بە گران لەشە پەڕپووتەکەیان پێ ڕادەگیرا. پێیان ڕانەدەگیرا. ئەو جگەرەکەی فڕێدا. ویستی هەستێ و باوەشی پێدا بکا. نەمهێشت. گوتم: (( وازی لێ بێنە.))
دەڕواتە بەر پەنجەرەکە و بە حاستەم لۆی پەردەکەی هەڵدەداتەوە فەرهاد. لەو دیو پەنجەرە لە کۆڵان و لە ماڵی کاڵێ دەڕوانێت. لە پەنجەرەی شین و بچووکی ماڵی کاڵێ. جێگەی خاڵی گوڵە هەنارەکە دیارە. پەردەکەشی دادراوەیە. چاو دەگێڕێت فەرهاد. کاڵێ لە حەسار و، لە بەر دەرکەی تەنەکەی ماڵەکەشیان نیە. کوڕە کوێرەکانیش لە سووچێک دانەنیشتوون و، دەستە

بچووکەکانیان هەڵنەبڕیوە. کۆترەکانیش لە سەربان... ڕەحیم زۆربەی کۆترەکانی فرۆشتووە. جووتێکی هێشتووەتەوە. جووتێکی باڵ نەخشینی پۆپنەدار و... ویستوویە ئەوانیش بفرۆشێت. کاڵێ نەیهێشتووە.

نیگای بۆ ئەو سەری کۆڵان دەگوێزێتەوە فەرهاد. کاڵێ لەو سەری کۆڵانەوە دەردەکەوێت. چارشێوی لە سەر کردووەتەوە و، بن هەنگڵی داوە. گورج و بە پەلەیە. جاروباریش ئاوڕ دەداتەوە. لە جووڵەیدا ترس و گومان دەبینێت فەرهاد. کە نزیکتر دەبێتەوە لە چاویدا. سەر هەڵدەبڕێت کاڵێ. با چنگ لە بسکی ڕۆ دەکات. دەیبینێت فەرهاد. سەمای بسکی ئاڵۆزی دەبینێت. ئیشارەتی دەستی دەبینێت. لۆی هەڵدراوەی پەردەکە بەردەبێتەوە و، ناو پەنجەرەکە چۆڵ دەکات فەرهاد. لە ژوورەکەش دەڕواتە دەر.

گوتی: « بڕوانە چۆن هەڵوەداو سەراسیمە بەرەو پیری دەچێ. ئێستاش دەڵێی یەکەم جارە دەچێ دەرکەی لێ بکاتەوە.»

بە بزەو حەسرەتەوە گوتی. بە خۆشی و مەراقەوە.

گوتم: « یەکەم جار نیە، بەڵام پێدەچێ دواهەم جار بێ.»

« دواهەم جار؟ » بە خەم و سەرسووڕمانەوە پرسی.

گوتم: « کاڵێ هەواڵی ناخۆشی پێیە. هەواڵی گیرانی دووکەس لە هاوڕێکانی فەرهاد و، ڕێی تێدەچێ پۆلیس و ساواک بە شوێنی ئەویشیان زانیبێ.»

کاڵێ گوتبووی: « تۆ تاکەی دەبێ لە ماڵ نەچیتە دەر؟ » دوێنێ گوتبووی. فەرهاد پێکەنیبوو. زیاتر بۆ ئەوەی نیگەرانی لە چاوی کاڵێ بتارێنێ. گوتبووی: « حەز دەکەی ئێستا دەڕۆمە دەر.» ئەو قسە زیاتر کاڵێی ترساندبوو. تووڕە بووبوو. گوتبووی: « ئێمە دەبێ چۆن بزانین ئەو مەترسیە کە باسی دەکەی هێشتا ماوە یان نا؟ » ئەوسا گریا بوو. « دەترسم فەرهاد. تۆ ئاوا بێخەم و خەیاڵ لەم ژوورە دانیشتووی، دەترسم پۆلیس بڕژێنە ناو ماڵەکە و...» قسەکەی پێ تەواو نەکرابوو. کاڵێ پێشتر بە یارمەتی پیرێژن چی بۆ وەها ڕۆژ و، وەها ڕووداوێک پێویست بێ، کردبووی. پەیژەکەی لە حەسارەوە بۆ سەربانی ژوورەکانی پیرێژن هەڵپەساردبوو. لەوێشەوە چەند ڕێگەی بۆ هەڵاتن

و دەربازبوون دەست نیشان کردبوو. تەنانەت... پیرێژن دڵی نـەهاتبوو بڵێ: بێسوودە. نەیگوتبوو پۆلیس ئەگەر بە تەمای گـرتنی بـێن، بـەر لـە هەموو شتێک سەربانەکانی لێ دەگرن. پیرێژن پێشتر دیبووی. ساڵانێک لەوەبەر پۆلیس سەربانەکانیان
لە پیاوێکی هەڵاتووی خەڵکی گەڕەک گرتبوو.

کاڵێ پرسیارەکەی دووبارە کردبووەوە: « ئێمە دەبێ چۆن بـزانین کە مەترسی گیرانت نەماوە؟ » فەرهاد گوتبووی: « یەکێک لە هاوڕێکانم هەواڵم
بـۆ دێنـێ.» کاڵـێ گوتبـووی: « کامـەیان؟ عەینـەک لـە چاوەکـەیان؟ » گوتبووی:
« ناونیـشانەکەیم بـدەرێ، خـۆم دەچـم بـۆ لای.» فـەرهاد نەیدابوویـە. گوتبووی:

« پێویست بە چوونی تۆ ناکا. دڵنیام دێ. دڵنیام یەکێکیان دێ.»

کـەی؟ فـەرهاد حەفتەیـەک بـوو چـاوەڕوان بـوو. لـە جومعـەی رابوردووەوە. دوێنێکـەش جومعـە بـوو. گوتبـووی: « ئیمـڕۆ حەتمـەن یەکێکیان دێ. ئەگەر هیچ...» نەیگوتبوو ئەگـەر هـیچ نەقـەومابێ. کاڵـێ تێگەیـشتبوو. « ئەگـەر نـەهاتن چـی؟ » فـەرهاد ترسـەکەی پـێ نەشاردرابووەوە. کاڵێ گوتبووی: « ئەوان من دەناسن. چەنـد جـار لـە کۆڵان و لە بەر دەرکە دیویانم. دەچم دەڵـێم...» فـەرهاد ملـی نـەدابوو. گوتبووی: « حەز ناکەم کەس بە ئـاگری منـەوە بـسووتێ. حـەز ناکـەم تۆ...» کاڵێ لە پرمەی گریانیدابوو.

« من بە ئاگری تۆوە سووتاوم فەرهاد.» کاڵێ دوێشەوە گوتبووی. کاتێک
بە بۆنەی سـەردانی پیرێژنـەوە چووبـووە لای. گوتبـووی: « ئیمـڕۆش نەهاتن.» گوتبووی: « ناونیشانی هاوڕێکەتم نەدەیتێ لەم ژوورە ناچمە دەر.»

ئەو گوتی: « بۆ نەهاتنە سەر؟ »

شـەقاوەکانیان مانـدووە و دامـاو. خـشپەی پێیـان بێدەنگـەی پلیکانەکانی پێ ناشکێت. وەنەوزە کوتەی ژوورەکـانی پـێ ناقرتێت. نائومێد خۆی بـە ژوورەکەیدا دەکـات فـەرهاد. کاڵـێی بـە دواوەیـە.

وەک هەمیشە... نە وەک هەمیشە، سێبەرێکە و لە گەڵ کاڵبوونەوەی دوا گزەنگەکانـدا، کـاڵ بووەتـەوە کاڵـێ. چـاوە بێتینـەکانی چـی فرمێسکیان پێبووە لە حەسار هەڵیانڕشتووە. حەساری ماڵی پیرێژن تـەڕە. تـەڕی فرمێـسکی کاڵـێ و، پیرێـژن کێـشکی دوا مـاڵاوایی دڵدارەکان دەگرێت.

« دەبێ بڕۆم.»

بە شـەرمەوە دەیـڵێت فـەرهاد. بـە شـەرم و گریانـەوە. دەربەسـتی شکۆی پیاوانەی نیە.

« تۆ تێدەگەی، ناچارم بڕۆم. ئێستا یان ساتێکیتر پۆلیس دەڕژێنـە ئەم ماڵە و...»

« منیش دێم. لە گەڵ خۆت بمبە فەرهاد. بۆ هەر شوێنێک دەچی لە گەڵ خۆت بمبە.»

باوەشی پێدا دەکات کاڵێ. بە باڵای ترساویەوە شەتڵ دەبێت.

بە پاو پلیەوە. هەرەس دێنێت فەرهاد. دەڕووخێت.

ئەو نیگای لەو دیمەنە هەڵبڕی و گوتی: « من دەڕۆم.»

لە ژووری فەرهاد بوو. ژوورەکەی ئێستای نا. لە ماڵی پیرێژن بوو. نیگای شەرمەزار و، چاوەکانی تەڕ بوون. گوتم: « بەڵام هێشتا...»

رانەوەستا بـەردەوام بم. بـە پەلـە لـە ژوورەکـە چـووە دەر و، بـە پلیکانەکاندا داگەڕا. منیش شوێنی کەوتم. پیرێژن لە خوار پلیکانەکان، لە تـاریکی داڵانەکـە راوەسـتابوو. دەگریـا؟ ئـەو بەلایـدا تێپـەڕی. دەرکـە چێویەکەی کردەوە و...

لە کۆڵان بووین. گوتم: « بریا نەدەهاتیـە دەر و، دوا قـسەکانیانت دەبیست.»

دوا قسەی کاڵێ، دوا سالانێک هێـشتا لـە خەڵـوەتی کۆڵانـدا دەنگـی دەدایەوە.

« من ئەم خەمەم پێهەڵناگیرێ. دەرەقەت نایەم.»

ئـەو قەڵـەمەکەی دانـابوو. ئانیـشکی خـستبووە سـەر مێزەکـە و پەنجەی لە قژە سـەری رۆ کردبـوو. ئەفـسانەی بـیر کـەوتبووەوە. دوا ماڵاوایی خۆی و ئەفسانە.

گوتم: « ناتەوێ ئەم بەشەی چیرۆکەکە تەواو بکەی؟ »

گوتی: «ئەم بەشە هەرگیز تەواو نابێ.»

نۆزدە

رۆژێکیتریش ناسری بینیەوە. عەسرێکی سارد لە چایخانەیەکی قەرەباڵغی دەوری مەیدانە قەدیمیەکەی شار. ماوەیەک بوو بە کەمی لە ماڵ دەچووە دەر.
بە دووسێ رۆژ جارێک، بۆ کڕینی هەندێک کەلووپەلی پێویست و... بە پەلە دەگەڕایەوە. دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە. بۆ پشت مێزی نووسینەکەی.
مونیرە گوتبووی: «سێ حەفتەیە رووناک رۆشتووەتەوە و، تۆ لەم ماوەدا تەنها جارێک، ئەویش بە سەر پێوە سەری ماڵی ئێمەت داوە...»
مونیرە ئەم بەیانیە بە دڵپڕیەوە گوتبووی. تەلەفوونی بۆ کردبوو، گوتبووی: «نایەی بۆ ماڵمان.
کە تەلەفوونیشت بۆ دەکەین هەڵیناگری. کە دێین بۆلات...» مونیرە گریابوو. گوتبووی: «لە سەر چی لێمان تۆراوی؟ ئەگەر لە بەر فرۆشتنی ماڵ و حەسارەکەیە، هێشتا مامڵەکە نەبڕاوەتەوە. هێشتا قەباڵە نەنووسراوە و، پارە وەرنەگیراوە. من ئامادەم لە گفتی خۆم ژێوان ببمەوە. ئەگەر تۆ حەز بە فرۆشتنی ئەو ماڵ و حەسارە نەکەی، منیش حەز ناکەم. رووناکیش...» ئەو گوتبووی:
«باسی ماڵ و حەسارەکە نیە مونیرە. ئەم ماڵ و حەسارە ئیمڕۆ یان سبەی دەبێ بفرۆشرێ و، دەفرۆشرێ...» مونیرە گوتبووی: «ئەی

باسی چیە؟ دڵت لە چی ئێشاوە؟ لە کێ؟ بۆ وەک جاران...» مونیرە بە گریانەوە گوتبووی. ئەو دڵخۆشی دابووەوە.» بڕوا بکە دڵم لە کەس و لە هیچ نەئێشاوە. ئەگەر ئەم ماوە بە کەمی سەرم لێداون، سەرقاڵ بووم. کارم بووە. ئێستاش...» گوتبووی: «من دەبێ تا وادەی چۆڵ کردنی ماڵەکە دێ کارەکەم تەواو بکەم.» مونیرە گوتبووی:
«منیش دەمەوێ تا ئەو کاتە کارەکە یەکلایی بکەینەوە.»
کامە کار؟ ئەو سەیری هاتبوویە. بە سەرسووڕمانەوە پرسیبووی. مونیرە گوتبووی: «ژن هێنانەکەت.» ئەو پێکەنیبوو. وەک هەمیشە گوتبووی:
«من ژن هێنەر نیم مونیرە.» مونیرە تووڕە بووبوو. گوتبووی: «لە کیست دەچێ. چاکتر و جوانتر لە لەیلات دەست ناکەوێ. ڕووناکیش لەوەتی دیویەتی شەیدای بووە. خوشکی بمرێ ڕووناک. هەموو ڕۆژێک لە تارانەوە تەلەفوونم بۆ دەکا و دەڵێ خوازبێنیەکە بوو بە چی؟»
خوازبێنی؟ مونیرە گوتبووی: «ئیمشەو دەبێ بێیت بۆ ماڵمان. ئەگەر نەیەیت...» ئەو گوتبووی: «بەڵام من ئیمشەو...» مونیرە تەلەفوونەکەی دانابوو.
گوتم: «لەوە دەچێ ئەم چیرۆکە بە خۆشیەوە تەواو ببێ. خوازبێنی و زەماوەند و...»
بە پێکەنینەوە گوتم. ئەو سەری هەڵبڕی و سەیری کردم. لە پشت مێزەکەی بوو. گوتی: «دەترسم ئەم چیرۆکە هەرگیز تەواو نەبێ.»
لە بەر خۆیەوە گوتی. ماندوو بوو. ماوەیەک بوو شەوو ڕۆژ نووسیبووی و، گەیشتبووە دوا ماڵاوایی فەرهاد و کاڵێ.
فەرهاد کەلووپەلی ماڵەکەی بە پیرێژنی خاوەن ماڵی سپاردبوو. بۆ خۆی. چیان لێدەکا با بیکا. تابلۆکانیشی... پیرێژن گوتبووی دەست لە کەلووپەل و تابلۆکانی نادا. هەروا لە ژوورەکاندا دەیانهێڵێتەوە و، دەرکەیان لە سەر دادەخا. تا ڕۆژێک کە خۆی دەگەڕێتەوە. پیرێژن بە هیوای گەڕانەوەی فەرهاد بوو. گوتبووی چاوەڕوانی دەبێ. بەڵام کاڵێ زانیبووی گەڕانەوەیەک لە ئارادا نیە. گریا بوو. گوتبووی: «ئەم خەمەم پێهەڵناگیرێ، دەرەقەت نایەم.» ئەوسا
ون بووبوو. لە خەڵوەتی ئەو کۆڵانە داخراوو تەنگەبەرەدا، بۆ دووهەم

جار
ون بووبووەوە. یەکەم جار لە سپیەتی دواهەم تابلۆکەی فەرهاددا و، ئێستاش
لەچیرۆکەکەیدا. چیرۆکی فەرهاد لە سەر مێزەکەی ئەو بوو. چەند مانگ بوو وشە بە وشە و دێڕ بە دێڕ ژیابووەوە. لە سەر سەدو ئەوەندە لاپەڕە و، ئەو نیگای لە دەستنووسەکەیەوە بۆ دواهەم تابلۆکەی فەرهاد گوێزایەوە. دواهەم تابلۆکەی فەرهاد هێشتا بە دیواری ژوورەکەوە بوو. ئەو لێی ورد بووەوە. نیگای ماندوو هەراسان بوو. وەک نیگای فەرهاد. ئەو دەمە کە ویستبووی لە سپیەتی تابلۆی سەر سێپایەکەیدا کاڵێ ببینێتەوە و، نەیدیبووەوە. تابلۆکە هێشتا چەند هێڵی رەش و باریک و خوار و خێچ بوو. ئەو گوتی: « وەک چیرۆکەکەی.
چیرۆکەکەشی گێڕانەوەیەکی بێسەروو بنی...»
ئەو بە نائومێدیەوە گوتی. من ترسام. هەستام و لێی نزیک بوومەوە.
لە مێزەکەی و، دەستم بۆ کاغەزەکان درێژ کرد. چیرۆکی فەرهاد لە دەستمدا قورس بوو. قورستر لەوەی چاوەڕوانیم دەکرد. ئەوسا پێکەنیم. دیمەنێک
کە هەمیشە دووبارە دەبووەوە. گوتم: « ئەم چیرۆکە تەواو بووە.»
لە قسەکەی خۆم داچڵەکیم.
« تەواو بووە؟!»
ئەویش داچڵەکیبوو. بە سەرسوورمانەوە گوتبووی. ئەوسا بە داخەوە سەری راوەشاند.
« دوا چەند مانگ کاری بەردەوام دیسان گەیشتوومەتەوە بۆ یەکەم رۆژ و یەکەم دێڕێک کە نووسیومە.»
دەستم لە ژێر قورسایی دەستنووسەکەیدا لەرزی و، پەڕە کاغەزەکان بۆ سەر مێزەکە شۆڕ بوونەوە. گوتم: « دەبوو وابێ. تۆ چیرۆکەکەت لە دوا رۆژەکانی ژیانی فەرهادەوە دەست پێکردووە، دەبوو دوا پێداچوونەوەیەک...»
گوتی: « فەرهاد هێشتا لە خەڵوەتی ئەو کۆڵانە تەنگەبەرو داخراوەدایە.»

فەرهاد لە بەر رۆشنایی کزی پەنجەرەی ژوورەکەیدا بـوو. دەسـتە باریک و ئێسکنەکانی لە دەوری ئەژنۆی ئالاندبوو. سەری بە ملیەوە بـۆ سەر شانی شۆڕ بووبووەوە. وەک تەرمێکی دانیشتوو. تەرمی مۆمیایی پیاوێک... ئەو هەستا.
لە پەنجەرەکە نزیک بووەوە. پەنجەرەی ژوورەکەی خۆی یـان ژووری فەرهاد؟
لەو دیو پەنجەرەکەی روانی. دەرەوە سارد بوو. ئەو تەنکـە بـەفرە کـە دوێـشەو بـاریبوو هێـشتا لــە ســەر زەوی و، لــە ســەر لقــی رووتی درەختەکانی حەساری
ئەو دیو پەنجەرەکە نەتوابووەوە. بەستبووی. باڵندەیەکی رەشی گەورە بــە ســەر حەســارەکەو بــە ســەر ماڵــەکەی ئەوبــەر حەســارەکەوە دەسووڕاویەوە. ئەو ماوەیەک لێی رامـا. بـەو هیوایـە کـە ون ببـێ. کـە وەک هەموو جارێکیتر لە قاپی پەنجەرەکـە بڕواتـە دەر. ئەوسـا ئـاوڕی دایــەوە. وەهــا کــە کەسـێک بـانگی کردبـێ. پاڵـتۆکەی لەبــەر کـرد و ملپێچەکەی لە ملی ئالاند. گوتم: « بۆ کوێ؟ »
گوتی: « دەڕۆمە دەر. دەمەوێ بـزانم کاڵـێ دوا رۆشـتنی فـەرهاد چی بەسەر هاتووە.»
گوتی کاڵێ؟ گوتیئەفسانە؟ من هیچم نـەگوت. تێـدا مـابووم. لەبـەر رۆشنایی کزی پەنجەرەی ژوورەکەم دانیشم یان پاڵتۆکەم لەبەر بکـەم، ملپێچەکەم لە مل بئاڵێنم و لە ژوورەکەم بڕۆمە دەر؟...
ئەو ئێستا لـە دەرەوە بـوو. دەمێکـە بـوو لـە دەرەوە بـوو. وەکـو پیاوێک کەسێ یان شتێکی ون کردبێ و، لە کۆڵان و لە شەقامەکاندا لێـی بگــەڕێ، لــە روومــەتی رێبوارەکــان ورد دەبــووەوە. ژن و پیــاوو... ئاپۆرەی تاپۆگەلێک کە گورج و بە پەلە بەلایدا تێدەپەڕین. ئەو دەیبیـنین و، نەیــدەبینین. روومــەتی سەرماگەســتەیانی دەدی و نەیــدەدی. روومەتی مۆن و گرژ، بە بزەو پێکەنین. جووڵەی گورج و
بە پەلەی دەست و پێیان کە تێکەڵ دەبوو. گەمەیەکی سەرسـووڕهێنەر. هەوری هەناسەیان کە لەبەر دەمیاندا کەرت کەرت دەبـوو. چپـە و ژاوە ژاوو دەنگەدەنگیانی دەبیست و نەیدەبیـست. وشــەی خزیلـک، رسـتەی

تێکەڵ و ئالۆز و سەروو گوێ قرتاو... لە کێ دەگەڕا؟ چەند جار لەبەر خۆیەوە دوبارەی کردبووەوە. « لە کێ دەگەڕێم؟ لەکالێ؟ »

کالێ لەم کۆڵان و شەقامانەدا نەبوو. ئەو دەیزانی. لەم کۆڵان و شەقامانەدا ون نەبووبوو. کالێ لە شوێنێکیتر ون بووبوو. لە کۆڵانێکی داخراوی تەنگەبەر. لە شارێکیتر، شاری چیرۆکەکەی فەرهاد. ئەو سالانێک بوو ئەو شارەی بەجێهێشتبوو. ئێستاش کە گەڕابووەوە لە کەسانێکیتر دەگەڕا. لە کەسانێک کە کەسی ئەو شارە بوون. کە کەسی کالێ بوون. لەرەحیمی برای. لە کوڕە کوێرەکان. کوڕە کوێرەکانی چیرۆکەکە دوو مێرمندالی داماو بوون کە

لە سووچێک، لە پاڵ یەکتر دادەنیشتن و دەستیان هەڵدەبڕی. بۆ ئەوەی کۆترێک لە سەر دەستیان بنیشێ. رەنگە ئێستاش لە سووچێک لە پاڵ یەکتر دانیشتبێتن و دەستیان هەڵبڕیبێ. بۆ ئەوەی رێبوارێکی بە پەلەی خێرومەند، وردە پوولێکی بنکی گیرفانی بخاتە ناو دەستیانەوە... لە کوێ؟

ئەو پیاوێکی دی کە لە پێشیەوە دەڕۆیشت. سەلەیەک گلۆپی بە دەستەوە بوو دەیفرۆشت. پێی هەڵگرت و لێی نزیک بووەوە. « کاکە من لە دوو پیاوی کوێر دەگەڕێم. دوو پیاوی...»

کابرا ئاوڕی لێدایەوە

« یەکیان من نیم؟ »

بە پێکەنینەوە گوتی. ئەو داچڵەکی. پیاوێکی ئاوڵەڕوو، قاپووڕی پووچەڵی چاوەکانی دوو کونی ترسناک بوون. ئەو گوتی: « نا، ئەوان هیچیان ئاوڵەڕوو نەبوون. هیچیان دوو کونی ترسناک...»

نەیگوت. گوتی: « لە کوێ دەبێ لێیان بگەڕێم؟ »

کابرا گوتی: « ئەم شارە پڕە لە ژن و پیاوی کوێر. لە هەموو کۆڵان و شەقامێک، لەبەر دەرکەی هەموو مزگەوتێک، لە دەوری هەموو مەیدانێک...»

ئەوسا گوتی: « دەوری ئەو مەیدانە پڕە لە پیاوی کوێر.»

ئەو بەرەو مەیدانەکە چوو. مەیدان و پیادەڕۆی دەوری مەیدانەکە وەک هەمیشە قەرەباڵغ بوو. تاکسی و ئۆتومبێلە شەخسیەکان قەتارەیان بەستبوو.

لە هەر چوارلای مەیدانەکە و، لە سەرەتای ئەو شەقامانە کە هەر کامیان بەرەو لایەکی شار دەچوون، خەڵک بە کۆمەڵ راوەستابوون و چاوەڕێی تاکسی بوون.
لە پیادەڕۆکەشدا خەڵکێکی زۆر شت و مەکی جۆراو جۆریان لە سەر زەوی
بۆ فرۆشتن بڵاو کردبووەوە و،هەرا هەرا بانگی مشتەریان دەکرد. چەند کەسێکیش... ئەو لێیان ورد بووەوە. کەسیان کوێر نەبوون. تەنانەت ئەوانەش
کە لە گوێ جۆگەی شەقامەکە دانیشتبوون و سواڵیان دەکرد، کوێر نەبوون.
ئەو لە یەکێکیان نزیک بووەوە. نەویەوە و گوتی: « تۆ دوو پیاوی کوێر ناناسی دەستیان گرتبێتەوە و...»
کابرا سەری هەڵبڕی. گوتی: « دوو پیاوی کوێر؟ »
بە تووڕەییەوە پرسی. گوتی: « بۆ پێت وایە پیاو کوێر نەبێ خێری پێناشێ؟ منیش مستەحەقم. چی دەدەی بە ئەوان بیدە بە من.»
ئەوسا قاچە قرتاوەکەی نیشان دا. لەولاشیەوە یەکێکیتر دەستە کۆڵەکانی هەڵبڕی. ئەو نائومێد هەستا و، بە ناو قەرەباڵغی خەڵکەکەدا تێپەڕی. دەنگێکی ناسکی ژنانە رایوەستاند.
« خێری جوانیەکەت.»
دەنگی ژنە قەرەچێکی قەڵەویچکە و رەشتاڵە بوو. لە گەڵ ئەوی نەبوو. بەریبە کابرایەکی باریک و چلکنە گرتبوو. کابرا چاوی بووبووە چوار چاو.
« خوا قەزاکەت...»
ژنە قەرەچ سیوای لە چاوی حیز بووبووەوە. گوتی: « پەنجا تمەن.»
کابرا دەستی لە گیرفانی خاڵی رۆ کرد و، دەریهێنایەوە. گوتی: « پارەم نیە. بەڵام ئامادەم بتخەمە سەر قەڵاندۆشم و چوار سووڕ بەم دەورە مەیدانەدا بتگێڕم.»

ئەو پێکەنی. ژنە قـەرەچیش پێکـەنی و کولـمە و غەبغـەبی رەش و گۆشتنی لەریەوە. گوتی: « راست دەکەی بە تەنها سوورێک بەم دەورە مەیدانەدا بگەڕێو مەکەوە زەوی.»

ژنە قەرەچ بەدەم پێکەنینەوە لە قەرەباڵـغیەکەدا ون بـوو. کـابراش ون بوو. سێ منداڵـی بچـووک لـە دەوری ئـەو ئـالان.« پێڵاوەکانـت بـۆ واکس کەین.»

هەریەکەو سندووقێکی بچووکیان بە شانەوە بـوو. ئـەو لێیـان ورد بووەوە و هیچی نەگوت.

« خاسی واکس دەکەین. بیست تمەن... پانزدە تمەن...»

هەرە بچووکەکەیان بە پاڕانەوەوە گوتی: « دە تمەن.»

لە شوێنێکەوە، رەنگە لە تۆمارگەیەکەوە گۆرانیەک بڵاو دەبووەوە.
« تۆ چاوت نەیشـێ...» لە ریزی ئەو خەڵـکەدا کـە چـاوەڕوانی تاکسـی بوون
قرموو قاڵێک بەرز بووەوە. پیرێژنێکی کۆڵوانە لە کۆڵی شەدە لـە سـەر، حۆقێ تفی رۆ کـرد. « ئـاخر زەمانـە... بـە رۆژی روونـاک...» کچێکـی جوان، ترساو لە ریزەکە هاتە دەر. کوڕێکیگەنج بەولاوەتر هەرای لێکرد.
« ئافــەرەم... ئەمــەش شـێوەیەکی تـازەی بازارگــەرمی و مــشتەری دۆزینەوەیە.» کچەکەش ون بوو.
ئەو دیسان هەنگاوی هەڵێنایەوە. دیسان لە خەڵکەکە و لە روخساری...
پەیکەری ناوەراستی مەیدانەکە سـەرنجی راکێـشا. پەیکـەری لـە سـنگ بـەرەو ژووری ژنێـک. ژنەکەچارشـێوی بـە سـەرەوە بـوو. دەسـتی هەڵبڕیبوو. بە قامک ئیشارەی
بۆ شوێنێک دەکرد. بۆ کوێ؟ لـە دامـێنی پەیکەرەکـە بـە خـەتێکی رەش نووسرابوو
« حیجـاب زینــەتی ژنانــە.» ئــەوە تــەنها نووســین نــەبوو. ریزێـک نووســـــراوەی ســـەر پارچـــە بـــەدەوری نـــەردەی مەیدانەکـــەوە هەڵواسرابوون. « یەکەمین کۆنگرەی ژن
لە کۆمەڵـگەی مەدەنیـدا.» بـەولاوەتر « گەڕانــەوەی پاڵـەوانی کاراتــەی وڵات
بۆ شارەکەمان...» دەنگدان بـە... دەنگـدانی دووبارەیـە بـە ئیـسلاحات

و...»
ئــــەو شــــوێن ئیــــشارەتی قــــامکی پەیکەرەکــــە کــــەوتبوو. هێــــشتا گۆرانیەکەیدەبیست.
« با چاو من بێشێ...» نـاوی خـۆی بیـست. « میهرەبـان... میهرەبـان» راوەستا و ئاوڕی دایەوە. دوو پیاو دەست لە ناو دەستی یەکتر بەلایـدا تێپەڕین. کوێر بوون؟ وردو بە سڵەوە بە ناو خەڵکەکەدا دەڕۆشتن.
« میهرەبان...»
کەسێک لە ناو دەرکەی چایخانەیەکـەوە دەسـتی لـێ هەڵـدەتەکاند. دەنگی ئاشنا بوو. زەردەخەنەکەشی. ئەو نەیناسیەوە. گوتی: « لە گـەڵ منتە.»
کابرا بەرەو پیری هات.
« نامناسیەوە؟ »
ئێستا ئیتر لە باوەشی کابرادا بوو. لـە قەرەباڵـغیەکەدا. ئـەملاولای یەکتریان ماچ دەکرد. روومەت و لێوەکـانی کـابرا سـارد بـوون. بـەڵام هەناسەی...
« تۆ بۆچی نامناسیەوە؟ تۆ بۆچی هاوڕێ دلێر ناناسیەوە؟ »
کابرا بە توانجەوە گـوتی و، ئـەو بـیری کەوتـەوە. بـزەی بـزووت. گوتی:
« ئەوە تۆی کوورش؟ »
جارێکیتریش ئەملاولای یەکتریان ماچ کردەوە. حەماڵێک بە کۆڵەوە خۆی پێدا کێشان. ژنێکیتر لە ناو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا قیژاندی. کـوڕێکی مێرمنداڵ
بە ترس و خۆشیەوە هەڵات.
« ئەوە تۆ لێرە چی دەکەی؟ »
کـوورش خۆشــحاڵ بــوو. ئــەو گــوتی: « لــە دوو پیــاوی کــوێر دەگەڕێم.»
ئەویش خۆشحاڵ بوو. ئەوسا دوو بە دوو خۆیان بـە چایخانەکـەدا کرد.
ئەو پێشتریش هاتبووە ئەم چایخانە. لـە سـووچێک دانیـشتن. کـوورش داوای دوو چای کرد و گوتی: « لە دوو پیاوی کوێر دەگەڕایت؟!»

ئـەو داچـڵەكی. كـوورش پێكـەنی. گـوتی: «لــە نـاو ئــەم هــەموو كوێرەدا...»

بەردەوام نـەبوو. قـسەكەی گـۆڕی و، گـوتی: «مـن پێموایـە ئێـرە ئێستاش خۆشترین چایخانەی دنیایە. تۆش وا ناڵێی؟ »

ئـەو چـاوی بــە نـاو چایخانەكـەدا گێـڕا. دیوارەكاشـیكاریەكان و رەســمی پاڵــەوانە قەدیمیــەكان. ریـزی مێـز و كورسـیە چێویــەكان و، زرنگەی پیاڵە و ژێرپیاڵە و قوڵتەقوڵتی قلیان و... نـاو چایخانەكـە گـەرم بوو. گەرم و قەرەباڵغ. ئەو گوتی: «جگە لە چایچی و مشتەریەكان، هیچ شتێكی ئەم چایخانە نەگۆڕاوە.»

كوورش گوتی: «ئەڵبەت ئێستا دوو كەس لە مشتەریەكانیش...»

كـوورش خۆشــحاڵ بـوو. دەسـتی خـستبووە سـەر شـانی ئـەوو بەردەوام بوو:

«لێرە تەنها مرۆڤەكان دەگۆڕێن.»

دیسان لاروومەتی ماچ كردەوە. گوتی: «بڵێ بـزانم تـۆ لێـرە چـی دەكەی؟

تۆ بۆ لێرەی؟ »

ئەو لای لێكردەوە. كـوورش قـژی بـە سـەرەوە نـەمابوو. ریـش و سـمێڵی سپی بووبوو. كەمێك قەڵەو بووبوو. بـەڵام... لـە بـەر خۆیـەوە گوتی: «بەڵام نیگای، نیگای كوورشـەكەی جارانـە. هـاوڕێ دلێرەكـەی جاران.»

ئەوو كوورش پێكەوە لێرە رۆشتبوون، ساڵانێك لەمەبـەر. لـە دەرەوەش چەند مانگێك پێكـەوە بووبوون. ئەوسا ئـەو رۆشـتبوو بۆ توركیە و...كوورش گوتی:« مەگەر تۆ

لە ئوروپا نەبوویت. كەی گەڕاویتەوە؟ »

ئەو گوتی: «نزیكەی پێنج مانگە.»

«بە ئێجگاری؟ »

ئـەو نەیـدەزانی. زەردەخەنەیـەكیكرد و هیچـی نـەگوت. كـوورش گوتی:

«بەو هیوایەش گەڕابێتیەوە دوا چەند مانگیتر دەڕۆیتەوە. پێموانیـە ژن و منداڵەكەت...»

قسەکەی تەواو نەکرد. بە پێکەنینەکەی ئەودا تێگەیی. گوتی: « کەواتە
بۆ ژن هێنان گەڕاویتەوە.»

گوتی: « ئێمەمانان لە هەر کوێ بین، لە گەڵ ئافرەتی لای خۆمان نەبێ هەڵناکەین. تەنها ئافرەتی لای خۆمان دەتوانێ گوزەرانمان لە گەڵ بکا. تەنانەت لە دەرەوەی وڵاتیش. لە ئوروپاش.»

گوتی: « رەمەزانیش یەک دوو ساڵ لەمەبەر لێرە ژنی خواست. مەنسووری رەمەزانی. دەتناسی؟ ئەو نەهاتەوە. لێرەوە پوورزایەکی خۆیان بۆ نارد. کچێکی هەژدە ساڵە...»

کوورش قاقا پێکەنی. مشتەری چایخانەکە بە سەرسووڕمانەوە لایان لێکردەوە. ئەو گوتی: « من بە تەما نیم ژن بێنم.»

بە مونیرەشی گوتبوو. مونیرە پێکەنیبوو. گوتبووی: « تۆ هەر بە تەما مەبە. ئەگەر من خوشکە گەورەت بم دەزانم چۆن ملت بە پەتەوە بکەم و، کچێکی...» نەیگوتبوو کچێکی هەژدە ساڵەت بۆ بێنم. گوتبووی: « لەیلا زۆر کچی چاکە. تۆشی زۆر خۆش دەوێ.» نەکا مونیرە بەبێ ئاگاداری ئەو...

کوورش گوتی: « بڵێ بزانم ئەم هەموو ساڵە لە دەرەوەی وڵات چۆن ژیاوی؟ چیت کردووە؟ »

ئەو نەیگوت دەرسم خوێندووە. نەیگوت لە ماڵێکی چل و ئەوەندە مەتریدا... تەنانەت نەیگوت چیرۆکم نووسیوە. هیچی دەربارەی خۆی و ئەو هەموو ساڵە نەگوت. گوتی: « باسی خۆتم بۆ بکە کوورش.»

کە ئەو رۆشتبوو بۆ تورکیە، کوورشیش دوا چەند مانگ گەڕابووەوە بۆ ئێرە. زۆر لە شاخ و لە عێراق نەمابووەوە و، چەکیشی هەڵنەگرتبوو. بۆیە لێی خۆش بووبوون. چەند شەو گرتبوویان و بەریاندابوو. کوورش ویستبووی بگەڕێتەوە
بۆ زانکۆ و خوێندنەکەی تەواو بکا. نەیتوانیبوو. نەیانهێشتبوو. ماوەیەک لە سەر سفرەی باوکی خواردبووی. سفرەیەکی هەژارانە. باوکی هەژار بوو. بەو حاڵەش لە ترسی ئەوە نەکا دیسان بڕواتەوە و، بۆ ئەوەی هۆ بداتەوە سەر کار و ژیانی، چی پاشەکەوتی تەمەنی بوو دابووی و

ژنێکی بۆ خواستبوو. کچێکی خزمی خۆیان کە ئەلف و بێیەکی خوێندبوو هیچیتر.
کوورش گوتی: « پیاوانە هۆم دایەوە سەر ژیانم و ئێستا باوکی شەش کچ و کوڕێکم.»
کوورش پێکەنی و، ئەو بە خەمێکی شاردراوەوە لێی راما. کوورش گوتی:
« کچە گەورەکەم چواردە سالانەیەو، کوڕەکەشم تازە پێی هەلگرتووە.»
ئەوسا دەستی کرد بە گێڕانەوەی هەندێک رووداوی ژیانی لەم هەموو سالەدا... کە ژنی خواستبوو کلۆلی و لێقەومانی لێ دەرکەوتبوو. ژن و مندال نانیان دەویست. جلووبەرگیان دەویست و ئەویش کوڕە هەژارێکی دەست و پێ سپی بێپارە و بێدەسمایە... چەند سالێک خۆی بە ئەم برادەرو ئەو برادەرەوە هەلواسیبوو، بەلام هیچی بە هیچ نەبووبوو. گوتی: « هەر ئەو برادەرانە
کە مافی هەژار و کرێکاریان دەویست و، گوریسیان بە دەستەوە دەگرت و،
زەوی زاریان لە ناو جووتیاراندا بەش دەکرد، بەشێکیان بوون بە تاجر و قاچاغچی و خاوەن کارگە و... لە بەیانیەوە تا ئێوارە وەک سەگ دەیانڕەتاندم و تێر سکی خۆم و مال و مندالمیان نەدەدامێ.»
کوورش ئێستا لە هەمیشە تێر و تەسەلتر بوو. شەوان تا بەیانی لە پیادەڕۆی دەوری ئەو مەیدانە جگەرە و شیری گەرم و کێکی دەفرۆشت. بەو موسافیرە غەریبانە کە نیوەشەوان دەگەیشتن و لە دەوری مەیدانەکە دادەبەزین.
بە شۆفیری ئەو تاکسی و ئوتومبێلانە کە چاوەڕوانی موسافیری شەوانە بوون.
بە کەسانی لانەواز و...
ئەو گوتی: « ئەی رۆژان چی دەکەی؟ »
« رۆژان دەخەوم. یان دێم بۆ ئەم چایخانە و...»
چایخانە قەرەبالغ بوو. سەرمای دەرەوە پالی بە خەلکەکەوە دەنا و،
دەستە دەستە دەهاتنە ژوور. ئەو لە روومەتی یەکە یەکەیان ورد دەبووەوە. روومەتی مات و تێکشکاوو ئێسکن، لە پشت هەلم و

دووکەڵـی نـاو چایخانەکـەوە. ڕوومـەتی مانـدوو وەڕس. وەک ئـەو ساڵانە... وەک پۆرترەکانی فەرهاد. ئەو بیری کـردەوە، دەبـێ فـەرهاد ئەو ساڵانە بە زۆری هاتبێتە ئێرە و لە بەر ئەم ڕوومەتانـەوە پـۆرترێتی کێشابێتەوە. کوورش قسەی بۆ دەکرد و، لەو کاتـەدا ئـەو کەسـێکی دی کە خۆی بە چایخانەکەدا کرد. کەسێکی ئاشنا. ناسری بوو. وەک جـاری پێـشوو سـەروو قـژی ئـاڵۆز و تەنکـە ڕیـشێکی سـپی و... ئـەمجارە پاڵتۆیەکی کۆنیشی

لە بەردا بوو. ناسری چوو لە سووچێک لە سەر چوارپایەیـەک دانیـشت. سـەرمای بـوو. خـۆی گرمۆڵـە کردبـوو. دەسـتی ئـاخنیبووە گیرفـانی پاڵتۆکەی و، جگەرەیـەکی نیـوە سـووتاوی بـە دەمـەوە بـوو. لـە کێـی وەرگرتبوو؟

« کوورش ئەو پیاوە دەناسی؟ »

ئەو گوتی و، بە دزیەوە قامکی بەرەو ناسری درێـژ کـرد. کـوورش شوێن ئیشارەتی قامکی کەوت. گوتی: « بۆ تۆ نایناسـیەوە؟ ناسـری... کاوەی ناسری... کوڕی...»

ئەوسا زەردەخەنەیەکی تاڵی کرد و، بە داخەوە سـەری ڕاوەشـاند. گوتی:

« ناحەقت نیە نەیناسیەوە. گەمەی ڕۆژگار وای لێکردووە خۆشی خـۆی نەناسێتەوە.»

ئـەو گـوتی: « ناسـری کوڕێکیجـوان و تـەڕپۆش بـوو. پـۆیـەکی سەوزی مودێل باڵایلە ژێر پێدا بوو. جاروباریش سێتاری دەژەند...»

لەبـەر خۆیـەوە گـوتی. وەک جـاری پێـشوو کـە لەبـەر خۆیـەوە گوتبووی و... ئەمجارەش کوورش گوێی لێبوو. گوتی: « پیاو بە بینینی کەسـێکیوا حاڵـوو ڕۆژی خـرایی خـۆی لـەبیر دەچێـتەوە. ئێـمـەمانان لە پێناوی خەونێکـی خۆش و ئینسـانیدا ئاوامان بەسەر هاتووە. بەڵام کەسێکی وەک ناسری...»

بە خەمەوە گوتی. قسەکەی تەواو نەکرد. ئـەو هەڵـیدایە: « ناسـری چی بەسەر هاتووە؟ »

تێکچووە. دەمێک ساڵە تێکچووە. پاش ئەوەی هـەموو سـەروەت و سـامانی بـاوکی دانـاوە، پـاش ئـەوەی ژنەکـەی مـردووە، تێکچـووە. ماوەیەکی زۆر لە تاران

له نەخۆشخانەیەکیدەروونی بووەو ئێستاش، ساڵێکه گەڕاوەتەوە بۆ ئێرە. پیاوێکی کلۆڵ و بێئازارە. کاری بە کاری کەس نیە. تەنانەت لە گەڵ کەسیش نادوێ.»
« ئەی لە کوێ دەژی؟ لە لای کێ؟ لە لای خزم و کەس و کارەکەی؟ »
« خزم و کەس و کارێکی وای نیە. باوکی دەمێکەیە مردووە. مامەکانیشی لێرە نین. گوایە لای پوورێکی پیری دەژی. پیرێژن ژوورێکی پێداوە و
ژەماو ژەم...»
کەسێک هات و لە لاشانی ئەوەوە دانیشت. پیاوێکی کەتە بوو. جێی پێ تەنگ کرد. کوورش گوتی: « پێت خۆشە برۆینە دەر؟ »
ئەو هێشتا چاوی لە ناسری بڕیبوو. ناسری خەمۆک و داماو جگەرەی دەکێشا. ئەویش جگەرەیەکی داگیرساند و گوتی: « نا. ئەگەر دەکرێ داوای
دوو چایتر بکە.»
کوورش داوای دوو چایتری کرد. ئەو گوتی: « ناڵێن بۆ وای لێهاتووە؟ »
کوورش سەری راوەشاند. بە خەمەوە. گوتی: « چیرۆکی ناسری چیرۆکێکی سەیرە. هەرکەس شتێکی لێ دەزانێ و بە جۆرێک دەیگێڕێتەوە.
زۆر کەس دەڵێن ئەم نەخۆشیە لە بنەماڵەیاندا بووە. لە بنەماڵەی دایکیدا. دەڵێن تاقە خاڵەکەشی لە شێتخانە مردووە. دایکیشی بەرلە مردنی...»
ئەو گوتی: « بەڵام ناسری ئەو ساڵانە گەنجێکی ماقووڵ دیار بوو.»
کوورش پێکەنی. وەک ئەوەی بڵێ ئەم هەموو پرسیارە بۆ چیە؟ یان بڵێ نێوانی ماقووڵ و ناماقووڵی... بەڵام نەیگوت. گوتی: « پارە سرپۆشە. دەڵێن
ئەو ساڵانەش ناتەواو بووە. لە منداڵیەوە ناتەواو بووە. کوڕێکی تەنها و دوورە پەرێز کە هەمیشە لە ماڵەوە خزاوە و خەریکی سێتارژەنین بووە... دەڵێن ئەو ساڵانە، تەنانەت ئەو رۆژانەش کە هەموو خەڵکی شار، شێت و عاقڵ رژاونەتە ناو شەقامەکان و لە خۆپیشاندانەکاندا

بەشداریان کردووە،
ئەو بە دەگمەن لـە مـاڵ هاتووەتـە دەر. رۆژێکـیش کـە هاتووەتـە دەر، کچێکیدیوە و شەیدای بووە. کچێک لە بنەماڵـەیەکی هـەژار. دەڵـێن ئـەو شەیداییە تا رادەیەکی زۆر ژیـانی گۆڕیـوە. لـەو خەڵـوەت و خەمۆکیـە هێناویەتە دەر...»
کوورش گوتی: « ئەو دەمانە کە من و تۆ دیومانە. ئـەو دەمانـە کـە خۆی رازاندووەتەوە و سـوار پڕۆیـەکی سـەوزی مودێـل بـالا بـووە و، یەکدو جاریش
لە بۆنەکاندا سێتاری ژەندووە... ئەو دەمانە عاشق بووە...»
« واتە بۆ رازی کردنی کچەکە...»
« کلۆڵ ئەفسانە.»
من گوتم. کاتێک ئەو گەڕابووەوە بۆ ماڵ و قسەکانی کوورشی
بۆ دەگێڕامەوە، گوتم: « کلۆڵ ئەفـسانە... کەواتـە شـووی بـە پیـاوێکی ناتەواو کردووە.»
ئەو هیچی نەگووت. هێشتا بڕوای بە قسەکانی کوورش نەکردبوو.
بـە گوایـە و دەڵـێنەکانی. پیـاوێکی لێقـەوماوی وەک ناسـری، پیـاوێکی ساماندارێ لێکەوتوو. کەسێک کە هیچ ناڵێ جگە لەوەی جاروبـار داوای جگەرە دەکا، سروشتیە کە لە پـشت سـەدان گوایـە و دەڵـێنی راسـت و درۆوە ون بووبێ و نەناسرێتەوە. ئەو بیری کردەوە، حەتمـەن جـەلالی لە کوورش باشتری دەناسێ. بێگومان ئەو بە راستیەکان دەزانێ. بۆ تـا ئێستا دەربارەی ناسری هیچی
لە جەلالی نەپرسیبوو؟ بۆ جەلالی لەم ماوەدا هیچی دەربارەی ئەفـسانە نەگوتبوو؟
گوتی: « شەوی جومعە جەلالی دێ بۆ ئێـرە و هـەموو شـتێکی لـێ دەپرسـم. دەربـارەی ناسـری... تێکچـوونی ناسـری... دەربـارەی ئەفسانە...»
بە ترسەوە گوتی. گوتی: « من هێشتا نازانم ئەفسانە چۆن و بۆچی مردووە. حەتمەن جەلالی دەزانێ.»
لەبەر خۆیەوە گوتی.
ئەفسانە دوا رۆشتنی ئەو چی بەسەر هاتبوو؟

## بیست

ئێوارەی یەک شەنبە یان دوو شەنبە بوو کە ئەو کوورشــی دیبــوو؟ هاوڕێ دلێر کورتەی چیرۆکێکی بـۆ گێـڕابووەوە، پەرێـشانی کردبـوو. کورتەی چیرۆکی ناسری. گوتبووی: « هەرکەس بە شێوەیەک چیرۆکی ناسری دەگێڕێتەوە.» نـەیگوتبوو چیرۆکیناسـری و ئەفـسانە. کـوورش ئەفسانەی نەدەناسی و ئاگـاداری خۆشەویـستی نێـوان ئـەو و ئەفـسانە نەبوو. تەنها جەلالی بوو کە ئەفـسانەی دەناسـی و، جـەلالیش حەتمـەن چیرۆکی ناسری بیستبوو. چیرۆکی ژیانی هاوبەشی ئەفسانە و ناسری. جەلالی حەتمەن دەیزانی ئەفسانە دوای رۆشتنی ئەو، دوای شووکردنی بە ناسری چی بە سەر هاتووە. ئەی بۆ تا ئێـستا هیچـی نـەگوتبوو؟ بـۆ

باسی ناسری و، تەنانەت باسی ئەفسانەشی نەکردبوو؟ جگە
لە چەند ئیشارەت و گێڕانەوەی هەندێک بیرەوەری کۆن کە ئەفسانەش
کەسی ئەو بیرەوەریانە بوو. رەنگە چونکا ئەو هیچی نەپرسیبوو. ئەو
گوتبووی:
« ئەمجارە کە جەلالی بێت بۆ ئێرە هەموو شتێکی دەربارەی ناسری و
ئەفسانە لێدەپرسم». ئایا جەلالیش قسەکانی کوورشی دووبارە
دەکردەوە؟ کوورش گوتبووی: « ناسری لە منداڵیەوە شێت و ناتەواو
بووە.» ئایا ئەو ئەفسانەی
بە پیاوێکی شێت و ناتەواو سپاردووە؟
ئەو دەبوو تا ئێوارەی پێنج شەنبە، تا شەوی جومعە چاوەڕوانی
وەڵامی
ئەو پرسیارانە بێ، بەڵام لە توانایدا نەبوو. یەکەم شەو، دوا ئەوەی
گەڕابووەوە بۆ ماڵ، ویستبووی هەموو قسەکانی کوورش فەرامۆش
بکا. ناسری و ئەفسانە و... هەموو ئەو کەسانە کە کەسی رابوردووی
بوون لە بیر بباتەوە. سەرەتا ویستبووی بیر لە لەیلا بکاتەوە. چەند
رۆژ لەوەبەر لەیلا پیتچنی شێعرەکانی بە نەشمیلدا بۆ ناردبوو.
گوتبووی: « حەز دەکەم سەیرێکیان بکاتەوە. سەیری دەرهێنانی
هونەری و، رازاندنەوەی لاپەڕەکان و...» لەیلا بە پێی ئامۆژگاریەکانی
ئەو بە چەند شێعرێکدا چووبووەوە. چەند وشەیەکی گۆڕیبوو. ئەو
جارێکیتریش شێعرەکانی خوێندبووەوە. ئەو کاتەی کە دەستنووس
بوون سەمیمیتر بوون. ناوی دەفتەرەکەش... « حەوا تۆبە لە تاوانەکەی
خۆی ناکات.» کامە تاوان؟ ئەو لە خۆی پرسیبوو. تاوانی خەڵەتاندنی
ئادەم؟
بە خەمو داخەوە سەری راوەشاندبوو. ئەو کچە دەیویست چی بڵێ؟
چۆن سەیری ژیانی دەکرد؟ ئەو تێنەگەیشتبوو. نەیناسیبوو. لەیلا
نووسیبووی:
« پێشکەش بە میهرەبانیەکانی...» سەرەتا پێشکەشی کردبوو بە
میهرەبانیەکانی باوکی. دواجار پێشکەشی کردبوو بە میهرەبانیەکانی
ئەو. ئەو چ میهرەبانیەکی دەرحەق بە لەیلا کردبوو؟ باوکیشی
میهرەبانی پێ نەکردبوو. بەرلەوە میهرەبانی پێبکا مردبوو. کوژرابوو.

لەیلا گوتبووی: « تۆ زۆر لە باوکم دەچی.»
بە شەرمەوە گوتبووی. گوتبووی: « باوکم عاشقی دایکم بوو.» کەی ئەوەی گوتبوو؟ گوتبووی؟ مونیرە گوتبووی: « لە لەیلا چاکتر و جوانترت
دەست ناکەوێ. لەیلا تۆی زۆر خۆش دەوێ.» بۆ دەبوو لەیلا ئەوی خۆش بوێ؟ ئەفسانەش ئەوی خۆش ویستبوو، بەلام ئەو بەجێی هێشتبوو. سالانێک لەمەبەر. وەک فەرهاد کە کالێی بەجێهێشتبوو. لە کۆلانێکی داخراوو تەنگەبەردا...

من گوتبووم: « بەلام فەرهاد ناچار بوو کالێ بەجێبێلێ.» ئەو شەوە نەمگوتبوو. رۆژی دوایی گوتم. دوا ئەوەی تەلەفوونی بۆ جەلالی کرد و گوتی حەز دەکا ئیمشەو پێکەوە بن. گوتم: « فەرهاد بە حەزو خواستی خۆی کالێی بەجێنەهێشت. فەرهادیان گرت. گرتیان و...»

ئەو لە هەیوان بوو. دەمێکە بوو دەرکەی ئاسنی حەساری کردبووەوە و،
لە هەیوان، لەبەر سەرمادا چاوەڕوان بوو. چاوەڕوانی هاتنی جەلالی و، هاوکات چاوەڕوانی کەسانێکیتری رابوردووی. ئەفسانە؟ ئەفسانە رۆشتبوو. بە گریانەوە لە دەروازەی چێوی حەسارەکە چووبووە دەر و، ئەو چاوەڕوانی هاتنەوەی باوکی بوو. بۆ ئەوەی خواحافیزی لێ بکا. ئەملاو لای ماچ بکا، دەستی ماچ بکا.
تا ئەو کاتە بە باوکی نەگوتبوو بە تەمایە بڕوا. باوکی هاتەوە. ئەو دی و، دلی داکەوت. باوکی لە هەمیشە پیرتر و کەنەفتتر بوو. لە هەمیشە ماندووتر. چاوی بە حەسارەکەدا نەگێڕا. لە ئاوی حەوزەکە دەستنوێژی نەگرت. ئاوی حەوزەکە سارد بوو. روون و زولال نەبوو، قەوزە گرتبووی. باوکی بە پلیکانەکاندا هەلگەڕا. بۆ هەیوان. لە سەر کورسیەکەی هەیوان دانیشت. بۆ ئەوەی پشوویەک بدا. چاوی بە هێلانەی لەقلەکان بە بەرزایی دارتووەکەی مالی دراوسێکەیان کەوت. هێلانەکە چۆل بوو. لەقلەقەکان کۆچیان کردبوو. ئەو لە باوکی نزیک بووەوە.
بە ترس و دوو دلیەوە هەوالی پرسی. باوکی سەری لەقاند. گوتی: « ئیمسال لەقلەقەکان زوو کۆچیان کرد. زوو بە جێیان هێشتین.»

ئەو گوتی: « منیش دەمەوێ بەجێتان بێڵم بابە. دەمەوێ بڕۆم.»
باوکی ئاوڕی لێدایەوە. لـە نـووکی پێیـەوە تـا تـۆقی سـەری. دوو دلۆپ فرمێسک لە چاویدا کۆ بووبووەوە. فرمێسکەکان بە ئارامی رژان.
باوکی گوتی:
« نەدەبوو بڕۆی. نەدەبوو بڕۆشتیتایە.»
باوکی لە بیری چووبووەوە ئەو هێشتا نەڕۆشتووە؟ ئەو رۆشتبوو.
جەلالی هـاتبوو. کـەمێک خـواردن و خواردنـەوەی لـە گـەڵ خـۆی هێنابوو. چەند شریتی کۆنیش کە هەرکامـەیان بیرەوەریـەکی سـاڵانێک لەمەبەریان لێ دەژیاندنـەوە. جـەلالی گـوتی: « کـە تەلـەفوونت کـرد و گوتت حەز دەکەی ئیمشەو پێکەوە بین، ترسام.»
ئەو لە ئاشپەزخانە بوو. گوتی: « لە چی ترسای؟ نەکا پێت وابووبێ ئیمشەو ئاخر شەوە پێکەوە دادەنیشین؟ »
جەلالی شوێنی کەوت. ترسەکەی ئاشکراتر بوو. گوتی: « دەتـەوێ بڕۆیتەوە؟ »
ئەو ئاوڕی لێدایەوە: « بۆ کوێ؟ »
ئەویش ترسا. لە نیگای جەلالی. لە پرسیارەکەی کـە وەک سـەهۆڵ سارد بوو. گوتی: « بۆ پێت وایە دەمەوێ بڕۆمەوە؟ »
جـــەلالی گـــوتی: « بیـــستوومەخەریکن ماڵـــەکەتان دەفرۆشـــن. بیستوومە
دوا ئەوەی بەشە میراتی خۆت وەرگرت...»
درێژەی پێنەدا. ئەو مانگێک بوو لە گەڵ جەلالی دانەنیشتبوو ئێستا خۆشحاڵ بوو لێرەیـە. خۆشـحاڵ بـوو پێکـەوەن. گـوتی: « چیتریـشت بیستووە؟ نەتبیـستووە بەرلـەوە ماڵـەکەمان بفرۆشـن و بەشـە مـیراتم بدەنێ، بە تەمان ژنم
بۆ بێنن؟ »
جەلالی گەشایەوە. بیستبووی. گوتی: « ژنت بۆ بێنن؟ کێ؟ لەیلا؟ »
« لەیلا؟! کەواتە ئەوەشت بیستووە.»
ئەو بە نیگەرانیەوە گوتی و، لە ئاشـپەزخانە هاتـە دەر. بـە بۆنـەی راخـستنی سـفرەوە هاتـە دەر و، لـە ژوورەکـەی، لـە سـەر مێزەکـە جگەرەیەکی هەڵگرت و دایگیرساند.

گوتم: « مونیره دەیەوێ بە هەر شێوەیەک بووە تۆ لەیلا بخوازی.»
ئەو نەیبیست. دڵی لە لای ئەفسانە بوو. لای ناسری. لای ئەو چیرۆکە
کە تا ساتێکیتر جەلالی بە سەرخۆشی بۆی دەگێڕایەوە.
جەلالیش لە ئاشپەزخانە هاتە دەر. ئەو سفرەکەی لای زۆپاکە پان کردەوە. بتریەک و دوو پیاڵە و کەمێک... جەلالی گڵۆپی ژوورەکەی هەڵکرد. زوو تاریک بووبوو. ئەو لە پەنجەرەیەکەوە لە دەرەوەی روانی. لە تاریکی ناوەختی دەرەوەدا بەفر پرووشەی دەکرد. جەلالی گوتی: « من دەمێکەیە لەیلا تلووعی دەناسم.
لە دوو، سێسالٚ لەمەبەرەوە. لەیلا دوا ئەوەی دەرسی تەواو کرد، بە هیوا بوو
لە ئیدارەی ئێمە دابمەزرێ.»
بە زەردەخەنەوە گوتی. گوتی: « لەیلا کچێکی عاقڵ و پڕ بەهرەیە. راستە لە تۆ گەنجترە، بەڵام...»
لە سەر سفرەکە دانیشتن و یەکەم پێکیان هەڵدا.
« ئەو رۆژە لە مۆزەخانە کە بەو شێوە تاریفی شێعرەکانت کرد، گوتم...»
ئەو گوتی: « دەمەوێ باسی کەسێکیترم بۆ بکەی.»
« کەسێکیتر؟ دەتەوێ باسی کێت بۆ بکەم؟ »
« ئەفسانە.»
جەلالی داچڵەکی. نەک لە قسەکەی، لە دۆخی روخساری داچڵەکی. جیدی و نیگەران بوو. نیگای هەڵوەدای، هەڵچوونی دەروونی دەنواند. دەتگوت تازە دەیدی. تازە پەی بەو هەراسانیە دەبرد. گوتی: « تۆ هێشتا ئەفسانەت فەرامۆش نەکردووە؟ »
ئەو گوتی: « تۆ ناسریت دیوە، وانیە؟ دیوتە چی بەسەر هاتووە؟ »
جەلالی گوتی: « هەموو رۆژێک دەیبینم. ناسری لەماڵی دراوسێیەکی
ئێمە دەژی.»
« لە ماڵی پووری؟ »
گوتی: « کەواتە چیرۆکەکەیت بیستووە. زۆرکەس دەیزانن.»

جەلالیش دەیزانی. چیرۆکێکی تاڵ بوو. دانیشتنەکەیانی تاڵ دەکرد.
گوتی: « هەندێ چیرۆک دەبێ فەرامۆش بکرێن.»
جەلالی هێشتا تالاوی یەکەم پێکی لە قورگدا بوو. گوتی: « بۆ نموونە چیرۆکی ناسری. گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە دوا سالانێک چ سوودێکی هەیە؟ »
خۆی پرسی و خۆی وەڵامی دایەوە.
« دڵنیا بە هیچ سوودێکی نیە. نە بۆ تۆ و...»
نەیگوت نە بۆ ناسری، یان ئەفسانە. گوتی: « من هاتووم خەمی ژیانت
لە گەڵ بە با بدەم. نەهاتووم...»
ئەو گوتی: « دەبێ بۆم بگێڕیتەوە.»
جەلالی بۆی گێڕایەوە. یەک دوو مانگ دوا رۆشتنی ئەو، ئەفسانە شووی
بە ناسری کردبوو. زەماوەندێکی سادە و بچووک. بە خواستی ئەفسانە یان
بە پێی نەریتی خەمباری ئەو سالانە؟ زەماوەندێکی بەبێ دەهۆڵ و زورنا و، هەڵپەرکێ و چۆپی کێشان. زاوا دەستی بووکی گرتبوو لە گەڵ خۆی بردبووی
بۆ تاران. بۆ ماڵێک کە گوایە پێشتر باوکی بۆی کڕیبوو. ماڵێکی خۆش لە گەڕەکێکی لای ژووررووی شار.
جەلالی نەیگوت ماوەیەک دواتر، رۆژێک کە بووک و زاوای تازە بۆ سەردانی کەس و کاریان هاتبوونەوە، دیبوونی. لە ئۆتومبێلێکی جواندا دیبوونی.
لای قەیسەریەکە دابەزیبوون. ئەفسانە لە هەمیشە جوانتر، مانتۆ و لەچکەیەکی گرانبایی لەبەردا بوو. کیفێکی جوانی بە شانەوە بوو. عەینەکێکی رەشی قاپ زێڕی لە چاودا بوو. ئارایشتێکی تۆخی کردبوو. جەلالی ئەفسانەی نەناسیبووەوە، بەڵام ناسری ناسیبووەوە. ناسریش وەک هەمیشە تەڕپۆش بوو. پیاوێکی بەختەوەر. بە بینینی جەلالی داچڵەکیبوو. بۆ ساتێک رەنگی پەڕیبوو. نیگای
لە ئەوەوە بۆ ئەفسانە گوێزابووەوە. پێدەچوو ئەفسانە جەلالی نەدیبێ.

ناسری دەستی گرتبوو. بووک و زاوا بە پەلە تێپەڕیبوون و خۆیان بە قەیسەریەکەدا کردبوو. جەلالی نەیگوت ئەو ڕۆژە بە بینینی ناسری و ئەفسانە بیری ئەو کەوتووەتەوە. بیری هاوڕێی هەلاتووی. یەکەو ڕێ چووەتەوە بۆ ماڵ و بە یادی ئەوەوە تێر گریاوە. گوتی: « ئەوان بۆ هەمیشە لە تاران مانەوە. تەنانەت دوا مەرگی باوکی ناسریش...»

باوکی ناسری ساڵێک دوا زەماوەندی کوڕەکەی مردبوو. لێرە، لە مزگەوتی گەورە پرسەیان بۆ دانابوو. جەلالیش چووبوو. ڕەنگە بۆ ئەوەی ناسری ببینێتەوە. بۆ ئەوەی بیری ئەو بکەوێتەوە و، یەکەو ڕێ بڕواتەوە بۆ ماڵ و بە یادی ئەوەوە... ئەمجارە ناسری هیچی لە پیاوێکی بەختەوەر نەچووبوو. مات و خەمۆک بوو. خەمۆکتر لە تاقانە کوڕێک کە باوکی مردبێ. لەسووچێکی لای خوارووی مزگەوتەکە دانیشتبوو. سەرنجی بە هیچ و بە کەس نەدابوو. تەنانەت ئەویشی نەدیبوو. مامەکانی بەخێرهاتنی خەڵکیان کردبوو. وەلامی سەرخۆشی خەڵکیان دابووەوە.

چەند ڕۆژ دوا پرسە، ناسری گەڕابووەوە بۆ تاران. حەتمەن لە گەڵ ئەفسانە. گوایە هەموو ماڵ و میراتی باوکی بە مامەکانی فرۆشتبوو. گوایە ئیتر هەرگیز نەگەڕابووەوە. یان ئەگەر گەڕابێتیشەوە جەلالی نەیدیبوو. نەیبیستبوو.

تا ئەو ڕۆژە کە هەواڵی مەرگی ئەفسانەی بیستبوو.

ئەو گوتی: « هەواڵەکەت چۆن بیست؟ ئەفسانە چۆن و بە چی مرد؟ »

جەلالی نەیدەزانی. ئەویش وەک ڕووناک هەواڵەکەی لە ڕۆژنامەدا دیبوو. سەرەتا سەیری هاتبوویە. ئەفسانە مرد؟ ئەوسا کەمێک گریابوو. یان نەگریابوو. کەوتبووە پرس و جۆکردن. گەڕابوو بزانێ لە کوێ، لە کام مزگەوت پرسەیان
بۆ داناوە. لە هیچ مزگەوتێک پرسەیان بۆ دانەنابوو. سۆراخی مامەکانی ناسری گرتبوو، هیچیان لێرە نەمابوون. جەلالی ئەودەمە پووری ناسری نەدەناسی و دراوسێیان نەبوو.

ئەو گوتی: « کەواتە بە هەموو چیرۆکەکە نازانی؟!»

بە خەمەوە گوتی. جگەرەیەکی داگیرساند و، لە گەڵ جەلالی پێکێکیتری هەڵدا.

جەلالی گوتی: «تا ئەو کاتە چیرۆکێک نەبوو کە من یان کەسێکیتر پێی بزانین. تا ئەو کاتە ژیانێک بوو لە قەرەباڵغی هەزاران هەزار ژیانیتردا
ون بووبوو.»

گوتی: «چیرۆکەکان دوا ڕووداوەکان دەگێڕدرێنەوە، یان دەنووسرێن. چیرۆکی ناسری و ئەفسانەش دوا ئەو ڕووداوانە کە تۆ چاوەڕێی بیستنیانی، دوا مەرگی ئەفسانە و پاشان دوا گەڕانەوەی ناسری بۆ ئێرە سەر زمان کەوت.»

ناسری چەند ساڵ دوا مەرگی ئەفسانە گەڕابووەوە. جەلالی یەکەم جار نەوەک لە قەرەباڵغی دەوری مەیدان، بەڵکو لە کۆڵانەکەی خۆیان دیبووی. جەلالی تازە ئەو ماڵەی کڕیبوو. ڕۆژێک کە هاتبووە دەر پیاوێکی پەککەوتەی کەنەفتی دیبوو کە لە دەرکەی یەکێک لە ماڵە دراوسێکانی هاتبووە دەر. سەرنجی نەدابوویە. بەلام پیاوەکە بەری پێگرتبوو. «جگەرەیەکم بدەریّ.» جەلالی دەستبەجیّ ناسیبوویەوە. «ناسری؟!» نەیگوتبوو. گوتبووی من جگەرەکێش نیم. ناسری تێپەڕیبوو. جەلالیش واق وڕماو شوێنی کەوتبوو. شوێنی نەکەوتبوو.
لە دووکاندارەکەی سەر کۆڵانی پرسیبوو: «ئەو پیاوە کێیە؟ ئەو پیاوە داماوە.» دووکاندارەکە بە داخەوە سەری ڕاوەشاندبوو. گوتبووی: «کوڕی حاجی ناسری. لە پیاوە سامانداڕەکانی ئەم شارە بوو.»

«ئەی بۆ وای لێهاتووە؟ لێرە، لەم کۆڵانە چی دەکا؟ »

«چیرۆکەکەی دوورو درێژە. ماوەیەکە لە شێتخانە دەریان کردووە و، لێرە لە گەڵ حاجی فاتمەی پووری دەژی...»

ئەو گوتی: «دەڵێن لە منداڵیەوە وابووە. دەڵێن پیرێژنەکەی پووریشی هەروا شێت و ناتەواوە.»

کوورش گوتبووی. بەلام جەلالی گوتی: «حاجی فاتمە پیرێژنێکی مەزڵووم و کەم دوێنە. هات و چووی کەس ناکا. لە گەڵ ژنانی گەڕەکیش زۆر تەبا نیە. بەلام لە گەڵ خێزانم... جاروبار کە من لە ماڵ نەبم سەر لە خێزانم دەدا و دەربارەی خۆی و کەس و کاری، دەربارەی خوشکەزا کلۆڵەکەی قسەی بۆ دەکا. دەربارەی ناسری...»

گوتی: « ناسری هەمیشە کلۆڵ بووە. لە منداڵیەوە، لەو دەمەوە کـە دایکی مردووە و... خەڵک پێیان وابووە لە هیچ شتێکی کەم نیە. بەڵام لە راسـتیدا هیچـی نـەبووە دڵـی پێـی خـۆش بـێ. تەنانـەت ئەودەمـە کـە ئەفسانەشی بووە...»

ناسری ئەفسانەی خۆش ویستبوو. لە یەکەم کاتـەوە کـە دیبـووی، شەوو رۆژ شوێنی کەوتبوو. ئەو کاتەش کە خواستبووی وەک پەروانـە لە دەوری گەڕابوو. بەڵام ئەفسانە...

ئەفسانە دەبێ زۆری هـەوڵ دابـێ ناسـری خـۆش بـوێ. دەبـێ بـە دەمیــەوە پێکــەنیبێ. بــە دڵــی بزوابێتــەوە. ئارایــشتی کردبــێ. خــۆی رازاندبێتەوە و،

لە بەرامبەری دانیشتبێ. دەبێ گوێی بۆ دەنگی سێتارەکەی شـل کردبـێ و، بەدەم هەوای مۆسـیقاکەیەوە چـاوی لێـک نابـێ و خـۆی راژەنـدبێ. دەبێ جاروباریش چاوی هەڵـێنابێتەوە و، خومـار لێـی روانیبـێ. نەرمـە بزەیەکی عاشقانەی

بۆ کردبێ و... ئەفسانە دەبێ وایکردبێ. ژن کە مێردەکەی خـۆش بـوێ وادەکا. جووڵەی، نیگای، هەناسەی لە گەڵ سازی مۆسـیقای مێردەکـەی کۆک دەکا.

لە گەڵ ترپەی دڵی مێردەکەی. بـەڵام پیـاو تـەنها دڵـی لـە لای لەنجـەو، بزەو، نیگای ژنەکەی نیە. پیاو ترپەی دڵـی ژنەکەشـی دەبیـستێ. دەبـێ ترپەی دڵی ئەفسانە لە گەڵ ناسـری کـۆک نـەبووبێ. دڵـی ئەفـسانە لای ناسری نەبووە حەتمەن.

« ئەی لای کێیە؟ لای ئەو هەتیوە بەڕەڵایە؟ »

« کام هەتیوە بەڕەڵایە؟ »

دەبێ مەبەسـتی ئـەو بووبـێ. لـەو کاتـەدا ئـەو لـە دەرەوەی وڵات بووە. لە تورکیە.

« نەکا تەلەفوونی بۆ کردبێتی؟ نەکا بە هیوا بـێ مـن بـەجێ بێـڵی و شوێن ئەو کەوی؟ نەکا شووکردنەکەت بە من پیلان بووبێ؟ نەکا...»

جەلالی ئەمانـەی نـەگوت. گـوتی: « ناسـری دڵپیـسی لـە ئەفـسانە کردووە. گوایە پێی وابووە...»

پێی وابوو ژنەکەی هێشتا دڵی لەلای یەکەم دڵداریەتی. پێی وابوو ئەو هەتیوە بەڕەڵایە وازیان لێ ناهێنێ و دەگەڕێتەوە. لەبەر ئەوەش لێرە ڕۆشتبوو. بە بیانووی پاراستنی خۆی و ژنەکەی لە شەڕو شۆری ئێرە و، بە بیانووی کاسبی و تەجارەتەوە لێرە ڕۆشتبوو. بەڵام ناسری تاجرێکی زیرەک و سەرکەوتوو نەبووبوو. باوکی دووراودوور پێی گوتبوو چی بکڕێ و چی بفرۆشێ. کە باوکی مردبوو، مامەکانی. مامەکانی...

جەلالی گوتی: «ساڵێک دوا مردنی باوکی، مامەکانیشی سەروەت و سامانەکەیان نەخت کردووەتەوە و، لێرە ڕۆشتوون. بۆ دەرەوەی وڵات. گوایە لە ناسریشیان گێڕاوەتەوە. گوایە قەرار بووە پێکەوە بڕۆن... بەڵام ناسری...»

ناسری نەیوێرابوو. ترسابوو لەوێ ئەفسانە...

دەبێ ئەفسانە زۆری لە گەڵ گوتبێ. دەبێ گوتبێتی، کاسبی ئێستا وەک گەمەی شەیتان وایە. تۆ نایزانی. دەبێ گوتبێتی، تۆ لێرە کەس دڵسۆزت نەماوە. منیش کەسێکی وام نیە. دەبێ گوتبێتی، چیمان هەیە با بیفرۆشین و ئێمەش بڕۆین. دەبێ ناسری بە قسەی نەکردبێ. ناسری لە پشت ئەو قسانەوە هەستی بە پیلان کردووە.

« دەتەوێ بمبەی بۆ ئوروپا و، لەوێ لێم جیا ببیەوە؟ دەتەوێ لە گەڵ ئەو هەتیوە بەڕەڵایە..»

لەو کاتەدا ئەو لە ئوروپا بووە. ناسری چۆنی زانیوە.

« دەستی خۆت بکە بە سەرین. من هەرگیز لەم وڵاتە ناڕۆم.»

جەلالی گوتی: «لە ئاشتیەکەی ئێران و عێراقدا ناسری تیاچووە. وەک زۆر تاجرو دەوڵەمەندیتر هەموو سەروەت و سامانی لە دەست بووەتەوە و...»

جەلالی وردە وردە سەرخۆش دەبوو. ئەویش سەرخۆش بوو. بەڵام بتریەکە هێشتا نیوە پڕ بوو. دەنگی زەبتەکە کز بوو. دەنگێکی بەسۆزی ژنانە کە کەسیان نەیاندەبیست.

دڵپیسیەکەی ناسری دوا ئەو تیاچوونە تەواو پەرەی سەندبوو. ئیتر نەک هەر لە ئەو کە لە دەرەوەی وڵات بوو، لە هەموو پیاوێک بە گومان بوو. لە هەموو ئەو پیاوانە کە لە شارێکی دە-پانزە ملوێن کەسیدا

ژیابوون. له ڕێبواری شەقامەکان. لەو دووکاندارانە کە ئەفسانە شتی لێ کڕیبوون. لە دراوسێکان. لەو ڕۆژەوە کە بە ناچاری ماڵەکەی فرۆشتبوو، هەر بە دوو سێ مانگ جارێک ماڵی گوێزابووەوە. ئەفسانەش...

دەبێ ئەفسانە ئیجازەی لە ماڵ ڕۆشتنەدەری نەبووبێ. دەبێ نەیوێرابێ پەردەی پەنجەرەی ژوورەکەی هەڵبداتەوە و، تەلەفوون هەڵبگرێ. دەبێ ئەفسانە زۆری بۆ هاتبێ. ژن زۆری بۆ دێ کاتێک نیگای پیس و چڵکنی مێردەکەی شوێن هەموو جوولە و جمینێکی دەکەوێ. دەبێ ئەفسانە گریابێ. دەبێ سوێندی بۆ خواردبێ کە جگە لە ناسری کەس بە پیاو نازانێ. دەبێ سوێندی خواردبێ ناسری لە هەموو کەس زیاتر خۆش دەوێ. تەنانەت لە کچەکەشی...

جەلالی گوتی: «کچێکی بچکۆلەی جوانیشیان بووە. ئاوات. گوایە هەردووکیان زۆریان خۆش ویستووە.»

ئەفسانە لە پێناوی ئاواتی کچیدا ئەو عەزیەت و ئازارەی کێشابوو. ترسابوو. ئەگەر لە ناسری جیا بێتەوە... ئەگەر کچەکەی بەجێبێڵێ...

دەبێ ناسری بەوەی زانیبێ. دەبێ بە ژنەکەی گوتبێ ئەگەر لێی جیا ببێتەوە، ناهێڵێ هەرگیز چاوی بە کچەکەی بکەوێ. دەبێ گوتبێتی بەڵایەک بە سەر خۆی و کچەکەی دێنێ. دەبێ ترساندبێتی. پیاو دەزانێ ژن دایکەو، دایک ناتوانێ دەستبەرداری جگەرگۆشەی ببێ. بەرگی بەرەندە بەلای پیاوەوەیە. بۆیە دەتوانێ ژنەکەی ئازار بدا. دەتوانێ سووکایەتی پێ بکا. دەتوانێ هەموو بەڵایەکی...

ئەو نەیگوت بۆ ئەفسانە شکایەتی لێ نەکردووە. ئەو دەترسا. لە دەوامەی ڕووداوەکان، لە کۆتایی چیرۆکەکە دەترسا. ئەم چیرۆکە چۆن کۆتایی دێ؟ بە کارەسات؟ ئەو لە کارەسات دەترسا.

جەلالی گوتی: «ئەفسانە ئاخریەکەی ناچار بووە شکایەتی لێ بکا. ڕۆژێک لەو ڕۆژانە کە ناسری لێی داوە، دەم و چاوی بریندار کردووە، کچەکەی تۆقاندووە، ئەفسانە دەستی ئاواتی گرتووە و...»

ئەفسانە لە مەحکەمە داوای تەڵاقی کردبوو. گوتبووی لەوە زیاتر ناتوانێ لە گەڵ پیاوێکی شێت و نەخۆش بژی. بەڵام ناسری تەڵاقی نەدابوو. گوتبووی ژن و منداڵەکەی خۆش دەوێ و چی کردووە لە

پێناوی مەسڵەحەتی ئەواندا کردوویەتی. ئەوسا بەڵێنی دابوو رەفتاری بگۆڕێ و ئازاریان نەدا. قازی کاغەزی لێ سەندبوو. ئاشتی کردبوونەوە. بەڵام بۆ دووهەم جار...

جەلالی تەواو سەرخۆش بوو. ئەویش. بتریەکە خاڵی بووبووەوە و، شەوی درێژی زستان هاتبووە ناوقەدی. ئەوان، یەکیان بە گوتنی ئەوەی بیستبووی و، یەکیان بە خەیاڵ و وێناکردنی ئەوەی دەبوو روویدابێ، چیرۆکی ناسریان دەگێڕایەوە. چیرۆکی ناسری و ئەفسانە...

جەلالی گوتی: «بەڵام بۆ دووهەم جار...»

ئەفسانە بۆ دووهەم جار داوای تەلاقی کردبووەوە. لە محکەمە گریابوو. خۆی بەسەر پێلاوەکانی قازیدا خستبوو. گوتبووی مارەییوهەموو حەقێکی خۆی دەبەخشێ، بەو مەرجە کچەکەی لێ نەستێنن. گوتبووی مێردەکەی شێتە و نابێ سەرپەرشتی ئاواتی پێبسپێرن. قازی بەزەیی پێدا هاتبوو. ژنێکی گەنج و جوان، دایکێکی میهرەبان کە هەموو حەقێکی خۆی بە کچەکەی دەگۆڕیەوە. قازی سەیری ناسری کردبوو. ناسری تا ئەو کاتە هیچی نەگوتبوو. سەری داخستبوو، لێو و سمێڵی خۆی کرۆشتبوو. قازی مۆڵەتی قسەکردنی پێدابوو. ناسری هەستابوو. بە شەرمەوە سەیری قازی و سەیری دانیشتوانی مەحکەمەکەی کردبوو. بە ترس و گومانەوە لێیان ورد بووبووەوە. ئەوسا گوتبووی ئامادەیە ژنەکەی تەڵاق بدا. بە گریانەوە گوتبووی. ئەفسانە گەشابووەوە. قازیش زەردەخەنەی کردبوو. ناسری گوتبووی ئامادەیە ژنەکەی تەڵاق بدا، لە بەر ئەوەی خۆی و کچەکەی لە مەترسیەکی گەورە رزگار بکا. مەترسی؟ ئەفسانە داچڵەکیبوو. قازی گوتبووی: «کام مەترسی؟ مەترسی چی؟ » ناسری ماوەیەک بێدەنگ بووبوو. وەک کەسێک خۆی بۆ درکاندنی رازێکی گەورە ئامادە بکا. درکاندبووی. باسی رۆژانی بەرلە زەماوەندی خۆی و ئەفسانەی کردبوو. باسی خۆشەویستی ئەفسانەو کوڕێکی گەنج -کوڕێکی یاخی و ئاژاوەگێڕ کە لە سزای تاوانەکانی هەڵاتبوو. لە وڵات رۆشتبووە دەر و، ئێستا -ئەو کاتە- لە ئوروپا بوو. ناسری باسی ئەوی کردبوو. باسی میهرەبان. گوتبووی؛ لە یەکەم رۆژی ژن هێنانیەوە سێبەری رەشی ئەو پیاوە یاخیە لە ژیانیاندا بووە. گوتبووی، لە ترسی گەڕانەوەی ئەو پیاوە

یاخیە شارو کەس و کاری خۆی بەجێهێشتووە. چی سامانی باوکی بووە هەڕاجی کردووە و...

ئەفسانە تاسابوو. نیگای هەراسانی بەملاولادا گێڕابوو. بەناو هۆڵی مەحکەمەکەدا و، لە چاوی پڕ لە پرسیاری دانیشتووانی مەحکەمەکەی روانیبوو. لە چاوی قازی. چاوی قازی زەردەخەنەکەی تاراندبوو. نیگای سارد بوو. وەک سەهۆڵی سارد. ئەفسانە گوتبووی: « درۆیە... ئەو پیاوە درۆ دەکا.» ناسری درێژەی بە قسەکانی دابوو. بەبێ گریان. بەبێ شەرم و شوورەیی. بە رق و نەفرەتەوە درێژەی پێدابوو. گوتبووی لەو رۆژەوە تا ئێستا ئەو پیاوە یاخیە بێپسانەوە تەلەفوونی بۆ ژنەکەی کردووە. لە تورکیا و، پاشان لە ئوروپاوە نامەی بۆ نووسیوە. خەڵکی لێ راسپاردووە. خەڵکی یاخی. ویستوویەتی ژنەکەی دەست لە ماڵ و مێردەکەی هەڵگرێ و، شوێن ئەو بکەوێ...

ئەفسانە هەڵچووبوو. وەک مرۆڤی تووڕە و دەمارگرژ نا، وەک ژنی بێتاوان کە بوختانی بۆ دەکرێ. وەک شێت شاڵاوی بۆ ناسری بردبوو. ویستبووی بیخنکێنێ. بێدەنگی بکا. دانیشتوانی مەحکەمەکە نەیانهێشتبوو. هەڕەشەی قازی بەری پێگرتبوو. قازی تووڕە بووبوو. ئەفسانە گریا بوو. قیژاندبووی. گوتبووی: « بوختانە. ئەو پیاوە بوختانم بۆ دەکا.»

ناسری هەروا بەردەوام بووبوو. سێ پەڕە کاغەزی لە گیرفانی دەرهێنابوو. گوتبووی ئەو سێ نامەی لە مجری ژنەکەیدا، لە ناو شتە شەخسیەکانیدا دۆزیوەتەوە. گوتبووی ئەوانە نامەی ئەو پیاوە یاخیەن کە بۆ ژنەکەی ناردووە. دوو نامەی کۆن و نامەیەکی تازە. نامە تازەکەی خوێندبووەوە.

دڵدارە خۆشەویستەکەم...

ئەفسانە هەرەسی هێنابوو. بەدەم لەرزینی لەشیەوە رووخابوو. بەدەم رووخانی جەستەیەوە...

ژن دەڕووخێ، کاتێک باری سزای تاوانی نەکراوی قورستر لە وزەی رۆح و لەشی بێ. نەفرەت لە رۆح و لە لەشی دەکا. دەبێ ئەفسانە نەفرەتی لە رۆح و لەشی خۆی کردبێ. دەبێ نەفرەتی لە دڵ و لە

جەستەی کردبێ. لە رابوردووی و لە ئێستای. دەبێ ئەفسانە نـەفرەتی لە...

جەلالی گوتی: «ئەفسانە قوربانیی وەهم بـوو. قوربـانیی چیرۆکـی پیاوێکی شێت و عاشق. ناسری ئەو چیرۆکەی لە سـەر بونیـادی وەهـم ساز کردبوو.»

ئەو گوتی...

ئەو هیچی نەگوت. ئەو ئیتر نەیدەتوانی ئەو سـاتانە وێنـا بکاتـەوە. بیری ئەو

رۆژە رەشە و، رۆژانی رەشـی لـەوەدوا، لـە تاقـەتی بـەهرەی خەیاڵـی تاڵـیدا نـەبوو. جـەلالی تێگـەیی. هەسـتا. ئـەو پێـشتر هەسـتابوو. لـە ژوورەکەدا کە پڕ بوو لە ژاری گوتنی جەلالی و خەیاڵی خۆی دەهـات و دەچوو. چیرۆکی ناسری هێشتا تـەواو نـەبووبوو. چیرۆکـی ناسـری و ئەفسانە. جەلالی لە ژوورەکە چووە دەر. ئـەویش شـوێنی کـەوت. مـن مابوومەوە. من و چارەنووسـی تاڵـی نووسـیی چیرۆکەکـەم. چیرۆکـی ئەو؟ چیرۆکی خۆم. چیرۆکی هەموو ئەو کەسانە کـە کەسـی چیرۆکیـی خۆم بوون. چیرۆکی هەموو ئەو عەشقە دۆڕاوانـە کـە عەشـقی دۆڕاوی خۆم بوون. چیرۆکی پارچە پارچەبووی ئەو ژیانە فەرامۆش بووانـە کـە ژیانی فەرامۆشبووی خۆم بوون. من مابوومەوە و، تەقـەلای خـەمباری نووسینی چیرۆکی خۆم. جارێکیتریش قسەکەی ئەوم بیر کەوتەوە. ئەم چیرۆکە چۆن دەخوێندرێتەوە؟

## بیست و یەک

دەمەو بەیانی گەڕایەوە بۆ ماڵ. ئەو کاتە کە دەنگی بانگبێژەکان لە بڵێندگۆی هەموو مزگەوتەکانی شارەوە بەرز بووبووەوە. « حی علی ظلاه... حی علی فلاح...» دەنگی بانگبێژەکان بە خەڵوەت و تاریکی شاردا و، بە ناو کڵووە بەفرەکاندا، کە لە سەرەتای شەوەوە بێراوەستان داباریبوون و پێدەچوو تا هەتا هەتایە داببارێن، بڵاو بووبووەوە. ماندوو هیلاک گەڕایەوە بۆ ماڵ. بەڵام هەستی بە ماندوویی نەدەکرد. هەستی بە سەرماش نەدەکرد. هەستی بە هیچ نەدەکرد. لە حەسار رچەیەکی باریکی بەرەو پلیکانەکان کردەوە و، لە راڕەوی ماڵەکە بەفری سەرو، سەر شانەکانی تەکاندوو، هاتە ژوور. جێگەکەی راخست و خزایە ژێر لێفە و پەتوەکەوە. ژوورەکە سارد بوو. زۆپاکە نەوتی لێبڕابوو، کوژابووەوە. گوتم: « ئاوا بخەوی لە سەرمادا رەق هەڵدێی.»

نەیبیست. لێفەو پەتوەکەی لە خۆیەوە پێچاو...

گوتم: « لانیکەم هەستە چۆڕێک نەوت بکەرە زۆپاکەوە.»

نەیتوانی هەستێ. نەخۆش کەوتبوو. جەلالی گوتبووی: « نەخۆش دەکەوی.» چەند سەعات لەمەبەر گوتبووی. کاتێک لە ژوورەکە رۆشتبووە دەر. ئەویش پاڵتۆکەی لەبەر کردبوو. ملپێچەکەی لە ملی ئاڵاندبوو، بە شوێنیدا رۆشتبووە دەر. جەلالی گوتبووی: « تۆ بۆ کوێ؟ » بە سەرخۆشی گوتبووی. کاتێک دەرکەی حەسارەکەی پێوەدابوو، بەرەو ئۆتومبێلەکەی چووبوو. گوتبووی: « بەم بەفرو کرێوە تۆ بۆ هاتوویتە دەر؟ » ئەو گوتبووی: « هەوایەکی تازە هەڵدەمژم. خەریکە دەخنکێم.» خەریک بوو دەخنکا. ژاری چیرۆکی ناسری... چیرۆکی ناسری و ئەفسانە. لە سیەکانیدا کۆ بووبووەوە. لە هەموو دەمارەکانیدا. جەلالی بەفری سەر شیشەی ئۆتومبێلەکەی ماڵیبوو. ئەوسا سوار بووبوو. گوتبووی: « تۆش وەرە سوار بە. دەورێک

دەگەڕێین و...» ئەو گوتبووی:
« دەمەوێ بە پێ بگەڕێم، بە تەنها...» جەلالی گوتبووی: « نەخۆش دەکەوی...» ئەوسا رۆشتبوو. ئەویش رێ کەوتبوو. دەستی ئاخنیبووە گیرفانی پالتۆکەی و، بەسەرەو لێژی شەقامە چۆلەکەدا، لە ژێر بارشتی بەفرەکەدا، داگەڕابوو. یەکەم بەفری سال نەبوو. بەلام یەکەم بەفری قورسی سال بوو. تا ئەو کاتە بستێک زیاتر باریبوو. پێی لە بستێک زیاتر بەفری نەرم و سپی رۆ دەچوو. شوێن پێی لە قەراغ شەقامەکە، شوێن پێی کەسێک بوو کە ئەهوەند و لەسەر خۆ رۆشتبوو. هەنگاوی سووک و نزیکی هەلێنابووەوە. خەتێکی دوورو درێژ بوو کە لە زۆر جێ بەملاو لادا لادرابوو. لە چەند جێ خزابوو. شوێنی سمت و ئانیشکی لە سەر بەفرەکە دیار بوو. ئەو هەروا رۆشتبوو. بە سەر فەڕشی سپی و، لە خەلوەتی تاریک و روونی شەقامەکە و، بە ناو کولووە وردو درەشتەکاندا رۆشتبوو. جارێک ئۆتومبێلێک لە شەقامەکەوە تێپەڕیبوو. شوێن تەگەرەکانی جۆگەی باریک بوون. زوو پڕ نەبووبوونەوە، بەلام زوو ون بووبوون. جارێکیش تاکسیەک لێی نزیک بووبووەوە. سیگنالی بۆ لێدابوو. ئەو لای لێ نەکردبووەوە. نەیبیستبوو یان دلی نەهاتبوو لا بکاتەوە؟ هەروا لە بەرامبەری خۆی، لە سەمای کولووە سپیە سووکەلەکانی روانیبوو. کولووەکان وردو درشت، بە کۆمەل لە دلی رەشی ئاسمانەوە داباریبوون. لە بەر رۆشنایی گلۆپی دارتێلەکاندا سەمایان کردبوو، هاتبوونە خوار. لە سەر بانی دووکان و مالەکان، لە سەر لقی درەختەکانی ئەمبەراوبەری شەقام و، لە سەر ئەو، لەسەر سەرو شانی، تەنانەت برۆ و سمێلی نیشتبوون. ئەو هەروا نەرم و ئەهوەند، بە سەر بەفرەکەدا کە توێ توێ بەرز بووبووەوە، هەنگاوی هەلێنابوو، رۆشتبوو. بۆ کوێ؟ لەو شەقامەوە بۆ شەقامێکیتر و... لەو شەوەوە بۆ شەوانێکیتر. شەوانێکیتری سالانێک لەمەبەر. شەوانێک کە ئەو لێرە نەبووبوو. لەم شارە و، لەم ولاتە نەبووبوو. بەلام سێبەری رەشی لە مالی ئەفسانە، ژیانی ئەفسانەو ناسری شێواندبوو. سێبەری رەشی بەسەر سپیەتی بەفرەکەدا راکشابوو. لەبەر پێیەوە بۆ...

ئەو راوەستابوو. سەری هەلبڕیبوو. کلیلەی سەر برۆکانی هەرەسیان هێنابوو. بەفری سەر پێلوو، مژۆلەکانی رژابوو. لەملاو لای

خۆی ورد بووبووەوە. لە کۆلانێکی تەنگەبەردا بوو. کۆلانێکی ئاشنا. ئاشنا؟ لە ئەمبەراوبەریەوە چەند گلۆپێک بە ژوور دەرکەی هەندێک لە ماڵەکانی کۆلانەوە بەزمی سەمای کلووە بەفرەکانیان رووناک کردبووەوە. ئەو لە گەمارۆی گلۆپەکاندا بوو. لە گەمارۆی رووناکایی کزی سەر دەرکەی داخراوی ماڵەکان. لە گەمارۆی سێبەرەکانیخۆیدا بوو. کۆمەڵێک سێبەری رەش، لێڵ و لێڵتر لەبەر پێیەوە بۆ...

ئەو رێ کەوتبووەوە. سێبەرەکان بە دەوریدا سووڕابوونەوە. وەک سەما و هەڵپەڕکێی دەستەیەک جنۆکە لە خەڵوەتی شەوانەی کۆلانێکدا. سێبەرەکان ئەمبەراوبەر بە دیواری ماڵەکاندا هەڵگەڕابوون. بە دەرکەو پەنجەرەی گاڵەدراوی ماڵەکاندا. سەرەتاتکەیان بۆ ئەو دیو پەنجەرەکان کردبوو. بۆ ژوورە تاریکەکان. حەتمەن زۆر کەس لەو ژوورە تاریکانەدا خەوتبوون. کەسیان ئاگایان لە ئەو نەبوو. کەسیان چاوەڕوانی ئەو نەبوون. ئەو هەروا ئەهوەند و ئارام بە کۆلانەکەدا رۆشتبوو. لە کۆتایی کۆلانەکە رووناکایی ژوورێک سەرنجی راکێشابوو. ئەو دیو پەنجەرەیەک رۆشن بوو. وەها کە سالانێک رۆشن بووبێ و، ئەو بە هیوا بوو سێبەرێک، سێبەری کەسێک بکەوێتە سەر پەردە و پشت پەردەی دادراوەی. سێبەری کێ؟ سالانێک لەوەبەر سێبەری ئەفسانە بوو کەوتبووە سەر پەردە و پشت پەردەی دادراوەی پەنجەرەکە. ئەفسانە کراسێکی تەخت شینی لەبەردا بوو. ئەو زانیبووی. قژی پەخش و بلاوی بەسەر شانیدا بەردابووەوە. ئەو دیبووی. سێبەرەکەی دیبوو. سێبەری ئەفسانە لە پشتێن بەرەو ژوور، گەورە و لێڵ بوو. وردە وردە بچووک و خەستتر بووبووەوە. تا گەیشتبووە بالای و، ئەوسا دەستێک، دەستێکی سپی و ناسک لۆیەکی پەردە دادراوەکەی هەڵدابووەوە.

« شێتە بەو نیوەشەوە، لەبەر ئەو بەفرو سەرمایە لە کۆلانی ئێمە چیت دەکرد؟»

ئەفسانە گوتبووی. سالانێک لەوەبەر گوتبووی. رۆژانی دوا ئەو شەوانە کە ئەو تا دەمەو بەیانی چەند جار بە کۆلانەکەیاندا تێپەڕیبوو. بەرامبەر پەنجەرەی ژوورەکەی ئەفسانە، لەبەر نوای گوێسپانەی ماڵێکدا راوەستابوو. ئەو گوتبووی: « تاسەم کردبووی. دەزانی چەند

ڕۆژە ئێمە یەکترمان نەدیوە؟!» ئەفسانە زەردەخەنەی کردبوو. گوتبووی: « بۆ قەرارە هەموو ڕۆژێک یەکتر ببینین؟ » ئەو گوتبووی: « هەموو سەعاتێک. بە من بێ، هەموو ساتێک.» ئەفسانە پێکەنیبوو. پێکەنینێکی خۆش. گوتبووی: « مادام وایە بۆچی نابیتە دراوسێمان؟ بۆ ماڵەکەی بەرامبەرمان بەکرێ ناگری؟ ماڵی ئەو پیرێژنە کە پەنجەرەی ژوورەکەی بەرامبەر بە پەنجەرەی ژوورەکەی منەو...» ئەفسانە بە گاڵتەو شۆخیەوە گوتبووی.

ئەو گوتی: « وەک فەرهاد...»

گوتی: « ...

ئەو دەیڕاواند. لەوەتی گەڕابووەوە، لەوەتی خزابووە ژێر لێفەو پەتوەکەیەوە دەیڕاواند. ڕەنگە خەونی دەدی. خەونی ئەفسانە... خەونی کاڵێ... من لە ژوور سەریەوە دانیشتبووم و، سەیرم دەکرد. ئەو دەیڕاواند و بە دەمیەوە هەڵدەلەرزی. وەک برێشکەی سەر ساج هەڵدەچۆقی. هەوا وردە وردە ڕوون دەبووەوە. گوتم:

« بەیانیە. ڕوون بووەتەوە.»

بە ئاگام کردەوە. بە حاستەم سەری لە بن لێفەو پەتوەکەی دەرکێشا. پێڵووە بێهێزەکانی وەک پەردەی ڕەش و چڵکنی پەنجەرەی ژوورێکی مژگرتوو هەڵدرانەوە. سەیری کردم.

گوتم: « دەتوانی هەستی؟ »

هیچی نەگوت. هەروا بێهێز چاوی بە ژوورەکەدا گێڕا. ڕۆشنایی دەرەوە لە پشت پەنجەرەو پەردە چیندارەکانەوە هاتبووە ژوور. گەش بە ژوورەکەدا بڵاو بووبووەوە. ژوورەکە سارد بوو. هەناسە لەبەر دەمیدا دەیبەست.

گوتم: « ئەگەر دەتوانی هەستە. هەستە و...»

قسەکەم تەواو نەکرد. نەیدەتوانی. دیسان چاوی لێکنایەوە. پێڵووەکانی تەڕ بوون. ناوچاوانیشی تەڕ بوو. دڵۆپەی عارەقە وەک شەونم، ڕوون و زوڵاڵ
نیشتبووە سەر ڕوومەتی. سەری بۆ ژێر لێفەو پەتووەکەی بردەوە.

ئەفسانە گوتبووی: « ئەگەر ماڵی ئەو پیرێژنە بەکرێ بگری، ئیتر دەتوانین هەموو ڕۆژێک و، تەنانەت هەموو سەعاتێک یەکتر ببینین. تۆ

له ناو پەنجەرەی ژوورەکەت و من لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەم...» ئەو گوتبووی: « رۆژێکیش کە کەستان لە ماڵ نەبێ بە دزیەوە بێیتە لام و...» ئەفسانە گوتبووی: « ئەوسا پێکەوە لە ژوورێک، دوور لە چاوو گوێی خەڵک تێر دڵی خۆمان قسە بکەین و...» ئەفسانە ساڵانێک لەوەبەر گوتبووی. ئەو لە بیریچووبووەوە. لەو رۆژەوە لێرە رۆشتبوو، لە هەموو ساڵانی غوربەت و ئاوارەیی، لەو رۆژەوە گەڕابووەوە، تەنانەت ئەو کاتەش کە چیرۆکی فەرهادی دەنووسی، بیری نەکەوتبووەوە. نەیزانیبوو... نەیدەزانی ئەو بەشە لە چیرۆکی فەرهاد و کاڵێ، بەشێک لە خەونێکی خۆشی خۆی بووە. خەون و خەیاڵێکی خۆشی خۆی و ئەفسانە، کە ساڵانێک لەوەبەر فەرامۆشی کردووە.

گوتی: « ئەفسانە... خۆزگە ئەو دەستە سپی و ناسکە...

ئەو دیسان دەیڕاواند. وەک نەخۆشی بە گیانەڵاوە بانگی ئازیزی دەکرد.

گوتی: « کاڵێ...»

من ترسابووم. نیگەران بووم. نەمدەزانی دەبێ چی بکەم. نەمدەزانی دەبێ چۆن یارمەتی بدەم. هەستام و سەروو خوارێکیژوورەکەم کرد. چوومە بەر پەنجەرەکەو لۆیەکی پەردەکەم هەڵدایەوە. چێشتەنگاو بوو. بارشتەکە نەمابوو. ئاسمان تاوو ساو بوو. حەسار پڕ لە بەفرو، پەلی درەختەکان لە ژێر قورسایی بەفرەکەدا نەوییبوونەوە. دنیا سپی بوو. تیشکی خۆر لە سەر روومەتی سپی بەفرەکە دەدرەوشایەوە. چاوی ئازار دەدا. پەردەکەم دادایەوە.

« کاڵێ گیان...»

خۆزگە کەسێک دەهات. خۆزگە دەمتوانی بڕۆم بە شوێن کەسێکدا، یان تەلەفوون بۆ کەسێک بکەم. خۆزگە چیرۆکنووس دەیتوانی تەلەفوون بۆ کەسێکی چیرۆکەکەی بکا و بیخوازێ. ناتوانێ؟

گوتم: « ئێستا یان ساتێکیتر کەسێک دێ.»

لەبەر خۆمەوە گوتم. گوتم: « دەنگێک لە دەرەوە دێ، حەتمەن مونیرەیە.»

مونیرە بوو. دەرکەی حەساری کردبووەوە و، بە ناو بەفرەکەدا هاتبوو. لە سەر پلیکانەکان، لە راڕەوەکە، لە پشت دەرکەی ژوورەکە

پێی بـە زەویـدا کوتـاو خـۆی تەکاند. دەرکـەی ژوورەکـەی کـردەوە. داوێنی تا سەر ئەژنۆ تەڕ بوو. گوتی: « ماشەڵا چ بەفرێک باریوە.»

مونیرە لە نـاو دەرکەکـەوە چـاوی بـە ژوورەکـەدا گێـڕا. سـفرەی دوێشەو هێشتا هەڵنەگیرابوو. ئەو هێشتا لەناو جێگەکەیدا بوو. سـەیری هاتـیّ. دەرکـەی ژوورەکـەی پێـوەدا. « بڕوانـە ئـەم ژوورە!» لەبـەر خۆیەوە گوتی. ژوورەکە تەنها پیس و شـپرزە نـەبوو، ساردیش بـوو. بـەرەو زۆپاکـە چـوو. زۆپاکـە کوژابـووەوە. دیـار بـوو دەمێکەیـە کووژاوەتەوە. مونیرە داچڵەکی. ترسا. گوتی: « ئەم زۆپایە...»

بە ترسەوە لە ئەو نزیـک بـووەوە. ئـەو لـە ژێـر لێفـەو پەتوەکـەی هەڵدەلەرزی. لێفەکەی لە سەر روومەتی لادا. وەها کە مـردووی دیـبی، ئان و سات رەنگی پەڕی و، بە سنگی خۆیدا کێشا.

ئـەو بـەئاگا بووبـووەوە. تـەپ و کـوتی پێـی مـونیرە و، جیـڕەی کرانەوەی دەرکەکە بەئاگای کردبووەوە. گوتی: « سەرمامە.»

مونیرە خەجلا بوو. باوەشی بە سەریدا کرد. دەستی بە روومەتیـدا هێنا. سەری شەلاڵی عارەق بوو. روومەتی هەڵمی لێ هەڵدەستا.

« خوشکت کوێر بێ... چیت بەسەر هاتووە؟ »

مونیرە گریاو، ئەو زەردەخەنەی کرد. زەردەخەنەیەکی کزو بێتین. بۆ ئەوە ئارامی بکاتەوە. گوتی: « هیچ نیە... نەخۆشم... سەرمامە...»

بە حاسـتەم دەنگـی دەر دەهـات. مـونیرە هەسـتاو سەراسـیمە لـە ژوورەکە چووە دەر. نەوتی هێناو، زۆپاکەی هەڵـکرد. دیـسان هاتـەوە. باوەشی بە سەریدا کردەوە و، دەستی بە روومەتیدا هێنایەوە.

« کوێر بم... نەمێنم...»

ئەو هیچی نەگوت. مونیرە چوو بۆ ئاشپەزخانە. یەخچاڵەکە شـیری تێدا بوو. بە پەلە گەرمی کـردەوە و، بـۆی هێنـا. ئـەو بـە گـران تۆزێـک هەڵخزا. بە یارمەتی مونیرە. نیوە پەرداخێک لـە شـیرەکەی هەڵـقوڕاند. گەرمای شیرەکە سەهۆڵـی دەروونی تواندەوە. گـەرمای زۆپاکـەش... مونیرە وەک دایکێک منداڵەکەی نەخۆش کەوتبێ دەگریا و، خۆی کـەڕ و کوێر دەکرد. پاشـماوەی شیرە گەرمەکەشی دەرخوارد دەدا.

« دەمزانی نەخۆشی. وەها کە کەسێک پێی گوتبێتم، لە خۆرکەوتنی بەیانیەوە سەد جار تەلەفوونم بۆ کردی و هەڵت نەگرت.»

ئەوسا بەرەو تەلەفوونەکە چوو. قرتابوو. لێی دایەوە و، تەلەفوونی بۆ مێردەکەی کرد. پاشان تەلەفوونی بۆ بارامیش کرد.

«دەبێ بە پەلە بتگەیەنینە لای دوکتۆر. دەبێ...»

زۆپاکە نێڵە نێڵ دەئایسا. دەنگی خۆشی بە ژوورەکەدا بڵاو بووبووەوە. ئەو تینێکی هاتبوویە. لەرزەکەی رەویبووەوە. مونیرە چاوی وشک کردبووەوە. فرمێسکی سڕیبوو.

«خوشکت بمرێ. بریا بەیانی زوو بهاتمایە.»

مونیرە دەستی بە شێلانی کرد. ئەو کۆڵنجێکی سەیری کردبوو. دەمارەکانی ناو پشت و پشتەملی روو کەوتبوون. لە ژێر بەرە دەستیدا وەک مار دەخزان. ئەو خۆی پێنەگیرا. سەرەگێژە... ژوورەکە بە دەوریدا خولایەوە. کەلووپەلی ژوورەکە... مونیرەش... ئەو ناچار درێژ بووەوە. مونیرە ویستی لێفەو پەتووەکەی پێدا بداتەوە. ئەو بە جلوو بەرگی دەرەوە خەوتبوو. مونیرە دی. دەرەلنگی شەرواڵەکەی هێشتا تەڕ بوو. مونیرە تۆقا. گوتی: «نەکا دوێشەو لە دەرەوە بووبێتی؟ »

دیسان بە ران و سەرسنگی خۆیدا کێشا.

«بەو بەفر و کرێوە... بە سەرخۆشی...؟ »

ئەو کۆکی. کۆکەیەکی وشک و بەدەوام. مونیرە هەستاو دەستێک جلی وشکی بۆ هێنا. گوتی: «ئەم هەموو ساڵە لە غوربەت چۆن ژیاوی؟ »

بە گریانەوە گوتی. جلووبەرگی بۆ گۆڕی. ئەو تەرمێک بوو لەبەر دەستیدا. تەرمی پیاوێکی... مونیرە لێفەو پەتووەکەی پێدا دایەوە. گوتی: «تۆ نەگۆڕاوی. چۆن رۆشتبووی هەروا گەڕاویتەوە. هەروا شپرزە و بێمەبالات... لەڕو لاوازتر بووی. کزو ماتتر. ئەم هەموو ساڵە لە خۆوە پێموابووە تۆ گۆڕاوی. وەک هەموو کەسیتر بە خۆت و بە ژیانتدا راگەیشتووی...»

گوتی: «ئێستا دەزانم ئەم هەموو ساڵە بە هەڵە چووم. تۆ هێشتا گەنجی، گەورە نەبووی. دوا ساڵەها، دوا ئەو هەموو نووسین و خوێندنە... دوا چل، پەنجا ساڵ تەمەن، هێشتا گەورە نەبووی. بە پێچەوانەی خەڵکیتر کە گەورە بوون. بە پێچەوانەی خەڵکیتر کە...»

مونیرە پێی وابوو ئەو دەیبیستێ، بەڵام نەیدەبیست. مونیرە تەقەی دەرکە ئاسنیەکەی حاساری بیست. بە پەلە لە ژوورەکە چووە دەر.

مێردەکەی دوکتۆری هێنابوو. دوکتۆرێکی ناسیاو. دوکتۆر گوتی: «چیە پیاو... دوا ساڵانێک گەڕاویتەوە لێرە نەخۆش بکەوی؟ »

بە شۆخیەوە گوتی. ئەوسا لێفەو پەتوەکەی لەسەر هەڵدایەوە. ئەو لاوازتر لە هەمیشە راکشابوو. هەموو لەشی سەر ئارەق نیشتبوو. دیسان کۆکیەوە. کۆکەیەکی وشک و بەدەوام. دوکتۆر گوتی: «سیەکانی ئاوساون.»

دەرزیەکی لێداو پاشان گوتی: «دەبێ بیگەیەنینە نەخۆشخانە. دەبێ...»

دوکتۆر قسەکانی تەواو نەکردبوو کە بارامیش هات. گورج بە کۆڵیدا داو، لە ژوورەکە بردیە دەر. لە حەسارەکەش...

بیست و دوو

گوتی: «دەرِۆمەوە بۆ ماڵی خۆمان. دەرِۆمەوە بۆ ماڵی خۆم.»

ئەو دیسان لە بیری چووبووەوە بۆ ئاخرجار لەو ماڵ و حەسارە هاتووەتە دەر. لە بیری چووبووەوە؟ لەو رۆژەوە لە ماڵ و حەسارەکە بردبوویانە دەر، لەو رۆژەوە بردبوویان بۆ نەخۆشخانە... سێ حەفتە بوو لە نەخۆشخانە کەوتبوو، ئیمرِۆ مۆڵەتی رۆشتنەوەیان دەدا. دوکتۆر گوتی: «ئیتر دەتوانن بیبەنەوە.»

بارام گوتی: «بیبەینەوە؟ »

بە سەرسوورِمانەوە گوتی. گوتی: «بەڵام دوکتۆر، ئەو هێشتا...»

مونیرە توورِە بوو. گوتی: «ئەو هێشتا چی؟...»

ئەو هێشتا تەواو چاک نەبووبووەوە. هێشتا کز و خەمۆک بوو. لەم ماوەدا دوکتۆر و پەرستارەکان وەک کەسی خۆیان خزمەتیان کردبوو. نەوەک نەخۆشەکانیتر. بیستبوویان نووسەرە. هاوشاریەکی چیرۆکنووس کە دوا ساڵانێک غوربەت و دووری گەڕاوەتەوە و،

نەخۆش کەوتووە. ئەو تا حەفتەیەک تـاو لەرزەکـەی مـابوو. ئاوسـانی سیەکانیشی... دوو حەفتەی خایاندبوو تـا دوکتـۆر لـە سـیەکانی و، لـە هەندێک مەترسیتر کە پێشبینی کردبوو، دڵنیا بووبـوو. بـۆ سەرئێـشە و سەرەگێژەکەشی... دوکتـۆر گوتبـووی: «سەرئێـشەو سـەرەگێژەکەی پەیوەندیان بە ئەعسابیەوە هەیە.»

مونیرە گوتی: «ئـەی ئـەو کز و ماتیـە؟ ئـەی ئـەوە کـە جاروبـار هەندێک شتی لە بیر دەچێتەوە و...»

دوکتۆر گوتی: «پێشتر وانەبووە؟ »

پێشتر وابووە؟ مونیرە نەیدەزانی. سەیریمێردەکەی کرد. سـەیری بارامی برای. هیچیان نەیاندەزانی. ئـەو سـالانێک لێیـان دابـڕابوو، ئـەم ماوەش کە گەڕابووەوە، لە گەڵ ئەوان نەژیابوو. دوکتۆر گوتی: «لاواز و کەم خوێنە. زیاتر پێی رابگـەن. خـواردنی باشـی بـدەنێ. بـۆ کـزی و خەمۆکیەکەشـی، دەوری چـۆڵ مەکــەن. قـسەی خۆشـی بـۆ بکــەن. بیرەوەری خۆشی بیر بهێننـەوە... لێـرە ئێمـە هیچیترمـان پـێ نـاکرێ. بەڵکو خۆتان لە ماڵەوە...»

گـوتی: «بریـا ماڵـەکەتان نەفرۆشـتایە. ئـەو رۆژەش پـێم گـوتن، فرۆشتنی ئەو ماڵ و حەسارە...»

حەفتەیەک دوا ئەوە کە نەخۆش کەوتبوو، قەباڵەی فرۆشتنی ماڵەکە ئامــادە بووبــوو. تــەنها ئیمــزای فرۆشــیارەکانی مــابوو. ئیمــزای فرۆشیارەکان و، دوو سەدو چل ملوێن تمەن کە بانک نەخت دەیدا. کـێچ کەوتبووە کەولّی بارامەوە. پێیەکی لە بانک و پێیەکیتری لە نەخۆشخانە، لــە ماڵــی مــونیرە... روونــاکیش بــۆ ســەردانی ئــەو هــاتبووەوە. مێردەکەشـی. ئیتـر بـارام بـە تـەنها نـەبوو. مێـردی مـونیرە و مێـردی روونـاکیش... شـەوێک هـەموویان لـە ماڵـی مـونیرە کـۆ بووبوونـەوە. هەموویان جگە لـە ئـەو. بـارام گوتبـووی: «ئێـستا کـە هـەموومان کـۆ بووینەتەوە، وا چاکە کێشەی فرۆشتنی ماڵەکە بـە لایەکـدا بخـەین. ئـەم یەک، دوو رۆژە قەباڵەکە ئیمزا نەکەین، دەکەوێتەوە ساڵێکیتر و، رەنجی ئەم ماوەمان بە با دەچێ.» گوتبووی: «خـودا دەزانـێ، رەنگـە تـا ئـەو ماوە بانک لێمان ژێوان ببێتەوە و...»

مـونیره گوتبـووی: « براکـەمان خوشـکی بمـریّ، لـە نەخۆشـخانە کەوتووە و، تۆ باسی فرۆشتنی ماڵ و حەسـارەکە دەکـەی؟! مـن سـەد جار گوتوومە تا براکەم چاک نەبێتەوە، تا لە نەخۆشـخانە نەیەتـە دەرو، لەو مـاڵ و حەسـارەدا زەماوەنـدی بـۆ نەگێـڕم، تـا وەسـیەتی دایـک و باوکم...» مونیرە لە بەر گریان قسەکەی پیّ تەواو نەکرابوو. رووناکیش گریابوو. بارام گوتبووی: « براکەمان شوکور چاکە. تا حەفتەیـەکیتر لـە نەخۆشخانە دەیهێنمە دەر.» گوتبووی: « لـە نەخۆشـخانە بیهێنمـە دەر، هەرگیز ناهێڵم بە تەنها لەو ماڵ و حەسارە چۆڵ و کاولە... » مێردەکەی مونیرە گوتبووی: « ئەم ماوەش نەدەبوو بمانهێشتایە بە تەنها لەو مـاڵ و حەسارە چۆڵ و کاولە بژی.» مێردەکـەی رووناکیش هەڵـیدابوویە: « ئەگەر ئەم ماوە لەو ماڵ و حەسارە نەبوایە، ئەگەر لە ماڵی بارام، یان لـە ماڵی ئێوە بوایە، هەرگیز نەتاندەهێشت نیوەشەو لە ماڵ بچێتە دەرو، تـا بەیانی لە ناو بەفرو کرێوەدا بمێنێتـەوە.» گوتبـووی: « بـە قسـەی مـن دەکەن تا ئـەو لـە نەخۆشـخانەیە، مـاڵ و حەسـارەکە بفرۆشـن. بـا کـە ئینشاڵا هاتە دەر...» مـونیرە گوتبـووی: « ئـەی زەماوەندەکـەی؟ ئـەی وەسیەتی دایک و باوکم؟ »

بەیانی ئەو شەوە بـارام و مـونیرە و روونـاک قەباڵـەی فرۆشـتنی ماڵەکەیان ئیمزا کردبوو. مابووەوە ئەو. چەند رۆژ دواتر قەباڵەکەیان بۆ ئەویش بردبووە نەخۆشخانە و، داوایان لێکردبوو ئمیزای بکا.

« قەباڵەی فرۆشتنی ماڵەکەیە؟ » ئەو پرسیبووی. نەیگوتبوو ئیمزای ناکەم. گوتبووی: « من شـەوو رۆژێک لـەو ماڵـەدا کـارم مـاوە.» بـارام پێکەنیبوو. گوتبووی: « تا مانگێکیتریش کلیلی ماڵەکە بە خۆمـان دەبـیّ. ئینشاڵا کە چاک بوویتەوە...» ئەو ئیمزای کردبوو. دیسان سەرەگێژە... رووی لە ئەوان وەرگێڕابوو. لە دەرەوەی روانیبوو. لەو دیو پەنجەرەی ژوورەکە، لە حەساری نەخۆشخانەکەی روانیبوو. لەو بەفرە کـە دنیـای سپیپۆش کردبوو.

مونیرە گوتبووی: « کەمێک چـاو لێـک نـیّ و، بخـەوە. ئەوەندەلـەو بـەفرە سـپیە رامەمێنـە.» مێردەکـەی گوتبـووی: « تـۆ لـە پـشت ئـەو پەنجەرە، لە ناو ئـەو بـەفرەدا لـە چـی دەگـەڕێی؟ » بـارامیش... بـارام گوتبووی: « بمبوورە نەمتوانی وەعدەکەم سەر بەرم. بانک دوا ئـەوەی

پارەکەی پێدان، کلیلی دەرکەو دەروازەی حەسار و، کلیلی هەموو ژوورەکانی لێ وەرگرتین.» گوتبووی: «دوێنێ هەموو کەلوپەلی ماڵەکەمان پێچایەوە و، بۆ ماڵی مونیرەمان گوێزایەوە.»

لە ماڵی مونیرە، لە میوانخانە جێگەیان بۆ راخست. ژوورێکی گەورە کە جاروبار پڕ دەبوو لە میوان. میوانەکان جگە لە خزم و برادەرەکانی، زۆربەیان شاعیر و نووسەر و هونەرمەند بوون. زۆربەیان گەنج بوون. لەیلاش سەری لێدەدا. تا لە نەخۆشخانە بوو بە دوو، سێ رۆژ جارێک سەری لێدابوو. ئێستاش لە ماڵی مونیرە...

ئەو بە کەمی میوانەکانی دەدواند. لە بەر خۆیەوە وەڵامی هەواڵپرسیانی دەدایەوە و، ئەوسا بێدەنگ دەبوو. کە میوانەکان دەڕۆشتن و ماڵەکە چۆڵ دەبوو، هەڵدەستا. دەچووە ژوورێکیتر. ژوورێکی بچووکی لاپەڕ کە تاقە پەنجەرەکەی روو لە حەسار بوو. لەوێش لە بەر پەنجەرەکە دادەنیشت و لە دەرەوەی دەڕوانی. بەفری حەسار وردە وردە دەتوایەوە. لە توانەوەی بەفرەکەی دەڕوانی. بیری دەکردەوە. بیری ئەفسانە، بیری ئەو رۆژانە کە ئەفسانەی بەجێهێشتبوو. ئەو رۆژە تاڵانە. هێشتا نەیدەزانی ئەفسانە چۆن و بۆچی مردبوو. هێشتا نەیدەزانی کاڵێ دوای رۆشتنی فەرهاد...

گوتی: «دەبێ بڕۆم. دەبێ بڕۆم بۆ لای فەرهاد.»

بۆ لای فەرهاد؟ مونیرە بە ترس و سەرسووڕمانەوە سەیری کرد.

گوتی: «دەبێ بڕۆم چیرۆکەکەم تەواو بکەم.»

مونیرە بە پەلە لە ژوورەکە چووە دەر. چەپکێک کاغەز و قەڵەمی بۆ هێنا و، لە بەر دەستیدا داینا. گوتی: «ئەمە قەڵەم و کاغەز. دانیشە چیرۆکەکەت...»

ئەو قەڵەمەکەی هەڵگرت و سەری بە سەر کاغەزەکاندا شۆڕ کردەوە. بە سەر پەڕە سپیەکاندا. هەموو رۆژێک سەری بە سەر پەڕە سپیەکاندا شۆڕ

دەکردەوە و، هیچی نەدەنووسی. هیچی بۆ نەدەنووسرا. مونیرە دەیگوت:

«تۆ کە هیچ نانووسی، بۆ ئەوەندە لەم ژوورە چۆڵە دادەنیشی و، لەو کاغەزە سپیە ورد دەبیتەوە؟» دەیگوت: «تۆ هێشتا نەخۆشی.

پێویستت به پشوودان و حه‌سانه‌وه‌یه. تۆ کز و خه‌مۆکی. پێویستت به ناو قه‌ره‌باڵغی و...»

دیسان سه‌ره‌گێژه... ئه‌و تاقه‌تی قه‌ره‌باڵغی نه‌بوو. ده‌یگوت: «حه‌ز ده‌که‌م به ته‌نها بم. خووم پێ گرتووه.» به وه‌ڕسیه‌وه ده‌یگوت. مونیره ده‌یگوت:

«خوویه‌کی خراپه. ده‌بێ وازی لێبێنی.» به خه‌مه‌وه ده‌یگوت. ئه‌و دیسان له کاغه‌زه سپیه‌که‌ی به‌ر ده‌ستی ورد ده‌بووه‌وه. دیسان بیری ئه‌فسانه ده‌که‌وته‌وه. بیری کاڵێ...

مونیره به دڵپڕیه‌وه له ژووره‌که ده‌چووه ده‌ر. بۆلای نه‌شمیل و مێرده‌که‌ی. ده‌گریا و ده‌یگوت: «ئاوا بڕواته پێش...» نه‌یده‌گوت، ئاوا بڕواته پێش چی ده‌بێ. مێرده‌که‌ی ده‌یگوت: «مه‌ترسه. ئێمه نه‌مانناسیوه. ئه‌و هه‌میشه وابووه. هه‌میشه...» دڵخۆشی ده‌دایه‌وه. ده‌یگوت: «ئه‌و پێویستی به گۆڕانێکه له ژیانیدا. ئه‌گه‌ر ژن بێنێ...» ده‌یگوت: «ئه‌گه‌ر ژن بێنێ چاک ده‌بێ. ژن ده‌رمانی هه‌موو ده‌ردێکه. کزی و ماتی... خه‌مۆکی... فه‌رامۆشی...» به پێکه‌نینه‌وه ده‌یگوت. نه‌شمیل ده‌یگوت: «له‌یلاخانمی تلووعی هه‌موو رۆژێک هه‌واڵی ده‌پرسێ و...»

مونیره بیری کرده‌وه. له‌یلا کچێکی فیداکار و له خۆ بوردووه. له‌یلا ئه‌وی خۆش ده‌وێ و ته‌نها خۆشه‌ویستی کچێکی وه‌ک له‌یلا ده‌توانێ ژیانی ئه‌و بگۆڕێ. ده‌بێ خوازبێنی له له‌یلا بکا. ده‌بوو زووتر خوازبێنی لێ بکردایه. گوتی:

«ئه‌م ماوه له خۆوه خاوه خاوم کردووه. ده‌بێ تا دره‌نگتر نه‌بووه و...»

مونیره له به‌ر خۆیه‌وه گوتی. به زه‌رده‌خه‌نه‌وه. گوتی: «ئه‌گه‌ر له‌یلا ئه‌مجاره بێ...»

له‌یلا هات. مونیره ده‌رکه‌ی لێ کرده‌وه. وه‌ک هه‌میشه میهره‌بان باوه‌شی پێدا کرد و ئه‌ملاو لای ماچ کرد. له‌یلا سه‌یری نه‌هاتێ. نه‌یپرسی چی روویداوه؟ گوتی: «کێی لێیه؟»

که‌سی لێ نه‌بوو. جگه له مونیره و، ئه‌و له ژووره بچووکه‌که بوو. له‌یلا گوتی: «ئێستا چۆنه؟»

مونیرە گوتی: « شوکور زۆر چاکە. خەوتووە. لەو ژوورە بچووکە خەوتووە.»

ئەوسا دەستی خستە سەر شانی لەیلا و پێش خۆی دا.

« نامەوێبەئاگای بکەمەوە. هاتم بەسەر پێوە هەواڵێکی بپرسم و...»

مونیرە گوتی: « بەئاگای ناکەینەوە. کارم پێتە. دەبێ پێکەوە قسە بکەین. دوو بە دوو.»

لەیلا سەیری هاتێ. مونیرە خۆشحاڵ بوو. پێدەکەنی. دەمێکە بوو پێکەنینی بە مونیرەوە نەدیبوو. لەوەتی ئەو نەخۆش کەوتبوو. حەتمەن ئەو زۆر چاک بوو. لەیلاش خۆشحاڵ بوو. بیری کردەوە، مونیرە چ کارێکی پێیەتی؟ لێی ورد بووەوە. نیگا و زەردەخەنەکەی وەک هەمیشە میهرەبانانە بوو. وەک هەمیشە؟ پێدەچوو ئەمجارە میهرەبانانەتر بێ. مونیرە بردیە ژوورێکیتر. داینیشاند و بۆ ساتێک بەجێی هێشت. رەسمێکی ئەو بە دیواری ژوورەکەوە بوو. رەسمێکی کۆن. رەسمیتافی لاویەتی. لەیلا لە رەسمەکە ورد بووەوە. ئەویش لە لەیلای دەڕوانی. نیگایەکی مات و... مات؟ نیگایەکی ئاشنا. نیگای ئەو چاوانە کە سالآنێک بە دیواری ژوورەکەی خۆیەوە هەڵواسرابوو. چاوی باوکی.

مونیرە بە چاو شیرینیەوە هاتەوە. هەموو گیانی پێدەکەنی. گوتی: « دڵنیام لە خۆت دەپرسی بڵێی چ کارێکم پێت بێ؟ »

لەیلا هیچی نەگوت. مونیرە گوتی: « دەمەوێ دەربارەی ئەو قسە بکەین.» نزم گوتی. بە چاو ئیشارەتی بۆ ژوورەکەی ئەو کرد. ژوورێک کە ئەو دەبوو لێی خەوتبێ. لەیلا داچڵەکی. « دەربارەی ئەو؟ »

مونیرە سەری لەقاند. گوتی: « دەزانی بۆچی نەخۆش کەوت؟...»

مەجالی وەڵامدانەوەی پێنەدا. گوتی: « شەوی بەفرو کرێوەکە...»

ئەوسا بیری کەوتەوە لەیلا دەزانێ و، درێژەی پێ نەدا. مونیرە بە پەلە بوو. قسەیەکی لە دڵدا بوو کە دەبوو زوو بیدرکێنێ. بەرلەوە ئەو بەئاگا بێتەوە. گوتی: « پیاو کە بە تەنها بژی...»

مونیرە ئیتر پێنەدەکەنی. بزەیەکی کزی لەسەر لێو بوو. لەیلا تێگەیی. ئێستا ئیتر دەیزانی مونیرە دەیەوێ چی بڵێ.

مونیره گوتی: «ئێمه دەمێکەیه یەکتر دەناسین. پێموایه بزانی چەندەم خۆش دەوێی و، چەندە لەلام بەڕێزی. نەوەک هەر لەلایمن، لەلای هەموو بنەماڵەکەم. لەلای مێردو براو، تەنانەت لای رووناکی خوشکم کە تەنها جارێک تۆی دیوە.»
لەیلا سوپاسی لێکرد.
مونیره گوتی: «بڕوام پێ بکە بەقەدەر نەشمیل خۆشم دەوێیت و، بەقەدەر نەشمیل دەربەستی ژیان و بەختەوەریتم. تۆ خانمێکی خوێندەوار و تێگەیشتوو خاوەن بەهرەیت... نامەوێ تاریفت لێ بکەم. تاریفی بەرامبەر خۆش نیە. بەڵام تۆ تێگەیشتووتر لەوەی کە...»
لەیلا سەری داخستبوو. مات بوو. زەردەخەنەکە بە لێویەوە وشک بووبوو. مونیره نەیدەزانی بۆ. گوتی...
لەیلا سەری بەرز کردەوە. نیگای سارد و جیدی بوو. مونیره داچڵەکی. لەیلا گوتی: «دەتەوێ خوازبێنیم لێ بکەی؟»
بە خەمێکی ئاشکراوە گوتی. لەیلا یەکەم جار نەبوو خوازبێنی لێدەکرا، بەڵام مونیره یەکەم جار بوو خوازبێنی لە کەسێک دەکرد. گوتی: «ئەرێ.»
هیچیتری نەگوت. نەیدەزانی دەبێ لە دەوامەی ئەو وشەدا چیتر بڵێ. لەیلا پرسیارێکی راستەوخۆی لێکردبوو، ئەویش وەڵامی دابووەوە. نەیدەزانی ئەنجامی ئەو پرسیار و وەڵامە راستەوخۆیە چی دەبێ. لەیلا ئاخێکی هەڵکێشا. ئێستا ئیتر تەواو کز بوو. مونیره داچڵەکی. بەڵام زوو وەخۆی هاتەوە. گوتی:
«دەزانم ئەو لە تۆ بە تەمەنترە، بەڵام...»
لەیلا زەردەخەنەیەکی تاڵی کرد. ئەوەندە تاڵ کە مونیره پێی وابوو ئێستا لە پرمەی گریان دەدا. لەیلا گوتی: «ئەو ژن هێنەر نیە مونیرەخانم. ئەو بۆ ژنهێنان نەگەڕاوەتەوە.»
گوتی: «دڵنیام ئاگای لەم خوازبێنیکردنەی تۆش نیە.»
ئەو کچە چی دەگوت؟ چۆنی دەزانی؟ مونیره نەیپرسی. گوتی:
«تۆ راست دەکەی. بەڵام ئەو پیاوێکی شەرمن و بە حەیایە. لە هەموو ژیانیدا پیاوێکی شەرمن و بە حیا بووە. رەنگە لە رووی نەیەت قسە بکا... لە بەر ئەوە لە تۆ بە تەمەنترە، رەنگە لە وەڵامی نا بترسێ...»

گوتی: « ئەو برای منە، ئەگەرچی ساڵانێک لـە یـەکتر دوور بـووین، بەڵام زۆر چاک دەیناسم. ئەو تۆی خۆش دەوێ. من دەزانم. لـە یەکـەم رۆژەوە کە تۆی دیوە...»

لەیلا خۆشحاڵ بـوو ئـەو قـسەی دەبیـست. شـیرینیەکی خـۆش لـە گیانی گەڕا.

مونیرە هەستی پێکرد. هەستی بەو خۆشیە ئان و ساتیە کرد. چاوەکانی لەیلا پڕ بووبوو لە فرمێسک. گوتی: « منـیش خۆشـم دەوێ. لـە یەکـەم رۆژەوە کە دیومە، تەنانەت لەوە پێشیش خۆشم ویستووە.»

دانپیانانێکی سەخت و خۆش بوو. بـە شـەرمەوە گـوتی. گۆناکـانی سوور هەڵگەڕان. زەردەخەنە تاڵەکەی نەمابوو. مونیرە گەشایەوە.

« کەواتە هەردووکتان یەکترتان خۆش دەوێ و...»

گوتی: « نەکا لە بەر نەخۆشیەکەی... ئەو تـەواو چـاک بووەتـەوە. ئەوەش کە تۆزێک کز و مات و بێدەنگە...»

لەیلا دووبارەی کردەوە.

« ئەو ژنهێنەر نیە مونیرە خانم.»

ئەوسا رووی لێ وەرگێڕا. پشت لە ئەو چاوەکـانی سـڕی. مـونیرە گوتی:

« بۆوا دەڵێی؟ ... من دڵنیام...»

لەیلا نەیگوت بەرلەوەی مونیرە خوازبێنی لـێ بکـا، ئـەو خـوازبێنی لێکردووە، لە میهرەبان. خوازبێنی لێکردبوو؟ کەی و لە کوێ؟ رۆژێکلـە شوێنێکی بەرز و بڵێند. گوتبووی: « دەمەوێ کەسی چیرۆکە تازەکانـت بم.» هێشتا دەنگی خەمباری ئەوی لە گوێدا بوو.

« من دەرفەتێکم بۆ نووسینی چیرۆکی تازە نەماوە.»

گـوتی: « بـا وازی لـێ بێـنین مـونیرە خـانم. بـا وازی لێبێـنین چیرۆکەکەی تەواو بکا.»

نەیگوت ئاخر چیرۆکەکەی. گوتی: « ئەو بۆ نووسینی چیرۆکەکـەی گەڕاوەتەوە.»

لەیلا قسەیەکی کرد کە مونیرە دەیان جار لە ئەوی بیستبوو. ئەوسا هەستا. چارشێوەکەی بەسەر خۆیدا دایەوە و، لە ژوورەکە چـووە دەر. مونیرەش بە شوێنیدا چووە دەر. هەردووکیان بێدەنگ، وەهـا کـە هـیچ قسەیەکیان بۆ کردن پـێ نـەمابێ. هـەردووکیان مـات. لـەیلا کاتێـک لـە

هۆڵـەکە تێدەپـەڕی بـۆ سـاتێک دەنگـی ئـەوی بیـست. ئـەو لـە ژوورە بچووکەکە دەگریا.

بیست و سێ

که سەرم لە سەر مەنگەڵیەکە هەڵبڕی، ئـەو لـە ژوورەکـەدا بـوو. ژووری من یان ژووری فەرهاد؟ ژوورێکی تاریک و پڕ لـە دووکـەڵ کـە بۆکۆن و بۆنی زبڵی سووتاوی لێدەهات. لە کەیەوە هاتبوو؟

گوتم: «چاوەڕوانت بووم. دەمزانی دێی.»

دەمـزانی دێ. لـەو ڕۆژەوە کـە بردبوویـان بـۆ نەخۆشـخانە. لـەو ڕۆژەوە کە بردبوویان بۆ ماڵی مونیرە. هەموو ئـەو مـاوە گوتبـووی: «من دەبێ بڕۆم بۆ لای فەرهاد. دەبێ بـڕۆم چیرۆکەکـەم تـەواو بکـەم.» ئێستا هاتبوو. لەبـەر ڕۆشـنایی کـزی پەنجەرەکـەدا دانیـشتبوو. لەبـەر ڕۆشنایی کزی پەنجەرەی ژوورەکەی فەرهاد. لە جێی فـەرهاد. دەسـتە باریک و ئێسکنەکانی لە دەوری ئەژنۆی ئاڵاندبوو. سەری بە ملیەوە بـۆ

سەر شانی شۆڕ بووبووەوە. وەک فەرهاد کە دەستە باریک و ئێسکنەکانی لە دەوری ئەژنۆی دەئالاندو... چەندە لە فەرهاد دەچوو. قژی خۆڵەمێشی سەر و ریشی. روومەتی تێک قوپاوو چاوی بە قووڵدا چووی. دەتگوت لە پشت فەرهادەوە خۆی شاردووەتەوە. یان فەرهاد لە پشت ئەوەوە. چیرۆکنووس و کەسی چیرۆکەکەی ئێستا یەک کەس بوون. کەسێک کە سالانێک بوو تووشی فەرامۆشی بووبوو. فەرامۆشی؟ کەسێک کە سالانێک بوو لە خۆی و، لە ژیان و رابوردووی دابڕابوو. لە دایک و باوک و... لە خۆشەویستەکەی دابڕابوو. لە ئەفسانە. ئەفسانە؟ لە کاڵێ.

ئەو گوتبووی: «من نامەوێ نەخشی کاڵێ لە رووی ئەفسانەوە بکێشمەوە. نامەوێ کاڵێ هەمان ئەفسانە بێ. یان لە ئەفسانە بچێ.» سەرەتا کە دەستی بە نووسینی چیرۆکەکە کردبوو، گوتبووی. گوتبووی: «من نامەوێ چیرۆکی فەرهاد و کاڵێ، چیرۆکی خۆم و...»

ئەو هێشتا چیرۆکەکەی تەواو نەکردبوو. چیرۆکی فەرهاد و کاڵێ. زۆری هەوڵدابوو تەواوی بکا. بە تایبەت ئەم ماوە کە لە ماڵی مونیرە بوو. لە ژوورێکی بچووک و لاپەڕ، دانیشتبوو، لە سپیەتی تۆخ و قیرسیچمەی کاغەزەکان ورد بووبووەوە. وەک فەرهاد کە سالانێک لەمەبەر لە سپیەتی تابلۆکەی ورد بووبووەوە. فەرهادیش تابلۆکەی تەواو نەکردبوو. دواهەم تابلۆکەی.

گوتم: «بەڵام من چیرۆکەکەم تەواو دەکەم. چیرۆکی میهرەبان. چیرۆکی پیاوێکی چیرۆکنووس کە دوا سالانێک غوربەت و دووری گەڕاوەتەوە دواهەم چیرۆکەکەی بنووسێ.»

دواهەم چیرۆکەکەی؟ هەستام. بە دەم هەستانەوە لە ئەوم روانی. ئەو هەروا دەستەو ئەژنۆ دانیشتبوو. هەورێک دووکەڵ بە ژوور سەریەوە لەنگەری گرتبوو. لێی نزیک بوومەوە. لەبەر پەنجەرەی ژوورەکە راوەستام. وەک ئەو کە لە بەر پەنجەرەی ژوورەکە رادەوەستا و، بە بەرەدەست توێخێک دوودە و دووکەڵی چاوەیەکی بچووکی پەنجەرەکەی خاوێن دەکردەوە. لەو دیو پەنجەرەکەم روانی. لە حەسارێکی کاول. لە درەختەکان کە لە بنکەوە بڕدرابوونەوە. درەختەکان بە لقوو پەلی رووتیانەوە کەوتبوونە زەوی. حەسارەکەیان

داپۆشـیبوو. لەوبـەر حەسارەکەشـەوە بینایـەکی گـەورە رووخـابوو. کۆڵـەکەکانی هەرەسـیان هێنـابوو. بـان و هەیوانەکـەی تـەپیبوو. باڵندەیەکی رەش و گـەورەش لەسـەر ترۆپکـی کەلاوەکـە هەڵنیـشتبوو. دیمەنێکی ترسناک بوو. ترسـناک؟ دیمـەنێکی خـەمبار و دڵـتەزێن بـوو. رووم لێ وەرگێڕا. رووم لە پەنجەرەکە وەرگێڕا و، گوتم: «هەستە. دەبێ بڕۆینە دەر.»

بۆ کوێ؟ ئەو نەیپرسی.

گـوتم: «دەبـێ بـڕۆین بـۆ ئـەو کۆڵانـە تەنگەبـەر و داخـراوە کـە فەرهاد...»

هەواڵـی رۆشـتنی فـەرهاد هەواڵـێک نیـە لـە خەڵـکی کـۆڵان و گەڕەک شاردراوە بێت. سۆراخی لە یەکتر دەگرن. پیاوان کە یەکتر دەبیـنن، لـە چایخانـە یـان لـە هـەر شـوێنێکیتر، خەبـەری لـە یـەکتر دەپرسن.

«بیستووتە فەرهاد رۆشتووە؟

نازانی بۆ کوێ چووە؟

پێتوانیە...»

درێـژەی پێنـادەن. دەترسـن پیاوەکـان. لـە یـەکتر دەترسـن. لـە شۆفاریک کە رەنگە لە ناخی یەکێکیاندا خۆی حەشـار دابێـت. بـەڵام ژنەکان ناترسن. نیگەرانن ژنـانی کـۆڵان. نیگـەرانتر دەبـن کاتێـک لـە چاوی کاڵێ ورد دەبنەوە. چاوەڕوان نین چاوە تەڕەکانی کاڵـێ. لەو رۆژەوە سـێ پیـاوی تـەڕپۆش دەرکـەی ژوورەکـەی فـەرهادیان شـکاندووە و، کـەلووکونی ژوورەکانیـان پـشکنیوە، پرسـیاریان لـێ تۆراوە نیگای تازیەباری کاڵێ. هەنگاوەکانیشی لە تـەکان کـەوتوون. بە کەمی لە ماڵ دەچێتە دەر. بـە کـەمی لـە کۆڵانـەوە تێدەپـەڕێت. بـۆ هـیچ ماڵـێک ناچێـت کاڵـێ. بـە پـیر تـەپ و کـوتی تـەونی کچـە تەونکەرەکانیـشەوە ناچێـت. کـزن کچـە تەونکـەرەکان. لـە دایـک و باوکیان کزترن. لە براکانیشیان کزترن. هەواڵی گیرانی فەرهادیان لـە براکانیان بیستووە. گریاون کاتێک زانیویانە فەرهاد گیراوە. بـۆ کاڵـێ گریاون. بۆ هەرەسی خەونەکانی. خەونەکانی کاڵـێ خـەونی خۆشـی خۆیـان بـووە. بـۆ هەرەسـی خەونـەکانی خۆیـان دەگـرین. مـان لـە

تەونکردن دەگرن. مان لەو گوڵە سوورانە دەگرن کە بە دەم جووڵەی پەنجەو ترپەی دڵیانەوە لە تەختی شینی قاڵی دەڕوێن. مان لە بەرتەونانە دەگرن کچە تەونکەرەکان. لە ئاوازی بە کۆمەڵیان کە لە درزی دەرکە و پەنجەرەی ژێرخانەکانەوە بە کۆڵاندا بڵاو دەبووەوە. پێی بە ڕێبواران شل دەکرد ئاوازی بەرتەونانەیان. تێپەڕبوونی لە هەنگاویان دەدزیەوە. پێی بە عاشقان شل دەکرد. مان لە عاشقەکانیان دەگرن کچە تەونکەرەکان. بەبێ هەڕەشەی باوک و برا و، بەبێ تکای دایکەکانیان نارۆنە پشت داری قاڵی. بێفرمێسک پەنجە نابزێون. قاڵی رمێنی نابێت ئیمساڵ. فەرشێک گوڵەکانی زەرد بن نافرۆشرێت...

**ئەو لە تاریکە بازاڕەکەوە تێپەڕی. لەبەر دووکانەکانەوە. قاڵیفرۆشی، جلووبەرگ فرۆشی، عەترفرۆشی... لەبەر دووکانی زێڕینگەرەکانەوە. ناو بازاڕ قەرەباڵغ نەبوو. هەوا سارد بوو. خەڵک لە ماڵەکانیان نەهاتبوونە دەر.**

**من لە چەقی چوار ڕێیانێک راوەستام و گوتم: «ئێستا دەبێ بە کامە کۆڵاندا بڕۆین؟»**

**دوو دڵ بووم. جارەکانی پێشوو فەرهادمان لە گەڵ بوو. فەرهاد پێشمان کەوتبوو. بەڵام ئەمجارە... بە شوێن ئەودا خۆم بە کۆڵانێکی تەنگەبەردا کرد. پێم هەڵگرت بەڵکو پێی بگەمەوە. گوتم: «ئەم کۆڵانە تەنگەبەرانە زۆر لە یەکتر دەچن. وریا بە...»**

**ئەو دەستی ئاخنیبووە ناو گیرفانی پاڵتۆکەی و گورج و بە پەلە بە پێچاو پلووچی کۆڵانەکەدا تێدەپەڕی. وەک فەرهاد. وەک ئەو یەکەم جارە کە زیندوو بووبووەوە. گەنج بووبووە و... کۆڵان چۆڵ بوو.**

چۆڵە کۆڵان. چۆڵ و خەمبار. دەڵێی خۆڵی گۆڕستانی بە سەردا رژاوە. بە سەر بان و گوێسپانەی سەرو مل شۆڕ و داتەپیوی ماڵەکاندا. بە سەر دیوارە کاگڵەکاندا. بەسەر پەنجەرە و... هێشتا شینن پەنجەرەکان. شین؟ خۆڵەمێشین. تاکانیان قایم پێوە دراوە. درزو برینەکانیان بە کاغەز و سریش شاردراوەتەوە. کەس لەناو پەنجەرەکاندا نیە. تەنانەت کچە عازەبەکانیش. پەردە و پشت پەردەکان دادراونەتەوە. لە ترسی سەرما و، دەرکە و دەروازەی چێوی و تەنەکەی ماڵەکانیش پێوە دراون. لە ترسی با. تەنها بایە

تووڕە و قیرسیچمە بە کۆڵانەکەدا تێدەپەڕێت. لەم سەری کۆڵانەوە بۆ ئەو سەری و... ئەو سەری کۆڵان داخراوە. دەرکەی چێوی ماڵی پیرێژنیش داخراوە. دەرکەی تەنەکەی ماڵیکاڵێش. دەرفەتی دەربازبوونی نیە با. تووڕە و هەڵچوو خۆی بە دیوارەکاندا دەپەلۆسێت. خۆی بە دەرکە و پەنجەرەی ماڵەکاندا دەپەلۆسێت. خۆی بە گوێسپانەکاندا دەپەلۆسێت. هەڵدەکشێت. لەسەر بانی ماڵی کاڵێ کۆترەکانی رەحیم پێش خۆی دەدات. کۆترەکان دەستەیەکی ماندوو، ترساون. بەدەم باوە، لە ئاسمانی کۆڵان و گەڕەک لە یەکتر هەڵدەبڕێن. جووتەکان لە یەکتر هەڵدەبڕێن...

گوتم: «لە بیرت نەچێتەوە رەحیم کۆترەکانی فرۆشتبوو. کاتێک فەرهاد کاری بۆ دۆزیبووەوە...»

راوەستا. بەرامبەر بە ماڵی کاڵێ پاڵی بە دەرکەی چێوی ماڵی پیرێژنەوە دا. ماندوو بوو. دیار بوو ماندووە و، ئەگەر دەرکە ئاوەڵا بوایە، دەچووە ژوور. بۆ دالانە تاریکەکەو، بە پلیکانەکاندا هەڵدەگەڕا. بۆ ژوورەکەی فەرهاد. ئەو نەیدەزانی ژوورەکەی فەرهاد چی بەسەر هاتووە. لەو شەوەوە کە ئەو سێ پیاوە پۆلیسە بێدەنگ و بێچرپە خۆیان بە ماڵی پیرێژندا کردبوو، دەرکەی ژوورەکانی فەرهادیان شکاندبوو، رۆشتبوونە ژوور... دەبێ کەلووکونیان سنگ و سووژن دابێ. کەلوو پەلی ژوورەکانیان هەڵڕشتبێ. چیان لە گەڵ خۆیان بردووە؟

پیرێژن گوتبووی: «ناهێڵم هیچ شتێک لەم ماڵە ببەنە دەر. ماڵی ئەمانەتە. نامەوێ روو زەردی خاوەنەکەی بم.» گوتبوویان: «خاوەنەکەی خرابکارە.»

«خرابکار؟!» پیرێژن گوتبووی: «خرابکار ئێوەن کە بە زۆر دەرکەی ماڵان دەشکێنن و...» پیاوەکان لێی راسابوون. یەکیان پاڵی پێوە نابوو خستبووی. یەکیان جنێوی پێدابوو. سێهەمینیشیان کە بە تەمەنتر بوو، گوتبووی:

«تۆ پیرێژنێکی گێل و کلۆڵی. تێناگەی. خاوەنی ئەو ژوورانە گەنجێکی نەفامی خوێندکارە. لە زانکۆ هەڵاتووە. جاسووسە. پیاوی بێگانەیە. ئێمە گرتوومانەو دەیکوژین. دڵنیا بە هەرگیز نایبینیەوە کە روو زەردی ببی.

دڵنیا بە...» پیرێژن باقی قسەکەی نەبیستبوو. بەدەم گریان و ناڵاندنەوە لە ژوورەکە چووبووە دەر و، بە پلیکانەکاندا داگەڕابوو. کاڵێ لە حەساری ماڵەکەی بوو. لە حەساری ماڵی پیرێژن. وەک شەپڵە لێدراو هەڵلەرزیبوو. ئەویش قسەکانیانی بیستبوو. کە پیرێژنی دیبوو، گریا بوو. پیرێژن لە ترسا بە پەلە پێش خۆی دابوو، بردبوویە ژوور. ژوورەکەی خۆی. کاڵێ گوتبووی: «دەیکوژن. دەزانم دەیکوژن.» بەدەم گریانەوە گوتبووی. پیرێژنیش گریا بوو. بۆ فەرهاد. جوانە مەرگ فەرهاد. بۆ کاڵێ. کلۆڵ کاڵێ...

دەرکەی تەنەکەی ماڵی کاڵێ کرایەوە. رەحیم و سێ، چوار کەسیتر لێی هاتنە دەر. هاوڕێکانی بوون. لە سەر قومار هەستابوون؟ ئەویان نەدی. نەدەبوو بیبینن. پێدەکەنین. قاقایان دەکێشا. سەرخۆش بوون؟

گوتم: «وا دیارە رەحیم وازی لە کارەکەی هێناوە و، گەڕاوەتەوە سەر دۆخی پێشووی.»

وازی لە کارەکەی هێنابوو. کە زانیبووی فەرهاد رۆشتووە، کە زانیبووی گیراوە، وازی لە کارەکەی هێنابوو گەڕابووەوە بۆ ماڵ. کاڵێ نەیپرسیبوو بۆ؟ لە گەڵی بە شەڕ نەهاتبوو. رەحیم گوتبووی: «کێ دەیزانی ئەو کوڕە نەقاشە خرابکارە؟ » بە ترسەوە گوتبووی. کاڵێ لە سووچێک دانیشتبوو. سەری خستبووە ناو کاسەی لەپە دەستەکانیەوە و، لە شوێنێک راما بوو. کوڕە کوێرەکانیش شان بە شانی یەکتر دانیشتبوون. رەحیم گوتبووی: «خاوەن کارەکەشم برادەریەتی. دەترسم ئەویش خرابکار بێ. دەترسم بێن و ئەویش بگرن.» کاڵێ سەری هەڵنەبڕیبوو. هیچی نەگوتبوو. کوڕە کوێرەکانیش هیچیان نەگوتبوو. رەحیم توورە بووبوو. گوتبووی: «خۆ برای باوکمان نەگیراوە. بۆ چی ئاوا دەستەوئەژنۆ...» ئەوسا هەستابوو رۆشتبوو. لە بەیانی ئەو رۆژەوە چووبوو بە شوێن هاوڕێکانی جارانیداو... کاڵێ هەروا کزو بێدەنگ لە شوێنێک رامابوو. لە کوێ؟ رەحیم گوتبووی: « تاکەی ئاوا تازیەبار دادەنیشی؟ ئەو کوڕانە بۆ پرسە نایەن. هەستە دەستێک بە خۆتدا بێنەو، وەک جاران میوانداریان بکە.» نەڕاندبووی:

«نەکا تۆش لە گەڵ ئەو هەتیوە نەقاشە هاودەست بووبی؟ نەکا تۆش خرابکار بی؟»

دەرکەی تەنەکە هێشتا ئاوەڵابوو. ئەو بێچرپە لێی چووە ژوور. ماڵی کاڵێ...

چۆڵە ماڵی کاڵێش. رەحیم رۆشتووە و کورە کوێرەکانیش لە ماڵ نین. تەنهایە کاڵێ. دەترسێت. لەو رۆژەوە فەرهاد رۆشتووە، لەو رۆژەوە مات و خەمبار لە سووچێکی ژوورە بچووکەکەی دانیشتووە و، سەری لە کاسەی بەرە دەستیدا داناوە، دەترسێت. نازانێت لە چی. ترسێکی غەریب لە گیانی نیشتووە. نازانێت بۆچی. نازانێت؟ هەڵدەستێت کاڵێ. دەستێک بە دیوارەکە دەگرێت و هەڵدەستێت. لەو ژوورەوە بۆ ژوورەکەیتر و، نامۆیی لێ دەکەن ژوورەکان. کەلوپەلەکانیش نامۆیی لێدەکەن. رەسمی سەر سنگی دیوارەکان، چل تیکەو دەستچنی سەر تاقەکان، گوڵدانی ناو پەنجەرەکان، تەنانەت ئاوێنەکانیش... بیری دەکەوێتەوە. چی ئاوێنەی گەورە و بچووکی ناو ماڵەکەیە کۆی دەکاتەوە. لە ژوورە بچووکەکەی خۆی، ئەوەی دەبێ هەڵواسرێت، هەڵیدەواسێت. ئەوەی دەبێ هەڵپەسێردرێت، هەڵیدەپەسەرێت. لە چوار قورنەی ژوورەکەش چوار ئاوێنەی بالانوێن دادەنێت. گەمە دەکات کاڵێ. پێشتریش کردوویە. سەدان جار، لەوەتی خۆی ناسیوە. لە قەرەباڵغی ئەو ئاوێنانەدا خۆی ناسیوە کاڵێ. لە گەمارۆی ئەو وێنانەدا کە هەموویان وێنەی خۆی بوون. وێنەی ئەندامەکانی لەشی لە چوارلاوە. گەمەیەکی منداڵانەیە. پێشتریش گوتوویە. سەدان جار، هەموو جارێک بڕیاری داوە وازی لێ بهێنێت. واز لە کڕینی ئاوێنە و، وازی نەهێناوە کاڵێ. تەنانەت کە گەورەش بووە وازی نەهێناوە. کە فەرهادیشی ناسیوە... یەکەم جار لە ماڵی فەرهاد کە لە ئاوێنە دەگەڕێت و لێی نیە دادەچڵەکێت.

(( چۆن دەتوانی بەبێ ئاوێنە بژی؟ ))

(( بەبێ ئاوێنە؟!))

(( چۆن دەتوانی لە خۆت و لە ئەندامەکانی لەشت غافڵ بیت؟ ))

لە ناویاندا رادەوەستێت. لە ئاوێنەکاندا. لە ناوەڕاستی ژوورەکە و، پێشتریش راوەستاوە کاڵێ. سەدان جار، هەموو جارێک پەردەی پەنجەرەی داداوەتەوە. ئاڵقەی دەرکەی هەڵپێکاوە. گلۆپەکەی

هەڵـــکردووە و رووت بووەتـــەوە. لـــە بـــەر چـــاوی خۆیـــدا رووت بووەتـەوە. لـە بـەر شـالاوی نیگـای تۆقاویـدا، لـە هـەموو ئاوێنەکانـدا رووت بووەتەوە. لە هەموو ئاوێنەکاندا لە خۆی روانیوە. یەکـەم جـار کە بۆ فەرهاد دەگێڕێتـەوە، پێدەکـەنێت. بـە سـەیر و سەرسووڕمانەوە پێدەکەنێت فەرهاد.

«تۆ لەو ئاوێنانەدا لە چی دەگەڕێی؟»

«لە خۆم. لە ئەندامەکانی لەشم. دەترسم لێم ون بن.»

«لێت ون بن؟»

دادەچڵەکێت فەرهاد. سەیری دێتێ. ئیتر هیچی لێ ناپرسێت.

بـەرەو پەنجەرەکـە دەڕوات کالـێ. پەردەکـە دادەداتـەوە. ئالـقەی دەرکەش هەڵدەپێکێت...

گوتم: «ئەو کچە دەیەوێ چی بکا؟

بیست و چوار

ئەم بەیانیەش قیژەیەکی تیژو ترسناک لـە خـەو راپیەڕانـد. قیـژەی وشک و جەرگبڕی...

گوتی: «ئەفسانە...»

بە هاوارەوە گوتی. بە ترسەوە هەڵخزا. بە وەحشەتەوە. چاوی بـە چـوار دەوری خۆیـدا گێـڕا. بـە نـاو ژووره تاریـک و دووکەڵاویەکـەدا. نیگـای وەیـلان و تۆقـاوی بـە هیچـەوە بەنـد نـەدەبوو. بـە دیـوارە رەشەکانەوە. بە قاپی رەسم و ئاوێنـەی شـکاوی سـەر تاقەکانـەوە کـە دوودەو دووکەڵ داپۆشیبوون. رەش و تاریکی کردبـوون. سـەعاتە لـە کـار کەوتووەکـەی سـەر سـنگی دیوارەکـەش رەش و تاریـک بـوو. پەنجەرەکەش... دەرەوە تـازە روون بووبـووەوە. رۆشـناییەکی کـز و لاواز تازە لە چاوە بچووکەکانەوە هـاتبووە ژوور. رۆشـناییەکە هێـشتا ژەنگی سەرما و تاریکی پێوە بـوو. سـەرما و تـاریکی شـەوێکی درێـژ. پاییز و زستانێکی درێژ.

گوتی: «ئەرێ ئەفسانە بوو...»

وەک کەسێک لە گوتنەکەی دڵنیا نەبێ، چەند جار دووبارەی کردەوە.

من لەو لایەوە دانیشتبووم. وەک هەمیشە لە پاڵ مەنگەڵیەکەدا. مەنگەڵی تینی نەمابوو. پشکۆکان دامرکابوون و، بووبوونە خۆڵەمێش.

گوتی: «قیژەی ئەفسانە بوو. هەموو ئەم ماوە...»

دەنگی دەلەرزی. بە گران قسەیبۆ دەکرا. من دەربەستی قسەکردنی نەبووم. ماندوو بووم. دوێشەو نەخەوتبووم. لە ئێوارەوە کە لە ماڵی کاڵێ هاتبووینەوە، لەو کاتەوە کە ئەو خەوتبوو، من دانیشتبووم و دەستم بە خوێندنەوەی چیرۆکەکەی کردبوو. چیرۆکی فەرهاد.

گوتی: «من هەموو ئەم ماوە خەونی ئەفسانەم دیوە.»

فەرهادیش خەونی کاڵێی دیبوو. لە دواهەم بەشی چیرۆکەکەیدا. ئەو کەی دواهەم بەشی چیرۆکەکەی نووسیبوو؟ دواهەم خەونی فەرهاد. دواهەم خەونی پیاوێکی نەقاش کە...

هەروا بەرامبەر تابلۆو سێ پایەکەی دانیشتووە نەقاش. لە سپیەتی زەق و قیرسیچمەی قوماشەکە ورد بووەتەوە. لەو چەند هێڵە خوارو خێچ و رەش و باریکە. هەروا بە شوێن هێڵەکانەوەیە نەقاش. لە دەوامەی هێڵەکاندا لە کاڵێ دەگەڕێت فەرهاد.

«لە کوێی کاڵێ؟ من هەموو ئازارەکانم کێشاوە. لە پێناوی ئەم ساتەدا، لە پێناوی گەیشتنەوە بە تۆ، هەموو سووکایەتیەکم پێکراوە...»

دەنگ هەڵدەبڕێت: «بۆچی خۆتم نیشان نادەی؟ بۆ خۆتم لێ دەشاریەوە؟»

سپیەتی تابلۆکە چاوی ئازار دەدات. سەرەگێژە و... تەزوویەک وەک تیر بە لاجانگیدا تێدەپەڕێت.

«بۆ لە پشت ئەم هێڵانەوە دەرناکەویت؟»

دەستی شل دەبێت فەرهاد. فڵچەی نێوان ئەنگوستەکانی دەخزێت. دەکەوێتە زەوی. سەرەگێژە و... تابلۆو سێپایەکە بە ژوور سەریەوە دەخولێنەوە. دەرووخێت فەرهاد. هەرەس دێنێت و تەختی زەوی دەبێت. پێڵووەکانی دەنیشن. تابلۆکەی لێ ون دەبێت. تەنها

دەنگەکان دەبیستێت. وازی لێ ناهێنن دەنگە مووزیەکان. لە خەوو بێهۆشیشدا واز ناهێنن و شالاوی بۆ دەبەن. هەموو لایەکیان لێ تەنیوە دەنگە وەهمیەکان. ناهێڵن دەنگی کاڵێی بگاتێ.

(( دەنگ هەڵبڕە کاڵێ. لەو زوڵمەتە وەرە دەر، خۆت بنوێنە. دەمەوێ بتبینم. دەمەوێ بزانم ئەم هەموو ساڵە چیت بەسەر هاتووە... دەمەوێ بتکێشمەوە کاڵێ... روخسار و ئەندامی نیانت بکێشمەوە... وەک ئەو جارە کاڵێ... نەوەک لە ناو ئاوی روونی حەوزو ئەستێرێکدا، دەمەوێ ئەمجارە لەناو...))

دەگری فەرهاد. خەوتووە و دەگری. لەوە زیاتر خۆی پێناگیرێت کاڵێ. دەردەکەوێت. نەوەک لە پشت هێڵەکانی دوا تابلۆکەی فەرهاد، لە خەونیدا، لە دوا خەونیدا دەر دەکەوێت.

(( کاڵێ... ئازیز...))

دەنگی فەرهاد نابیستێت کاڵێ. دەنگی پیاوێک کە لە دواهەم خەونیدا دەرکەوتووە. هیچ دەنگێک نابیستێت کاڵێ. راوەستاوە. لە ژوورێکی بچووکدا کراسێکی تەختشینی لەبەردایە. بە گوڵی وردی سوورەوە، لە ناو دەیان ئاوێنەی گەورە و بچووکدا راوەستاوە. لە ناو دەیان تابلۆی گەورە و بچووکدا بەش بووە.

(( نازدارەکەم...))

پێدەکەنێت فەرهاد. خۆشحاڵە.

(( رۆژانی تاڵی دووری بەسەر چووە. من دەمزانی دەرەقەت دێیی.))

نابینێت کاڵێ. ئەو پیاوە نابینێت کە لە خەونیدا دەرکەوتووە. هیچ کەس نابینێت جگە لە خۆی. جگە لە ئەندامی لەشی ماندووی. نامۆیی دەکەن ئەندامەکانی لەشی. دەست و پێ و سک و ناوپشت و، تەنانەت سەرو روخساریشی غەریبی لێ دەکەن. بە ئەمری نابزوێن. رووت نابنەوە. سەما ناکەن. چاوەکانیشی بە ئەمری ناڕوانن. لە ئاوێنەکان ناڕوانن. لە وێنە نامۆکان ورد نابنەوە. لە ئاگری زۆپاکە ورد دەبنەوە چاوەکانی. لە سەمای بڵێسەکان رادەمێنن.

(( وەرزی سەرما بەسەر چوو کاڵێ. پێویستمان بە ئاگر نیە. پێکەوەبوونمان نەک هەر خۆمان، شارەکە گەرم دەکاتەوە.))

گـوێی ناداتـێ کاڵـێ. گـوێ بـەو پیـاوە نـادات کـە لـە خەونیـدا دەرکـەوتووە. گـوێ بـە هـیچ نـادات جگـە لـە پـووتی پڕ لـە نـەوتی زۆپاکە. پێی بەرەو زۆپاکەی دەبەن. دەستی بۆ پووتـە نەوتەکـە درێژ دەبێـت. قامکـەکانی سـەری پووتەکـە هەڵـدەدەنەوە. دەربیجەیـەکی بچـووک دەر دەکـەوێت. دەنەوێتـەوە کاڵـێ. لـە نـەوتی نـاو پووتەکـە رادەمێنێت. لە جەغزی دەربیجەکەوە خۆی لە ناو نەوتەکەدا دەبینێت. روخساری خـۆی، لـە رەشـایی ئاویلکـەی نەوتەکـەدا. پووتەکـە بـەرز دەکاتەوە.

(( چی دەکەی کاڵێ؟!))

پووتەکـە بـە ژوور سـەریەوە لەنگـەر دەگرێـت. بـە ژوور سـەری کاڵێوە. دەستی چەپی هێزی نامێنێت. پووت لار دەبێتەوە و نەوتەکـە دەڕژێـت. بەسـەر کاڵـێدا دەرژێـت. بەسـەر بـسکی خـاوو ئاڵۆزیـدا. بەسەر شان و سنگ و بەرۆکیدا. بە هـەموو لەشـیدا. نەوتەکـە سـاردە، موچڕکەی بە لەشدا دێنێت.

(( کاڵێ...))

دەقیژێنێت فەرهاد. هەموو لەشی تەڕە کاڵێ. بسکی بـە گـەردن و سەرشانیدا تلیساوەتەوە. کراسە تەختشینەکەی بە لەشیەوە نووسـاوە. رووت بووەتەوە کاڵێ. لە هەموو ئاوێنەکاندا رووت بووەتەوە. لەشـی سـارد و تـەڕی لـە هـەموو ئاوێنەکانـدا بـەش بـووە. روومـەتی مـات و چاوە بێتینەکانی، گۆناو لێو و... ئەو هەموو روخـسارە نامۆیـە کـە لـە یەکتر رامـاون، لـە سـنگ و بـەرۆک و مـەمکی تـورت و قـوتی یـەکتر رامـاون، لـە نـاو پـشت و سـمتی یـەکتر رامـاون، لـە پێـستی شـین و بـاخێکی نـامۆی پـڕ لـە گوڵـی وردی سـوور رامـاون و... ناترسـن. نەتۆقاون. هیچ هەستێکیان لە خۆیاندا هەڵنەگرتووە چاوە بێتینـەکانی کاڵێ.

((کاڵێ...))

داماوە فەرهاد. نازانێت لە کوێیە و، نازانێـت چـۆن دەبـێ بـەر بـەو مەرگەسـاتە بگرێـت کـە تـا سـاتێکیتر روو دەدات. شـەمچەی بـە دەستەوەیە کاڵێ. چڵێکی لێ دەردەهێنێت و...

((نەکەی کاڵێ...))

داوێنی کراسەکەی گڕ دەگرێت. گڕ بە داوێنیدا هەڵدەگەڕێت. چاوە بێتینەکانی دەردەتۆقن. روخساری ماتی دەگەشێتەوە، وەک پشکۆ. دەستەکانی بەرز دەبنەوە و، سەر سەما دەکەوێت کاڵێ.

«کاڵێ...»

کاڵێ گلۆڵە گڕێکە و، لە ناو دەیان ئاوێنەی گەورە و بچووکدا سەما دەکات. ئاوێنەکان مەیدانێکی تەنگەبەر و تەسکن. ژوورەکەش. لە ژوورەکە دەردەپەڕێت. گلۆڵە گڕێک خۆی بە دارو دیواری حەساردا دەکوتێت. خۆی بە دەرکەی تەنەکەو... کاڵێ گلۆڵە گڕێکەو، خۆی بە سەرما و خەڵوەتی کۆڵان دەسپێرێت. بە باوەشی تامەزرۆی با. بڵێسەکان بەدەم باوە هەڵدەچن. دووکەڵ کۆڵانەکە دەتەنێتەوە و، بە قیژەی کاڵێ، بە دوا قیژەی تیژ و ترسناکی کاڵێ، لە خەو رادەپەڕێت فەرهاد.

هەروا کە پێشبینیم دەکرد ئەو چیرۆکەکەی تەواو کردبوو. چیرۆکی فەرهاد لە دوارۆژەکانی زستاندا تەواو بووبوو. دوارۆژەکانی زستانی چ ساڵێک؟

گوتم: «منیش چیرۆکەکەم تەواو دەکەم. چیرۆکی میهرەبان.»

ئەوسا سەرم بەرز کردەوە. ئەو لە ژوورەکەدا نەبوو. من تەنها بووم. تەنها لە بەر رۆشنایی کزی پەنجەرەکە دانیشتبووم و، دەستە باریک و ئێسکنەکانم لە دەوری ئەژنۆم ئالاندبوو.

تەواو

١٣٨٠/١/٦